# کاروان


**گۆڤارێکی رۆشنبیری ی مانگانەیە**

**ئەمیندارێتی ی گشتی ی رۆشنبیری و لاوان**

**بەزمانی کوردی و عەرەبی دەری دەکا**

**سانی دووەم   19   نیسانی / 1984**




## لەم ژمارەیەدا




**ئەدرەس : هەولێر - ئەمیندارێتی گشتی ی رۆشنبیری و لاوان - گۆڤاری (کاروان) - ص.ب : [illegible]**

# «7»ی نیسان لە دایك بوونی

لە هەفتی نیسانی هەموو ساڵێکدا ، جەماوەری عیراق‌و جەماوەری نەتەوەی عەرەب ، بە بۆنەی یادی لە دایك بوونی پارتی سەرکردە ، پارتی بەعسی سۆشیالیستی عەرەب ، سەرکردەی کاروانی گەلەکەمان بەرەو پێشکەوتن‌و بەختیاری‌و رابەری شۆڕشی فراوانی عەرەب لە پێناوی یەکگرتن‌و سەربەستی‌و سۆشیالیستی‌دا ، ئاهەنگ‌و زەماوەند دەگێڕێ .

لە دایك بوونی پارتی بەعس لە بارو زروفێکی مێژوویی بە نرخ‌و تایبەت هاتە دی ئەمیش لە دوای رووخاندنی فاشیزم‌و لە ناو چوونی ئەو دەوڵەتانەی هێرشی دڕندانەیان بۆ سەر گەلان برد ، لە ناوەڕاستی چلەکانداو لە پاڵ فراوان بوون‌و زۆر بوونی رژێمە پێشکەوتنخوازەکان لە جیهاندا . ئەمەو لە گەل پەیدا بوونی پەڵەیێکی ڕەش‌و بۆگەن لە جەستەی وولاتی عەرەبدا ئەمیش قەوارەی زایۆنیزم بوو کە لە سەر خاکی عەرەبی‌و ئیسلامی‌ی پیرۆزدا دامەزرا کە فەلەستینی داگیر کراوە . ئەمە جگە لە گەلێ کردەوەی ناڕەوا لە لایەن ئیستعماردا بۆ دواخستنی کاروانی ڕزگاری خوزای عەرەب‌و گەلانی تر لە ناوچەی رۆژهەڵاتدا . لەبەر ئەمەو گەلێ هۆی‌تر پارتی بەعسی وەك هێزێکی دڵسۆزو خاوەن بیروڕاییکی پتەو هاتە کایەوە بۆ شکاندنی پیلانەکانی ئیمپریالیزم ، بەڵێ لە بارێکی ئالۆزیدا پارتی بەعس پەیدا بوو بۆ ئەوەی سەرکردایەتی خەباتی عەرەب بکات‌و لە سالانی یەکەمی لە دایك بوونی‌دا رۆڵێکی کاریگەری چ لە نێو عەرەب‌و چ لە جیهاندا گێڕاوەو دەگێڕێ .

پارتی بەعسی سۆشیالیستی عەرەب ، پارتێکی شۆڕشگێڕو پێشکەوتنخوازەو چەکدارە بە فەلسەفەیێکی شۆڕشگێڕانەی تەواوو ڕاست‌و دروست دەربارەی کاروانی مێژوو ، بۆیە جێگای سەرسوڕمان نی‌یە ئەگەر هاتو هەڵوێستەکانی توندو تیژ بێت بەرامبەر ئەو رژێمە زۆردارانەی



حوکمڕانی وولاتە عەرەبیەکانیان دەکردو دەیکەن . لە عیراقدا پارتی بەعس هەر لە سالانی یەکەمی پەیدا بوونیدا بەشدارییێکی کاریگەری لە هەموو شۆڕش‌و ڕاپەڕینەکانی گەل نواند کە لە سەردەمی پاشایەتی بەرپا بوون‌و ئەگەر هاتو

# حیزبی شۆڕشی عەرەبی یە



ئاورێك لە سالآنی دوای لەدایك بوونی بەعس بدەینەوە دەبینین بە گەلێ راپەڕین و خۆپیشاندان دەدرەوشێتەوە کە تا رادەیێك ژمارەیان [ژمارەی ئەو راپەڕین و خۆپیشاندانانە] پترە لە ژمارەی ئەو راپەڕین و خۆپیشاندانانەی کە پێش لەدایك بوونی بەعس بەرپا بوو . وە لە گەڵ بە هێز بوونی ئەم پارتەو کۆبوونەوەی جەماوەر لە دەورو پشتیدا رژێمی پاشایەتیش لە هەمان کاتدا ، هەنگاوی بەرەو نەمان دەنا تا لە بەرەبەیانی 14 ی تەمموزی 1958دا رووخاو لەناو چوو . پارتی بەعسیش رۆڵێکی گەورەی هەبوو لە ڕووخاندن و رێگا خۆش کردن بۆ سەرکەوتنی شۆڕشی تەمموز . دوای ڕووخاندنی پاشایەتی و دامەزراندنی کۆماری عیراق ، پارتی بەعس سیاسەتێکی ئازایانەی نواند بەرامبەر ئەو تاقمەی شۆڕشی تەمموزی لە رێرەوە راستەقینەکەی لادا . بۆیە لە ئەنجامدا ئەندامەکانی تووشی ئازارو ئەشکەنجە بوون ، تووشی لە سێدارەدان و گرتن و دەربەدەری بوون . ئەوەشمان لەبیر نەچێ کە پارتی بەعس گەورەترین چالاکی تێکۆشەرانەی رێکخست و سەرکردەی کرد دژی دیکتاتۆریەت لە سالآنی دوای شۆڕشی 14ی تەمموزو ئەو هەوڵ و تەقەلاّیانەی بۆ لەناوبردنی دیکتاتوریەت نواند بووە هۆی کۆبوونەوەی جەماوەری عیراق لە دەوریدا تا دیکتاتۆریەتی لە بەرەبەیانی رۆژی 8 ی شوباتی 1963دا بەزاندو ووردوو خاشی کرد .

گەلەکەمان دەیتوانی قۆناغ بەرەو پێشکەوتن و ژیانێکی خۆشتر کوورت بکاتەوە بەلاّم هێزە کۆنەپەرستەکان ئەو هێزانەی سوودیان لە کەمی شارەزایی و تاقی کردنەوەی پارتیان لەم کاتەدا وەرگرت توانیان کودەتایێکی رەش لە تشرینی دووەمی هەمان ساڵدا رێك بخەن و ئاواتە مەزنەکانی گەلەکەمان دوابخەن .

گەراندنەوەی عیراق بۆ سەردەمەکانی پێشوو هێنانی تاقمێکی بەکرێگیراوی کۆنەپەرست بۆ سەر حوکم یەکێك بوولەو هەنگاوانەی کە کودەتایەکەی بۆ سازدرا . لێرەشدا بەعس

دەست پێشخەری خۆی بۆ پووچەڵ کردنی پیلانی کۆدێتایی یەکان پێشانداو خەباتێکی بێ ووچانی بەرامبەیان نواند تا خەباتەکە لە شۆڕشی 17 — 30 تەمووزی ساڵی 1968دا سەرکەوتنی هێنایە دی . کاتێ پارت توانی بە هۆی بڕوای پتەوی بە گەلو بە هۆی ئەو شارەزایی‌و تاقی‌کردنەوەی کە وەری گرتبو ، دیکتاتۆریەت هەتا هەتا لەناو ببات .

لەم چاوپێخشاندنە خێراییە ، بۆمان دەردەکەوێ کە پارتی بەعس رابووردوودا و ئێستاکەش سەری ڕم بوەو سەری ڕمە لە خەباتی دژی ئیستعمارو کۆنەپەرستان . هەر ئەو بووکە بەشدارییکی فراوانی لە پێناو ڕووخاندنی پاشایەتی نواند ، هەر ئەوو تەنیا ئەو بوو زۆرداره سەربازییەکانی سزاداو دیکتاتۆریەکانیانی رووخاند ، ئەو دیکتاتۆریانەی ئازاری جەماوەریان‌دا لە نێوان ساڵانی 14 تەمووزی 1958 وتا ڕۆژی 17ی تەموزی ساڵی 1968دا .

هەڵوێستە شۆڕشگێڕایەکانی بەعس تەنها لە ڕووخاندنی قەلای دیکتاتۆریەت بەدی ناکرێت ، بەڵکو رووداوەکان ساڵانی رابووردوو بۆ گشتی سەلماند کە بەعس پارتێکە بۆ دامەزراندن‌و دروست کردن‌و شۆڕش لە هەمان کاتدا ، ئەو ڕاستی‌یەش بە درێژایی 16 ساڵ لە حوکمی بەعس لە عیراقدا بەرروونی بۆمان بەدی دەکرێت .

ئەگەر هاتو زانیمان ، نەبوونی دیموکراتیەت‌و قەدەغە کردنی سەربەستی لە گەڵ لە سەردەمەکانی پێش شۆڕشی 17 — 30ی تەمووزی پیرۆزدا یەکێك بوو لەو هۆیانەی کە لە پشت ئاڵۆزی‌و هەژاری ڕادەوەستا لە وولاتدا . پارت هەر لە ڕۆژانی یەکەمی دوای شۆڕشی 17 — 30 تەمووزی ساڵ 1968دا هەوڵی‌دا بۆ بڵاوکردنەوەی دیموکراتیەت لە عیراقدا . گیراوە سیاسی‌یەکانی ئازاد کردو مووچەخۆرەکانی گێڕایەوە بۆ سەرکاری پێشویان . جگە لەمەش چارەسەری بۆ کێشەی کورد داناو توانی بەرەیێکی نیشتمانی‌و نەتەوەیی‌و پێشکەوتنخواز دروست بکات کە لەسەر بنچینەکانی کارنامەی نیشتمانی هاتەکایەوە ئەو بنچینانەی بەعس خاڵەکانی دانا . لە پاڵ چەسپاندنی دیموکراتیەت لە عیراقدا ، پارت سزای دوژمنانی گەلی داو سیخوڕەکانی لە سێدارەداو دەرەبەگایەتی لەناو بردو نەوتی خۆماڵی کردو عیراقی بۆ بارێکی پێشکەوتوو گواستەوە .. هتد لەو هەنگاو ودەست کەوتانەی سەربەستیان بۆ گەل دابین کردو یەکێتی بۆ ڕیزەکانی گێڕایەوە . ئەوەی شایانی باسە ژماردنی دەستکەوتەکانی گەلەکەمان لە سایەی بەعس ئەرکێکی گرانەو لێرەدا ژماردنیانمان بۆ ئەنجام نادرێت تەنها پەنجەمان بۆ هێندێکیان درێژ کرد .

لەبەر ئەوەی پارتی بەعس پارتێکی پێشڕووە بۆ نەتەوەی عەرەب‌و یەکێك لە هەرە ئاواتە بەرزەکانی هەوڵدانە بۆ جێبەجێ کردنی یەکێتی گەلی عەرەب‌و تێکۆشان لە پێناوی جێبەجێ کردنی ئەم یەکێتی‌یە لە نێوان وولاتانی عەرەبدا . پارتی بەعس بەشدارییکی کاریگەرانەی لە خەباتی نەتەوەی عەرەب هەبووەو هەیەو ئێستاش قوربانییکی گەورە دەدات لە خەباتی ڕۆژانەیدا : بەشداری لە جەنگەکانی تشریندا کردو پاڵپشتی خەباتی گەلی لوبنان دەکات دژی ئیستعمارو داگیرکەرە زایۆنیزمەکان . ئەمە جگە لە خۆڕاگرتن بەرامبەر هێرشە دڕندەکانی فورس ئەو هێرشانەی پەلاماری عەرەب دەدات بۆ داگیرکردنی وولاتی عەرەب‌و بە دیل کردنی گەلەکەی . ئێستاش عەرەب ڕوویان لە عیراق‌و لە خەباتی پارتی بەعس‌و سەرکردە مەزنەکەی تێکۆشەر صدام حسین کردووە . جەماوەری عیراق‌و جەماوەری عەرەب لە سەرانسەری نیشتمانی گەورەی عەرەب‌دا بۆی روون بووەتەوە ئەمیش لە ئەنجامی تاقی‌کردنەوەیێکی زۆرو بە نرخ ، کە پارتی بەعس ئەو پارتە شۆڕشگێڕەیە کە بتوانێ ڕزگاریان بکات‌و یەکگرتن بۆ عەرەب دابین بکات ، ئەو پارتەی کە خەبات دژی هەموو دوژمنانی نەتەوە دەکات .

ئەگەر عیراق‌و سەرکردایەتی پارت‌و شۆڕش خەریکی شەڕی سەپێنراو بەسەر ڕۆڵەکانی گەلەکەمان‌و وولاتەکەمان نەبوونایە ، ئێستاکە کێشەی فەلەستین سەرکەوتنی بە دەست دەهێنا ، نەوەك هەر ئەمە بگرە کێشەی عەرەبیش لە بارێکی‌تر دەبوو ، بارێك کە یەکێتی هەموو ڕۆڵەکانی عەرەبی تێدا دەهاتە دی .

عیراقی بەعس قەلاییکی پۆلاییە لەبەر دەم ئیستعمار لە ناوچەدا ، سوپاکەشی بەرگری لە هەموو نیشتمانی عەرەب دەکات ، گەلێ جار لە سەر زمانی لێپرسراوەکانی پارت‌و دەوڵەت ڕاگەیاندراوە کە عیراق ئامادەیە بەرگری لە بەرژەوەندی عەرەب بکات . کاتێ رژێمی ئێرانی‌ی گومان لێکراو پەلاماری ئاسا یشی کوێتی برای دا عیراق دەرسێکی

باشی دایە ئێرانی‌یە تاوانبارەکان ، دەرسێك هەتا هەتایە لە بیریان نەچێ .

ئا بەم جۆرە ، لە ژێر ئالآی بەعس ، عیراق بوو بە گەورەترین هێزی عەرەب کە کار لە خەباتی جەماوەری عەرەب دەکات ، ئەم جەماوەرەش هیوایێکی مەزنی بە سیاسەتە شۆڕشگێڕانەکەی بەعسی‌و حکومەتە نیشتمانی پەروەرەکەی هەیە بۆ نزیك خستنەوەی یەکێتی‌و سەربەستی‌و سۆشیالیزم بۆ عەرەب‌و لابردنی قەوارەی زایۆنیزمی تاوانبارو لێدانی بەرژەوندیەکانی ئیمپریالیزم لە هەر شوێنێك بێت لە شوێنەکانی نیشتمانی عەرەب ئیمپریالیستەکان ئەو ڕاستی‌یەیان زانیوە ، بۆیە دریغیان لە پیلان گێران دژی عیراق‌و پارت‌و سەرۆکەکەی نەکردووە . لە ڕۆژانی یەکەمی هاتنی بەعس بۆ فەرمان ڕەوایی لە عیراقدا ، شایان دژی وولاتەکەمان هاندا ، کاتێ شا رووخا ، میرات گرەکەی خومەینی‌ی بەکرێگیراو لەسەر هەمان نەخشەو پیلان ڕۆیشت بەلآم بە شێوەیێکی توندتر . نەك هەر ئەمە ، بگرە زایۆنیزمی دوژمنیش هێرشێکی درندانەی بۆ سەر دەزگا ئەتۆمی‌یەکانی عیراق هێنا ئەو دەزگایانەی بۆ کاروباری ئاشتیانەو زانستیانە دامەزرابوون . ئەو پیلانانەی دژی حکومەتی بەعسی لە عیراقدا گێردرا هەر لە سالی 1968 دا تا ئەمرۆ دەتوانین بلێین هیچ ڕژێمێك لە ناوچەدا تووشی نەهات . بەلآم سەرەڕای دەست درێژی‌ی هێزە ئیستعماریەکان دژی گەلەکەمان ، بەعس وەك پێشرەوێك بۆ نەتەوەی عەرەب دەمێنێتەوەو داواکانی ، چ لە نزیك‌و چ لە دوور دەبێ هەر سەرکەوێ .

لە نێوان دەولەتانیشدا عیراقی بەعس شوێنی تایبەتی خۆی هەیە ، بەتایبەتی لە نێوان ڕژێم‌و ڕێکخراوە ئازادیخوازەکان لە جیهاندا . ئەمیش سەبارەت بە سیاسەتە ڕاستەقینەکەی : سیاسەتی بێ‌لایەنی‌و توانی ئازایانە سیاسەتە بێ لایەنەکەی لە گەل سیاسەتە شۆڕشگێڕیانەکەی دژی ئیمپریالیزم‌و زایۆنیزم بگونجێنی . بەعس پالپشتی خەباتی گەلان دەکات‌و پەیوەندیێکی ڕاست‌و دروست دەبەستی لە گەل هەموو ئەو دەولەتانەی ڕێز لە سەربەخۆی عیراق دەنێن‌و بە چاوێکی دادپەروەرانە تەماشای جوولانەوەی رزگاریخوازی عەرەب دەکەن .. پەیوەندی خۆی لە گەل وولاتە سۆشیالیستەکان بەتین کردو لە پێناوی چەسپاندنی سەربەخۆی‌ی عیراق پەیوەندی لە گەل گەلی دەولەت بەست وەك ژاپوون‌و فەرەنساو ئیتالیاو بەرازیل .. هتد ، ئەمە لە لایێك‌و لە لایێکی تریشەوە پەیوەندی‌و دۆستایەتی‌ی لە گەل وولاتانی جیهانی سێ‌یەمدا واتە وولاتە بێ‌لایەنەکان تا بلێی باشە . لەبەر ئەم هۆیانەو چەند هۆییکی تریش ئیمپریالیستەکان نارەزایی بەرامبەر سیاسەتی عیراق دەردەبرن وهەول‌و تەقەلا دەدەن بۆ لاواز کردنی رۆلی عیراق لە سیاسەتی نێو وولاتاندا .

سیاسەتی دەرەوەی حکومەتی بەعس لەسەر بیروڕاییکی بەرز چەسپاوە ، ئەو سیاسەتەش پالپشتە بۆ گەلان‌و ئاشتی لە جیهانداو خەباتە بۆ لابردنی شەڕی ئەتۆمی‌و هەولدانە بۆ دروست کردنی جیهانێکی باشتر .

لە کۆتاییدا ، پارتی بەعس ، تەنها پارتە لە مێژوودا کە دانی بە ئۆتۆنۆمی نا بۆ کورد نەك هەر بە قسە بەلکو بەکار ، کوردی عیراقیش تەنها کوردن لە مێژودا کە تام‌و چێژ لە ماف نەتەوەی‌ی فراوان وەردەگرن . وە لە کاتێك کە ملیۆنەها عەرەب لە دەرەوەی عیراق ئەمرۆ ڕوو لە عیراق‌و پارتی بەعس دەکەن ، ملیۆنەها کوردیش لە هەمان کاتدا ڕوو لە عیراق‌و پارتی دەکەن بەو هیوایەی باری کورد لە عیراقداو ئۆتۆنۆمی بۆ کوردستانی عیراق ببێتە هاندەرێك بۆ پێشخستنی جوولانەوەی ئازادیخوازی کورد بۆ پێشەوە .

ئێمە لە کاتێکدا کە ئاهەنگ دەگێڕین بە بۆنەی یادی 37 دامەزراندنی پارتی بەعسی مەزن ، دلنیاینە لە سەرکەوتنی پارت بەسەر هێرشە درندانەکەی ئیمپریالیزم دژی وولاتەکەمان . هەر وەکو پارت لە جەنگەکانی پێشوودا بەسەر دوژمنانی زال بوو ، لە جەنگی ئێستاشدا هەر بە سەرکەوتوویی دەر دەچێ .

لە ڕۆژی ئاهەنگ گێران بەم بۆنە پیرۆزە دەستەی نووسەرانی « کاروان » پیرۆزبایی لە سەرکردایەتی پارت‌و شۆڕش‌و سەرەکی تێکۆشەر صدام حسین دەکات‌و هیوادارە گەل لە جەنگە پیرۆزەکەیدا ، جەنگی قادسیەی صدامی پیرۆز ، دوژمنی ئێرانی‌ی رەگەز پەرست ببەزێنی‌و لەناو ببات ....

بژی پارت‌و بژی سەرەك‌و سەرکەوتن هەمیشە بۆ قادسیەی دووەمە .

**« دەستەی نووسەران »**

# ناوەرۆکی سیاسی وکۆمەلایەتی ی چیرۆکی کوردی

دوکتۆر : عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ

لە سەرەتای ووتارێکدا کە بۆ ژمارەی تایبەتی ی گۆڤاری (الاقلام)ی بۆ چیرۆکی کوردی تەرخانکراوم ئامادەکرد نووسیم :

« .... کاتێ کە ڕایان سپاردم کە لێکۆڵینەوەیەك یا ووتارێکی نومایش ئامیز بۆ ئەم ژمارە تایبەتی یە بنووسم . وورده کاغەزی چاپکراو ودەستنووسی خۆم کۆکردەوە . واتە هەرچیم لەمەوبەر بە کوردی‌و عەرەبی دەربارەی چیرۆکی کوردی نووسیبوو هێناومەو بەردەمم ، **دیم کە ئەو باسەی لە دیداری یەکەمی چیرۆکی کوردی‌دا لە سەری ڕەش (1979) خوێندبووومەوە** ، هێشتا بلاونەکراوەتەوە . باسەکە دەربارەی «ناوەڕۆکی سیاسی‌و کۆمەلایەتی ی چیرۆکی کوردی بوو ... » لەبەر ئەوە ئەو باسەم کرد بە کۆڵەکەی ئەو باسە بە عەرەبی یە نووسراوە [1] » ] بەلام کە دوایی دیم باسەکە خۆی بە کوردی نووسراوەو نووسینە عەرەبی یەکەش لە هەندێ لایەنی دا لە کوردی یە کە جیاوازە وام پێ باش بوو ، ڕەشنووسی ئەو باسە بە کوردی بۆ چاپ ئامادە بکەم‌و بەلێنم لە گۆڤاری «کاروان» وەرگرت ، کە ئەمەیان بلاوبکرێتەوەو وەك هەندێ نووسینی ترم ، نەدرێتەوە بەڕووی خاوەنیدا . لەبەرئەوەش کە نازانم کامیان ـ واتە : عەرەبی یەکەو کوردی یەکە ـ پێشتر چاپ دەکرێن داوای لێبوردنی لە یەکچوون دەکەم ، بە هەموو بارێکدا ئەگەر تەواویش لەیەك بچن ، چونکە بە دوو زمانی جیاوازن ، ئەوا هەر لەیەکتر جیان‌و دیارە نووسینی نووسەرێکیش دەربارەی یەك باس ، هەر دەبێ لەیەکچوونی تێدابێت .

**شتێك بۆ سەرەتا :**

شار[2] زۆر نەبوو دامەزرابوو ئەوەی لەم تیرەو ئەو تیرەی قەلەمڕەوی میرنشینەوە بە هەلبژاردە هاتبوو ، تەپو تۆزی دواکەوتنی دیهات‌و کۆچەری لە خۆی لادابوو ، تێکەڵ بە ڕەوتی شارستانی ی ئەوانە بوو کە لە شارانی ترەوە هاتبوون . مەلای لادێ‌و مەلای شارانی تر ، بە لێهاتوویی شانیان لە شانی زانایانی مزگەوتی سووری جەزیرەو مزگەوتی قوبادی ئامێدی‌و دارولئیحسانی سنە دەداو لە هەلچوونێکی تێکەڵبووندا دەیانوویست مزگەوتی گەورەی سلێمانی خۆی بکەیێنێتە ئەزهەرو ئایا سۆفیاو مزگەوتی ئەمەویی شام .

شیعر دەنگی ئەدایەوەو نالی بوو بووە خاوەنی سێ موڵك‌و دیوانی هەبوو[3] ، گوڵی باغی ئیرەمەکەی بۆتان لە سەیرانەوە

مەشخەڵی نیازی بوونە شەوچرای شەوی کوردستانی بوو[4] . کارگەو پیشەسازیی بچووك لەگەڵ بناغەی شاردا دامەزراو قافلە لە ڕۆم و عەجەم دەگەڕایەوە ، یا قافڵەی بازرگانیی ئەوان بێرەدا ڕەت دەبوو .

ئەم گزنگی شارستانی یە ، شوێن پێی دیاردەیەکی تازەی سەر بە شارستانێتیی لە ئەدەبیات دەویست . ڕووی بناغە دانانی لە خاوەن بەهرەو دەسەلاتێك دەکرد ، ئەویش وەك هەمووی دەروێشێکی بارەگای ئەدەبیات بە شیعر دەستی پێکردبوو ، بەلام دەبێ چ نهێنی یەك لە وەدا بێت ، کە دەست لە شیعر هەڵگرێ ، یا بڵێین بە شیعرەوە نەتوانێ لە مەجلیسی شاعیراندا جێی ببێتەوە ، بەلام بە دەسەلاتێکی بەهرەدارانەو هەستێکی ووردی داچەسپاندنی ووشەی کوردی یەوە ، بتوانێ خۆی بە دامەزرێنەری پەخشانی کوردی بە مێژووی کورد بناسێنی .

ئەمەیە چیرۆکی کورتی پەیدابوونی پەخشانی کوردی و نووسینی **یەکەم بەرهەم کە مەولوود نامەی شێخ حسێنی قازی یە**[5] . مایەی شانازی یە ، کە لە دوای دەست نیشان کردنی ئەم ڕاستی یە لە کتێبی «الواقعية في الادب الكردي»دا[6] ، ئیتر خۆ بەخۆ هەموو تۆمارکەران و زانیاری بڵاوکەرەوانی مێژووی ئەدەبیاتی کوردی ، سەرەتای پەخشانیان سەد ساڵێك زیاتر بردە دوواوەو شێخ حسینی قازی (1790 — 1870) بوو بە دامەزرێنەری پەخشانی کوردی . بەلام ئەوەی دەبێ لێرەدا بووترێت و هەر ئێرە جێگەی ووتنێتی ئەوەیە کە ئەو مەولوود نامەیە هەر سەرەتای پەخشان و سەجع نووسینی کوردی نی یە ، بەڵکو سەرەتای چیرۆکی کوردیشە .

زۆرتان سەرسامن ، ڕەنگە ڕازی نەبن . بەلام با بپرسین چ شتێك دەچێتە ڕیزی چیرۆکەوەو چی لەو چوارچێوەیە لادەدرێ . ئەوەی ئەمڕۆ بە شیعری دەزانین ، بە پێوانەی دوێنێ شیعر نەبوو ، بەلام ئەمڕۆ شیعرە . لێرەدا بنەڕەتێکی فەلسەفەی پێشکەوتنخواز خۆی دەچەسپێنێ ، ئەویش بنەڕەتی «هیستۆریزم»ە . ئەو بنەڕەتە وامان ڕێگە نیشان دەدا ، کە هەموو دیاردەیەك لە سنووری مێژوویی خۆیدا ببینین ، ببیەستین بە «کات»و «شوێن»ی خۆیەوە .

بەپێی ئەم بنەڕەتەو لەم باری سەرنجەوە ، ئەو حیکایەتە بچووکانەی شێخ حسینی قازی دەربارەی مەولوودو چاکەی مەولوود خوێندنەوە دەیگێڕێتەوە ، هەروەها گێڕانەوەی باس و باوەڕی دروست بوونی زەوی و ئاسمان و لە دایك بوونی پێغەمبەر بەو شێوە حیکایەت ئامێزە ، سەرەتای ساکاری چیرۆکی کوردی یە . ڕەنگە دیسان نارەزایی یەکی تر بێتەکایەوە ، ئەویش ئەوەیە کە ئەم چەشنە حیکایەتە سادەیە لە ئەدەبیاتی ڕۆژهەلاتدا تازە نی یەو ئەو بابەتە تەواو شەقڵی وەرگرتنی پێوەیە . وەلامی ئەمەش هەر ئەوەیە ، کە لە کوردیدا و بە کوردی تازەیە ، لەبەرئەوە هەر سەرەتایە . ئەگەر عەرەبیش «الاغاني» و «أمالي» ی «القالي» و نووسینەکانی جاحیزو «ألف ليلة و ليلة » .. و .. «كليلة وديمنه» بە سەرەتای پەتەوی چیرۆکی عەرەبی دا نەنێن و هەر لە تەئسیرە ئەورووپایی یەکەوە دەست پێ بکەن . یا فارس هیچ حیسابێك بۆ حیکایەتەکانی ناسر خەسرەوو گولستان نەکەن ، ئەوە دەکەونە «یەك لابینی» یەوە . کە ئەمەش چ لە فەلسەفەدا و چ لە سیاسەتدا ڕێگەی گومڕایی دەداو بۆ مێژوو نووسی ئەدەبیات و ڕەخنەگری ئەدەبیش دەردێکی کوشندەیە .

سامانی نەتەوەیی (تراث) ، هەر وەك شتێکی پیرۆزە ، سەرچاوەی ڕاستەقینەی ئەدەبیاتی هەموو نەتەوەیەکیشە ، نە زۆری پێوە دەنێین و نە بە پەرستن و لێ لانەدانی خۆمان دەخەینە چاڵی کۆنە پەرستی یەوە ، نە بەوەش کە ڕێزی لێ نەگرین و سوودی لێ نەبینین و بەرەو پێشی نەبەین خۆمان دەخەینە گێژاوی خنکێنەری کۆسمۆپۆلیتی یەتەوە .

.... لەبەرئەوەیە کە چیرۆکی کوردی نە بە بەردەوامیی تەنیای حیکایەتی کوردی دەزانین ، نە بە سنعەتێکی گوێزراوەو وەرگیراوی ئەورووپایی دەزانین . بەڵکو چیرۆکی تازەی کوردی هەموو سامانی ووتراو ونووسراوی نەتەوەیی و تەکنیکی چیرۆکی گەلان بە ئیبداعەوە لەگەڵ هەموو دەسکەوتەکانی کان و تەجروبەی ژیاندا تێکەڵ دەکات و لە وێنەی دوێنێ و ئەمڕۆ دیمەنی شۆڕشگێڕانەی دوا ڕۆژ دروست دەکا .

.... هەر بەپێی ئەم باری سەرنجە ، کە پێڕەوی فەلسەفی و جیهان بینیمانە ، لە مەیدانی مێژووی ئەدەبیاتیشدا ، هەر دەبێ ڕێ نومامان بەرەو ئەو سەرەتا بەنرخە بچێت ، بەرەو «مەولوو د نامەی شێخ حسینی قازی» . کە باسی ئێستاشمان دەربارەی ناوەڕۆکی سیاسی و کۆمەلایەتیی چیرۆکی کوردی یە . دەبێ لە ڕووی ناوەڕۆکەوە

ئەو سەرەتایە ببەستین بە شیعری تەسەوفی مەلای جزیـری‌و خانی‌یەوەو لەگەڵ ستایشی ئاینی (یاستایشی پێغەمبەری) نالیدا یەکیان بخەین ، بەلاّم لە حیکـایەتـەکانی مـەولوودا تالّێکی باریکی خۆشەویستی‌ی هەژاران‌و چـاکەخـوازیش دەبینین ، بەلاّم تەنیا تالّێکی باریک . بە هەموو جۆرێك ئەوە سەرەتایە .

* * *

.... وەك پێشتر لە باسی هەموو پـەخشانـدا باسی ئـەو سەرەتایە نەبوو هەر بە باسی «لە خەوما»[٣]ی جەمیل سائیب دەسـت‌پێ‌دەکـرا ، لە بـاسی چـیـرۆکیـشـدا هـەر بـەوە دەست‌پێ‌کراوەو ئێستاش لە شێـخ حسێنی قازی‌یـەوە دەبێ بێینە سەر قوتبی ئەوبەری کێشەیەکی درێژ ، سـەر جەمیـل سـائیب‌و ئەو خـەوەی هێشتـا هـەر خـەریکی لێکـدانـەوەو «تەعبیر»ی ئەوین .

ئەگەر جەمال بابان بەو پێشەکی‌یە پڕ لە ئینفیعالەوە سەر لە نوێ .. « لە خەوما » ی چاپ نەکردایەوە ، ئەوا بێ سێ‌و دوو تاجی نەوازش‌و هونەرمەندیمان دەخستە سـەر جەمیـل سائیب‌و لە کونجی بەرەو شارستانێتی چوونەوە ، بە دانەری هونەرێکی تـازەو پەیـداکەری کـۆلّەکەیـەکی تازەی هـونەرو شارستانێتی‌ی ناو کوردمان دادەنا . بەلاّم ئەو پێشەکی‌یەی جەمال بابان کە تەواو دەچێتـە خانـەی ئەو لە «هستـۆریزم» دووری یەوە کە باسمان کرد ، سەر لە نوێ کێشەیەکی کۆنی تازە کردەوە ، وای لە زۆر کەس کرد ، بە لێکدانەوەی ڕۆژانی شێخ مەحموود بیر بکەنەوەو جێگەی خۆیان لە ڕیزی کێشەی ئـەمرۆدا بـەردەن‌و پچنە ڕیـزی کەس‌و بـاوو بـاپـیری ئـەو سەردەمەیان‌و لەگەڵ ئەواندا ڕیزبگرن‌و بە ناچاری هەلّوێستی ئـەوانیان ببێت . بـەتایبـەتی کە بـزمـاری «مـا اشبـه الليلة بالبارحة»ی ، زۆر نارەواو نا مەوزووعیانە بە پێشەکی‌یەکەیدا داکوتا .

زۆرمـان لە سالاّنی دوایـیدا جـەمیـل سـائیبمـان بـە فەرمانبەری‌و بە سەرنووسەری ژین دی بوو ، پیـاوێکی باشی بێ‌وەیی ، خـزمەتگوزارو دوور لە هەلّسـوکەوتی ڕۆژانـەی سیـاسـەت . تـۆ بڵێی ئـەگەر خـۆی بمایـە ، بەم چـەشنـە چاپکردنەوەیەی «لەخەوما» ڕازی بـووایە ؟ تـۆ بڵێی پـاش پەنجا ساڵ زیاترو نیشتنەوەی کەف‌و کوڵی کێشەی ڕۆژانەی سیاسەت ، ڕای بەرامبەر بە شێخ‌و حوکمڕانی‌ی ئەو هەر ئەوە بووایە ، یا ئەویش لەگـەڵ ئەو حـەمدیی سـاحێبقرانـەدا کە لەکاتی دەست ڕۆیشتنی شێخ مەحمووددا زمانی «شێخ ڕەزا» ی خستبووە کار ، هاواری نەکردایە :

**وەك مـەدینـە بێ نـەبی بێ یـا نـەجـەف بێ بێ عـەلی**
**شاری غەزنەش ئێستە بێ مەحموودە وەك داری کـەلی**[٣]

بـەڵێ ... سەرەتـای هونـەری تازە بـابەتی چیـرۆکە ، تەنانەت سەرەتای ڕووکردنە ئەو باسەی ژیان‌و واقیع نەخشە کێشانە ، کە تا ئێستا دابێ چیرۆك نووسانمانە لەبەرئەوە چەند دێڕێکی دەربارە دەڵێمەوە ، ئەگەر نەختێ سـەختی‌و تیژیشی تێدابێت ، دیارە وەباڵ بە ئەستۆی ئـەو چاپ کـردنەوەیـەی چیرۆکەکەیە . کورتەی ڕام دەربارەی ئەو چیرۆکە لە کتێبێکدا بـۆ قوتـابیان نـووسیبوو ، لێـرەدا هەر بـە شێوەکـەی خۆی دەینووسمەوە ، چونکە کە کورتەی ڕا دەربڕین پێویستبێ ، لەوە زیاتر دەربارەی ناووترێت . لەوێدا نووسرابوو .

«.... **ئەم چیرۆکە بە شێوەی خەوێك باسی ڕۆژانی فەرمانڕەوایی شێخ مـەحموودی حـەفید دەگێـڕێتەوە** . بەداخەوە ، هەندێك هۆی خـۆیی‌و تایبـەتی وای کردووە کـە نووسەر هەر لایەنی سیلبی‌ی ئەو ڕۆژانە ببینێت . نووسەر داخ لە دڵە ، لەبەر ئەوە ئەو ڕۆژانە بە خەوێکی ناخۆش دەزانێت . ڕەنگە نووسەر لە باری سـەرنجی خۆیـەوەو بەوچـاوەی ئەو تەماشای کردووە هەقی ئەوەی بدرێتێ . کە ئەو ڕۆژانە بـە خـەوی ناخـۆش بزانێت ، بـەلاّم لە ڕووی بـاری سـەرنجی گشتی‌یەوە ئەو ڕێگەیە نادرێت . چونکە ئەو ڕۆژانە لە مێژووی کورددا تەجـروبەیـەکی مێژوویی گـەورە بوون ، ئـەگەر بـە خەویش بێتە ژماردن ، ئەوە خـەوێکی زۆر خۆش بـوو ، هەر چەندە تـەجروبـەکە لە ڕووی مێـژوویی‌یەوە لە پـاڵ هەمـوو دیمـەنێکی ئیجابیـدا هەنـدێك دیمـەنی سیلبیشی تێدابـوو . چیرۆکی «لە خەوما» تا ئێستـا لە ڕووی بابـەت‌و ڕوخسارەوە بەیەکەم چیرۆك دادەنرێت ، هەرچـەندە بـە باری سـەرنجی ئیمرۆ بە سەرەتایەکی ساکـاری چیرۆك دەزانـرێت ، یەکـەم ڕەگەزی چیرۆك لێرەدا باس گێرانەوەیە»[٣] .

بـەلاّم «لە خـەومـا» لە ڕووی ڕووکـردنـە واقیـع‌و

داچەسپاندنی ڕیالیزمی ی چیرۆکی کوردی یەوە نیشانەیەکی
گەورەیە بۆ «مەسەلەی ویژدان» ی ئەحمەد موختار جافیش ، بە
داوای لێ بووردنەوە هەر لەبەر ئەو هۆیەی پێشوو چەند دێڕێك
دووبارە دەکەمەوەو دەڵێم :

ئەم چیرۆکە لەبەرئەوەی کە لە کاتی خۆیدا
بڵاونەکراوەتەوە ، کاریگی ئەوتۆی نەکردۆتە سەر پێشکەوتن و
گەشەسەندنی چیرۆك و پەخشانی کوردی ، بەلام ئەگەر
لەکاتی خۆیدا بڵاوبکرایەوە ، کاریکی گەورەی دەکردە سەر
گەشەسەندنی چیرۆکی کوردی و دەبووە پاڵپێوەنەر بۆ
پەیدابوون و نووسینی گەلێك چیرۆکی‌ترو نووسەرانی کوردی
وا لێ دەکرد کە گەلێك دیمەنی ژیانی گەلەکەی خۆیان ، بە
چیرۆك نەخشە بکێشن و ڕەخنە لە لایەنی چەوتی بگرن و ڕێ و
شوێنی ڕاستەقینە بەرەو پێشکەوتنی دواڕۆژ دابنێن .

چیرۆکی **(مەسەلەی ویژدان)** ، لە ڕووی بابەتەوە ،
کەرەسەی نووسینی ڕۆمانێکی درێژەو ئاخنراوەتە چیرۆکێکی
کورتەوە . نووسەر لێرەدا وەك یاخی بوویەکی ڕاستەقینە خۆی
پیشان دەدات . کوڕی چینی دەرەبەگ و کاربەدەست و
لێپرسراوێکی سەرەتای ڕژێمی کۆنی پاشایەتیی عیراقە ،
بەلام پەردە لە ڕووی دەرەبەگی و ئەو ڕژێمە بۆگەنەی ئەوسا
هەڵدەماڵێ ، کە لەسەر بناغەی درۆزنی و دەست بڕین و ناپاکی و
پشت کردنە میللەت دامەزرابوو . نووسەر بە ڕەخنەگری دێتە
پێشەوەو ڕەخنە لە هەموو ئەو دیمەنانە دەگرێت کە لە ژیانی
خەڵکدا بە چەوت و نارەوای دەزانێت و بە نیشانەی
دواکەوتوویی دەزانێت . لێرەدا نووسەر وەك بیر ڕووناکێکی
ڕۆژی خۆی خۆیمان پیشان دەدات . هەروەك شەقڵی زانین و بیر
ڕووناکی و شارەزایی زمانان و بەرهەم و چیرۆکی بێگانە ، لەم
بەرهەمەدا بەباشی دەبینرێت .

بەڵێ ئەحمەد موختار جاف (1897 — 1935) تا ساڵی 1970 هەر بە
شاعیر باس دەکرا ، پاش چاپکردنی ئەم چیرۆکە دەتوانین بە
تەواوی لە بەرهەم و شەخسیەتی ئەم هونەرمەندە بکۆڵینەوە .
«شیعرو پەخشانی ئەحمەد موختار جاف یەکتر تەواو دەکەن و
وێنەیەکی تەواوکەرو یەکگرتووی ئەو هونەرمەندە ،
نارازی یە ، دەنگ دڵێرەمان پیشان دەدەن»[10].

دوای ئەم کورتە ڕایە هەندێك پرسیار دێتە بەردەممان .
بەڵێ بڵاوکەرەوەو پێشەکی نووسی ئەم چیرۆکەیان د . ئیحسان
فوئاد ، هەڵوێست و کرداری بەرامبەر بە چیرۆك و
نووسەرەکەی ، لە بڵاوکەرەوەی چیرۆکی پێشوو جیا
دەکرێتەوە . ئەم بەرزی و شکۆیەکی تازەی بەخشی بە
نووسەر ، لە چاو خەڵك و مێژووی ئەدەبیاتدا گەورەتری کرد ،
بەلام هەندێك پرسیار هەبوو کە دەبوو بە دوایدا بگەڕێت و
ئەوسا لە ئێستا باشتر ساغ دەکرانەوە .

ڕەنگە ئەم پرسیارانە لادان بن ، لە باسەکەی ئێرەمان ،
بەلام ئەمەش دەرفەتەو نابێ لە کیس بچێ .

بۆچ ئەحمەد موختار جاف لە چینەکەی خۆی ، لە
خزمەکانی خۆی ، لەو ڕژێمەی کاربەدەستی بووە یاخی بووە ؟
قارەمانی چیرۆکەکەی «زۆراب ئەفەندی» چەند لە کردارەکانی
ڕووداوو ڕاستن و چەندیان سێبەرن ، یا لەو کردارانەی
ئەدەبیاتی ڕیالیستن ، کە ڕوویان نەداوە ، بەلام هەر لە ڕووداو
دەچن و دەگونجێ ڕووبدەن و بەمە سروشتی ڕیالیستی
وەردەگرن . واتە ـ چەند دیمەن و سروشتی ئەو شەخسیەتە
ڕاستەقینەن و نووسەر چەند سێبەرو ڕەگی قووڵی واقیعیانەی
لەخۆیەوەو لەبەر ڕۆشنایی واقیعی گشتیدا بۆ دروست
کردووە . پرسیارەکان خۆیان لە وەلام دەچن ، هەر لەبەرئەوە
پرسیارێکی تریش دێتە پێشەوە ، ئەویش تۆمارکردنی
هەڵوێستی پڕ لە مەسئولیەت و شەریفی ئەحمەد موختار
جافە ...شاعیر لە زۆر کەس زیاتر زیان و ئازاری بە دەست
شەخسی سەرداری کورد شێخ مەحموودەوە دیوە ، بەلام
لەکاتی دەسەلات و ڕوخان و دەربەدەریشدا ، هەڵوێستی هەر
ئەوە بووە کەبووە لە گوڵ ناسکتری بەو پێشەوا مەزنە
نەووتووە .

دوا پرسیاریش دەربارەی سەرچاوەی خوێندنەوەی
نووسەرە ، ئەوە ڕەشی ی واقیعە بە کەس و کاربەدەستی
چەوتەوە ، بەدووا کەوتوویی یەوە ، تەواو خۆی دەنووێنێت ،
نووسەریش وەك بیەوێ کاربەدەستی چەوت و قەوزەی حەوزی
مزگەوت پێکەوە لە پێناوی « حفظ الصحة » دا ڕامالێ ، هاتووە
هەموو شتی ئاخنیوەتە چیرۆکەکەوە . بەلام ئەم خامەو
ئوسلووبی سەتیری « مولیر » یا « گۆگۆل » ە لەکوێوە
هاتووە ؟ دەبوو دوکتۆر ئیحسان فؤاد وەلام بداتەوەو هێشتا
وەلام دانەوە ماوە . ڕەنگە ئەو وەلام دانەوەیە بکەوێتە سەر
کەسانی ترو کەسی خۆیی بۆ پەیدابێت . ئەوەشمان لە بیر

ئه‌چێت كه حسێن عارف یه‌كێك له‌م پرسیارانه‌ی كردووه‌و وه‌لامیشی به‌م‌جۆره داوه‌ته‌وه كه ده‌ڵێ :

«به‌رای من ئه‌حمه‌د موختار هه‌رچه‌نده ئه‌و كاربه‌ده‌سته گه‌وره‌یه‌ی ڕژێم ئه‌و به‌چكه ده‌ره‌به‌گه‌و (شازاده‌ی كوردان) ه بووه كه باسمان كرد ، به‌لام ئه‌دیبێكی ڕووناكبیری خاوه‌ن هه‌ست‌و ویژدانێكی پاك بووه‌و له دڵ‌و ده‌روونـدا دژی زوڵم‌و زۆری كاربه‌ده‌ست‌و ئاغاو ده‌ره‌به‌گه خوێن مژه‌كان بووه‌و بیرو باوه‌ڕو كردارو نه‌ریتی كۆنه‌په‌رستانه‌ی لا نا په‌سندبووه . هه‌روه‌كو له هه‌ست‌و بیرو باوه‌ڕی كوردایه‌تیشدا ، ڕاستگۆو سه‌رڕاست بووه‌و بۆی دڵسۆز بووه . بۆیه ئه‌و ئه‌گه‌ر چی ئه‌وه‌ی له ناخی بیرو هۆشیدا باوه‌ڕی پێ‌ی هه‌بووه بۆی نه‌لواوه به كردار پێ‌ی له‌سه‌ر داگرێ‌و ڕاسته‌وخۆ كۆششی بۆبكات ، كه ده‌بێ به هه‌ردوو باری (زاتی‌و مه‌وزووعی) دا له‌م ڕووه‌وه وه‌زعیمان له‌به‌ر چاو بێ ، به‌لام به ئه‌ده‌ب‌و به‌شێوه‌یه‌كی تایبه‌تی له چیرۆكه‌كه‌یدا زۆر به ئاشكراو له ڕوو ئه‌و ئه‌ركه‌ی به‌جێ هێناوه» [11]

پیره‌مێردیش له مه‌یدانی چیرۆكی كوردیدا چه‌ند نیشانه‌ی به‌جێ هێشتووه . له فۆلكلۆری كوردی‌یه‌وه‌و له مێژووی كورده‌وه چیرۆكی ده‌هێناو ده‌یخسته قالبێكی ـ تا ڕاده‌یه‌ك ـ تازه‌وه . له بابه‌تی یه‌كه‌میان : «مه‌م‌و زین» ی نووسی ، كه شتێكی جیاوازه له مه‌م‌و زینی خانی‌و له مه‌م‌و زین‌و مه‌می ئالانه‌كانی فۆلكلۆر . له بابه‌تی چیرۆكی مێژوویش «دوانزه سواره‌ی مه‌ریوان» و «پیه‌سی ته‌ئریخی ، یا مه‌حموود ئاغای شێوه‌كه‌ل» ی نووسی‌و به‌چیرۆكی «شه‌ریف هه‌مه‌وه‌ند» له مه‌یدانی نووسین‌و كرداردا بناغه‌یه‌كی شانۆی كوردیی دامه‌زراند .

**حسێن عارف كورته‌یه‌ك ده‌رباره‌ی كۆششی چیرۆك نووسلنه‌ی پیره‌مێرد تۆمار ده‌كلو ده‌نووسێ .**

«له‌پاڵ ئه‌م كۆششانه‌یدا ، به درێژایی ئه‌و ساڵانه (سی‌یه‌كان)و له دوایی تریشدا له كۆڕی هونه‌ری چیرۆك نووسیندا به مانای سه‌ره‌تاو سه‌رهه‌ڵدانی له ئه‌ده‌به‌كه‌ماندا ، ده‌ورێكی تریشی گێڕاوه ... ده‌وری نووسینی ده‌یه‌ها پارچه په‌خشانی ئه‌ده‌بی كه من ـ واته حسێن ـ له وه‌ختی خۆیدا ، له لێكۆڵینه‌وه‌یه‌كی سه‌رپێیدا ده‌رباره‌ی چیرۆكی كوردی ناوم‌بردبوون ، به په‌خشانی چیرۆكاوی» [18] پاش ئه‌وه‌ی نووسه‌ر لایه‌نی بابه‌ت‌و ڕوخساری ئه‌م په‌خشانانه هه‌ڵده‌سه‌نگێنێ دێته‌وه سه‌ر ناوه‌ڕۆك : «.... به هه‌ر حاڵ پیره‌مێرد مه‌به‌ستی له‌و نووسینانه زیاتر ده‌ربڕینی بیرو ڕای خۆی بووه سه‌باره‌ت به ده‌ردێكی كۆمه‌لایه‌تی یا ڕه‌وشت‌و ڕه‌فتارێكی چه‌وت یا ڕاگه‌یاندنی په‌ندو ئامۆژگاری‌یه‌ك ده‌رباره‌ی ژیان» [13]. هه‌ر وه‌ك ئه‌مه‌ش ده‌ڵێ «.... به پێچه‌وانه‌ی جه‌میل سائیب‌و ئه‌حمه‌د موختاره‌وه ، ئه‌م خۆی به دوور گرتووه له ڕژێم‌و باری سیاسی ی سه‌رده‌می خۆی‌و هه‌ڵوێستێكی ئاشكرای به چاك‌و خراپ ده‌رباره نه‌نوواندووه .» [14] .

هه‌رچی «كه‌مانچه‌ژه‌ن» ی ، پیره مێردیشه ئه‌وه لێكۆڵینه‌وه‌ی تایبه‌تی‌و ساغ‌كردنه‌وه‌ی به‌شی نووسین‌و به‌شی وه‌رگێڕان‌و ئه‌وسا بڕیاری تایبه‌تی ده‌وێ .

* * *

حسێن عارف هه‌ر له ڕێڕه‌وی سه‌ره‌تادا له دوو چیرۆكی محه‌مه‌د عه‌لی كوردی ده‌دوێ كه یه‌كه‌میان» ه ... ڕاسته‌و خۆ ڕوو له ئامانجێكی كۆمه‌لایه‌تی‌ی ساكار ده‌كاو كه‌مته‌رخه‌می‌و ڕه‌ووشتی چه‌وتی مرۆڤێك نیشانده‌داو ڕه‌خنه‌ی لێ ده‌گرێ كه مه‌ی خۆرێكه» [15] دووه‌میشیان نووسه‌ره‌كه خۆی وای پێشكه‌ش كردووه كه «مه‌به‌ستم له نووسینی ئه‌م ڕۆمانه ئه‌مه‌یه : له ژیانی قه‌ومی كورد لاپه‌ڕه‌یه‌ك نیشان بده‌م كه به‌چاو بێ ئه‌همیه‌ت‌و فه‌قیره ، به‌لام له نفس الامردا زۆر به قیمه‌ت‌و گه‌وره‌یه» تا ده‌ڵێ «نازدار پێمان نیشان ده‌دات كه ژنی كورد له لادێ چه‌ند سه‌ربه‌خۆو سه‌ربه‌رزه .» [16]

**حوزنی موكریانیش** یه‌كێكه له‌وانه‌ی هه‌ر له سه‌ره‌تای نووسینی‌یه‌وه تا كۆچ‌كردنی ، له‌پاڵ هه‌موو كۆشش‌و به‌ری هه‌مه‌ڕه‌نگی خامه‌دا گه‌لێك چیرۆكیشی نووسیووه . هه‌روه‌ك حسێن عارف ده‌ڵێ : «باس‌و خوازی سه‌رجه‌م چیرۆكه‌كانی (حوزنی) بریتین له به‌ندو باوی فۆلكلۆری ، یا سه‌رگوزه‌شته‌و حیكایه‌تی ده‌ماو ده‌می خه‌ڵكی‌و قسه‌و باسی ناو كۆڕو كۆمه‌ڵیان ، وه‌یا ڕووداوی تایبه‌تی ژیانی خۆی كه هه‌موویانی له قالبێكی ساده‌و ساكاری بێ فه‌نتازیدا نووسیووه [17]..»

* *

ئه‌مه هه‌موو سه‌ره‌تابوو ، سه‌ره‌تای چیرۆكی كوردی بوو ، سه‌ره‌تایه‌كی پڕ شان‌و شكۆوبه‌رز ، به‌سه‌د ڕه‌گ به واقیع‌و خه‌ڵك‌و زه‌وی‌و گه‌ل‌و مێژووه‌وه به‌سترابوو . شانازی‌یه

بۆ چیرۆکی کوردی کە هەر لە سەرەتاوە بەستراوە بە ئەدەبیاتێکەوە کە بۆ ژیان و ئاسوودەیی و بەختیاری دەجەنگێ ، سەر بە ڕێبازێکی گەورەی ئەدەبیاتی جیهانە کە شەرەفی ئامانجداریی و خەباتکاریی دراوەتێ ، سەر بە ڕیالیزمە .

ژیان و دیمەنی هەمەرەنگی ، کۆمەڵ و چەوتی و چینی زەروو سروشتی ، ئیبداعی گەل (فۆلکلۆرە دەوڵەمەندە بایەخدارەکەی) لە قالبی نووسراوی تازەدا ، مێژووی سەرفرازی خەباتی نەتەوە ، خۆشەویستیی خاکی نیشتمان ، پایە بڵندیی ژنی کورد ، ئەمانە هەموو لەم سەرەتایەدا ڕەنگیان داوەتەوە ، تەنانەت ئەو بۆچوونانەش کە ڕەخنەیان لێ دەگیرێ ، هەر سەر بە ژیان و ڕیالیزمن .

* * *

تا ئێستا کە هاتووینە سەر دابەشکردن و پلە دانان بۆ هەموو ئەدەبیاتی کوردی چەند جۆر دابەشکردن بینراوە . چیرۆك لە ڕووی ناوەڕۆکەوە وەك ووترا سەر بە چەشنەکانی ڕیالیزم سەری دەرکرد لە ڕووی دیالێکتەوە بە زمانی ئەدەبیی بلاوی ئەم سەردەمە و هەر لە مەڵبەندی نالی و گۆران دا سەری دەرهێنا .

بەڵام زۆر چیرۆکی کرمانجی ژوورووش هەیە کە باری سەرنج ڕادەکێشن و[18] ڕەنگە بە زمانی تریش بەرهەمی چیرۆکی وامان هەبێت کە هەر بە مولکی ئەدەبیاتی کوردی بژمێرری[19] ، لەڕووی دابەش کردنی ساڵ و سەدەشەوە ، با وجوودی مەولوود نامەکەی شیخ حسینی قازی بەڵام تەوژمە ڕاستەقینەکە لە سەدەی بیستەمەوە دەست پێ دەکات . چیرۆك نووسەکانمان ـ هەر بە لاسایی ـ سوورن لەسەر ئەوەی هەر دەستەیە بدەنە پاڵ دەساڵێکی زەمان .... لە ڕاستیدا دوو یا سێ پلەی گەورەمان هەیە .

زۆر لەو دابەشکردنانە هەر بە دەمن و نەچوونە سەر کاغەز ، هەندێکیش بەتایبەتی ئەوەی حسین عارف ، زیاتر ڕووی ڕوخساری تێدا ڕەچاوکراوە ، یا ڕێگەی کار ئاسان کردنی تێدا خۆش کراوە .. لە کاتێکدا کە لە باری سەرنجی ڕیالیزمەوە هەمیشە ناوەڕۆك نیشانە دەرو ڕێ خۆشکەرو جەوهەری ڕوخسارە . دابەشکردنیش هیچ نەبێ دەبێ بە پێی ڕووداوی گەورەو دیاری مێژووی جیهان یا وولات بێ ، ڕووداوێك کە بەتەواوی کاری کردبێتە سەر ناوەڕۆکی ئەدەبیات و لە باس و بابەت و ڕوخساریی گۆڕی بێت .

بەم جۆرە ، دەبێ هەندێك جار پارسەنگی ڕوخساریش بدەینەوە ئەوسا بتوانین لەناو نەبینینی لە ڕەگەوە نەگۆڕانی بارو قەوارەی هەموو کورددا چەند پلەیەك دابنێین . کە **یەکەمیان** : پلەی سەرەتایە زۆرتر لە ڕووی ڕوخسارەوە شەقڵی خۆی هەیە[20] . **دووەمیان** : لە ماوەی جەنگی دووەمی جیهانەوە دەست پێ دەکات ـ تا شۆڕشی چواردەی تەموزی 1958 . سێ ساڵێك ماوەی گواستنەوەو گۆڕینە ، ئیتر پلەی تازەی چیرۆکی کوردی دەست پێ دەکات .

بۆ ئەم باسە ، کە باسی ناوەڕۆکی سیاسی و کۆمەلایەتیی چیرۆکی کوردییە ، ڕەنگە ئەو سنوور دانانەش هێشتا زەحمەت بێت ، هەندێك جار هێڵی سنوورەکە ئەوەندە کاڵە کە نابینرێت . لە کتێبی « **ڕیالیزم لە ئەدەبی کوردیدا** » ـ تێکڕا باسەکانی ئەدەبیاتی ڕیالیزمی کوردیم گرتبوو ، لە سەرەتاوە تا نووسینی ئەو کتێبە (1962) چیرۆکی کوردی و باسەکانی ، کورد ووتەنی بە کالاو پێتاوەوە چوو بووە ناو باسەکانی ڕیالیزمەوە . ئەگەر ئەمڕۆش بۆ دابەش کردنی باس بچینەوە ، وا ئەزانم هەر ئەبێ بچینەوە ، سەر ئەو باسانەو بەردەوامیی هەر باسە لە 1962 ـ ەوە تا ئێستا ببینین و هەندێك باسی دوور لە واقیعی ژیانی کوردیش دەست نیشان بکەین .

ئەوسا لەژێر باسی « ژیانی حەفەللاحی کورددا » پاش پیشاندانی بەرهەمی شیعر ، بۆ گەنجینەی چیرۆك ئەم چەند دێڕە ووترابوو . « پیرەمێرد بەراوردی ژیانی ئاسوودەی سەر نوێنی نەرمی دەرەبەگ و ژیانی فەللاحی زەحمەتکێشی ماندوو دەکات . یەکەمیان گوێی لە دەنگی سازو سەماوەرەو دووەمیان جنێو دەبیستێ ، تەنانەت سروشتیش ، ڕۆژیش ، بەلای پیرەمیردەوە بۆ ئەوە هەڵدێت کە بەرچاوی دەرەبەگ روون کاتەوە ، دوواییش دەڵێ : بە هەردووکیشیان دەڵێن ژیان »[21] .

زۆربەی چیرۆکە کوردییەکانی پاش جەنگی دووەمی جیهان وێنەی ئەم دوو چەشنە ژیانە پیشان دەدەن . زۆربەی چیرۆکەکانی **عەلادین سەجادی** ئەم دوو لایەنە دەگرنەوە ، ئەوەمان پیشان دەدات کە چۆن سەر خێڵی تیرەی کۆچەر دەست دەخاتە دەست دەرەبەگی نیشتە جێ و ەوبە هەردووکیان هەقی تیرەکە دەخۆن ، نووسەر ئەوە ڕوون دەکاتەوە کە

دەسەلات هەر بەدەست ڕەنج خۆرانەوەیە ، ئەگەر کوچەر بن و ئەگەر کشتوکاڵ بکەن ، چونکە ڕژێمەکە هـەریەکـە[22] . ئەو سەجادی یەی چیرۆکەکانی وێنەیەکی واقیعی ی سەرکەتووی ژیانی کوردو ژیانی فەللاحی کورد نەخشە دەکێشن لە « ڕۆنە زۆنگەکەی حەمە سەن » دا بە قووڵی زوڵم لێکردنی فەللاح دەبەستێت بەو ڕژێمەوە کە لەگەڵ ئیمپریالیزمدا هاوکارە ، چـەپەڵی ی دەزگـای میری و هـاوکاریی دەرەبـەگ و پـۆلیس و سـووخـۆران لە مـەیـدانـی دزینـی ڕەنجـی فـەللاحـدا پیشان دەدات . حەمەسەنی قارەمانی خۆبە خۆلە چیرۆکەکەدا گەشە دەسێنێ و خۆی هەست بە زوڵم دەکات و دەگاتە ڕاستی و لەوە دەگات کە تاقە پشتی هەر « حەمە ڕەشی » ی فەللاحە . نـووسەر ڕاستی یـەکی عیلمی وا دەردەخـات کـە پـراکتیـك سەلماندوویەتی : ئـەویش ئەوەیـە کە بـە نەمـانی زوڵم و زۆر بـەرهەم گـەشە دەسێنێ و ئیش کـردن سیمای نـاڕەحـەتی و نـاخۆشی ی پێـوە نامێنێ و دەبێتـە هـۆی خـۆشی بـەخشـین و ڕابواردن .

حەمە سەنی سەجادی هەر ئەوەیە کە دەستی دوعا بەرز دەکـاتـەوەو نـزای مـەرگی زاڵم دەکـات بـەلام فـەللاح لە چیرۆکەکانی بلەدا تێکۆشەرترو شۆڕشگێڕتـرو هۆشیـار ترەو باشتر لەوە دەگات کە یەکێتی و تێکۆشانی فەللاح نـاخۆشی ی ژیان ڕادەماڵێ و سەرشۆڕی مانەوەی دەرەبەگی تێدایە . پاش ئەشکەنجەو ڕووتاندنەوەیەکی زۆرو درێژ ، کە ئاغـاو پۆلیسی تێدا بەشـدار بوو ، فـەللاحی پیر ڕیێ ئـەو لاوە شۆڕشگێـڕە دەگرێ کە ڕۆژێك لە ڕۆژان بە شێتیـان دەزانی ، هۆی ئـەم هەموو ئازارو زوڵە کەمتەرخەمی ی خۆمـانە ، ڕاست دەکـا شێتە ، قسەکانی نەقشی بەردن»[23]

دەسەلاتی میری بـەلای نووسـەرەوە هەر دەسـەلاتی دەرەبەگە . بیری نووسـەر زۆر بزێوانە بەرەو پێشەوە دەچێ ، هەستی چینایەتی فەللاحەکەی ووردە ووردە بەسەر هـەموو شتێ تردا زاڵ دەبێت و هەموو شتێك لەو هەستەدا دەتوێتەوە . نووسەر هۆشیارانە بیری چەوتی ڕۆشنبیرە ناشۆڕشگێڕەکان ڕاست دەکاتەوەو فەللاح خۆی لێرەداو بە تـەجروبـە دەبێتە مامۆستای ڕۆشنبیران .

لە پاش شۆڕشی چواردەی تەمـوزەوە ، دیمەنی لادێ و پێوەندیی بـەرهەمهێنـان و ئاوو زەوی کـەوتە گـۆڕران ، ئەم گۆڕرانە ووردە ووردە لە چیرۆکی کوردیشدا هەر خۆی نواند ، دەستی پـۆلایینی فەللاح لە کـەشکۆڵە ئـەفسانـەیی یەکـەی حەسەن قزلجی یەوە دێتە دەرێ و دەدات لە فەرەیدوون بەگ و کەشکۆڵەکەش لێ ی نووسراوە «زەوی بۆ جوتیارو مـەرگ» بۆ دەرەبەگ .[24] «سۆفی سمایل» ی «نامەی سەر سنوور»ی مارف بەرزنجەیی چەك هەڵدەگرێ ، نایەلێ پیلانی دەرەبەگی کوردی سەر بە ئیمپریالیزم ، جمهوریەتە نەونەماکەی بخاتە چاڵەوە . بەلام کە دەسەلاتی بورژوازیی پیشەسازی لەسەر کاربوو ، لە زەوی دابەشکردن و دەرەبەگ نەهێشتنا دوو دڵ بوو ، جەمال بابان لە (جـومعەی جـامیع)دا بـە زمانی فـەللاحی کوردەوە گومانێکی ڕاستەقینە بـەرامبەر بـەو دەسەلاتـە دەردەبڕێ[25] . مەسەلەی زەوی و فەللاح لە پلەی دواییدا ـ واتە لە سالی 1960 بـە دوواوە خۆی لە خـۆیدا سـروشتێکی تری هـەیەو دیـارە ڕەنگـدانەوەی ئـەوەش لە چیرۆکی کـوردیدا چـەشنی خۆی هەیە .

دەتوانین لە باسی فەللاحەوە بێینە سەر گەلێك باسی تر ، لە چیرۆکی کوردیدا ، وەك «کرێکار ، شەڕو ئاشتی ، تێکۆشانی نیشتمانی ، ژن و ژنخوازیی ناو کورد ـ یەکێتی نیشتمانی ... هتد » کە ڕەنگدانەوەی ئەمانە لە بەرهەمی سەرەتاوە تا 1962 لە کتێبی «ڕیالیزم لە ئەدەبیاتی کوردیدا «پیشان دراوەو پاش ئەوە حسین عارف لە کتێبی «لێکۆڵینەوەی چیرۆکی هونەریی کوردی دا» لە نـاوەڕۆکی ئەو بـاسانـەی وەرگرتـووەو بە ئـەمانـەت سـەرچاوەی نیشـانداوە و زۆری لێ زیـادکردووە ، هـەروەك یەکێکی تر زۆری لەو کتێبە دووبارە کردۆتەوە بێ ئەوەی باسی کتێبەکەو سەرچاوە بکات . بە هەموو حاڵ ئەو بـاسە لەو سێ سەرچاوە چاپکراوەدا هەیەو نامەوێ لێرەدا ئەوە جـارێکی تر بڵێمەوە ، ئەوەی کە لەو باسە زیادبکرێ و پێوەندیی بەو پلەیەوە هەبێت ئەوەیە کە بڵێین مەحموود ئەحمـەد لەو سەردەمـەوە چی ی لە چیـرۆك و وتـار نـووسـیـووە ، هـەمـووی بـۆ بەربەرەکانێ ی دەرەبەگی و دواکـەوتنەو[26] چـارەسەرکـردنی مەسەلەشی هەر لە سنووری بیری سۆشیالیستیدایە .

بیری سۆشیالیستی پاش جەنگی دووەمی جیهان کاری کردە سەر تێکڕای ئەدەبیاتی کوردی ، ئەمە چ لە بـەرهەمی ئەوانەدا دیارە کە ئەوسا دەستیان دایە پێوەندی لەگەڵ بیری سۆشیالیستیداو پاشان بە یەکجاری پێوەی بەسـتران ، یا لە

بەرهەمی ئەوانەدا دیارە کە تا رادەیەك لەو بیرو رایە دوور بوون ، بەلام لە روانگەی بیری پێشکەوتنخوازییەوە چارەسەری کاری رۆژانەیان دەکرد ، دانەپاڵ کۆمەلانی زەحمەتکێشیان بە رێگەی لە دواکەوتن رزگار بوون دەزانی .

ئەگەر بچینەوە سەر باسەکانی ئەدەبیاتی ریالیزمی کوردی ماوەی جەنگی دووەمی جیهان و سەرەتای شەست ساڵەکان و جارێکی تردابەشیان بکەینەوە بەسەر ئەم باسانەدا :

تەنگو چەڵەمەی کۆمەلایەتی ، ژیانی فەللاح ، ژیانی کرێکار ، ژیانی تێکڕای گەل و دەستە زەحمەتکێشەکان ، خەباتی گەل ، هاوکاری و برایی نێو کورد ، برایی عەرەب و کورد ، هاوکاری تێکۆشانی جیهانی ، مەسەلەی ئاشتی و جەنگ ، نرخ پێدانی ئادەمیزاد ، وێنەی ئافرەت و سروشت، ئەوسا دەچیننەوە سەر ئەنجامەکانی پێشوومان و بەم جۆرە کورت و خەستیان دەکەینەوە .

1 - زۆر بە تەنگەوە پووکونە ژیانی گەل و پیشاندانی ئازاری زەحمەتکێشان دەبین ئەمەش هەر نەخشەکێشانی ژیانی رۆژانەو رەنج و چەوسانەوەیان نییە ، بەڵکو وێنەی تێکوشانیشیان وا لە پاڵدا . نەخشەکێشانی گشتیی ژیانی گەل و ئازاری زەحمەتکێشان و ئەو چارەسەرکردنانەی بەهۆی دەربڕینی ئەدەبییەوە لە تێکڕای شیعری کوردی و چیرۆکی کوردیدا لەو سەردەمەدا نەخشە کێشراون . بە هیچ جۆر ناچنە رێزی نەخشەکێشان و چارەسەرکردنی بۆرژوازییانەی مەسەلەکەوە .

بۆرژوازیی رادیکالیی ئەورووپا لە چارکردنی مەسەلەی کشتوکاڵدا هۆو رێبازی خۆی هەیە ، ئەم هۆو رێبازە لە رەنگدانەوەو چارەسەردا دەچێتە سنووری پیشەسازی لێکردن (تصنیع) و گواستنەوەی کۆمەڵ بەرەو پێوەندیی بۆرژوازی لە کشتوکاڵداو پێکەوە گرێدانی بەتینی نێو شارو دێهات لە چوارچێوەی جموجوڵی کشتوکاڵدا ، بەلام بەرهەمی ئەدەبی کوردیی ئەو سەردەمە بەتایبەتی چیرۆك تێکڕا ناچێتە ناو ئەو لێکدانەوە بۆرژوازییەوە . لەوێدا لایەنگرتنی تەواوی فەللاح دەبینین ، بێ ئەوەی کەمە ئارەزوویەکی دامەزراندنی کۆمەڵێکی تازەی چەوسانەوەدار ببینین . تەنانەت بەردەوامیی گوناهبارکردنی ئەو چەوساندنەوەیە دەبینین کە دێهات بە شارەوە دەبەستێت . لەم دانە پاڵ رەنجبەرانەدا ، هەموو ئەو شاعیرو نووسەرانە کە لە پێوەندیی رۆژانەدا خۆیان بەستووە بە بیرو تێکۆشانی پێناو سۆشیالیزمەوە ، یا لە رەفتاری رۆژانەدا لەم کۆرە دوور بوون هاوتان .

دەبێ چی هەست و نەستی بلەو عەلادین سەجادیو حەسەن قزڵجی و مارف بەرزنجی بەرامبەر بە فەللاحی کورد لەیەك جیا بکاتەوە . یا بە چ پێوانەیەك هەستی محەمەد مەولوودو کاوس قەفتان و مستەفا ساڵح کەریم و حسین عارف و جەمال نەبەزو محەرەم محەمەد ئەمین و محەمەد ساڵح سەعیدو جەمال بابان و کاکەمەم بۆتانی لە پلەی لەمەو دوادا لە یەك جیا بکەینەوە .

لە بەرهەمی هەموو ئەمانەدا نەخشە کێشانی کەرتی جیا جیای رەنجکێشانی رۆژانەو بە یەکجاری دانە دانە پاڵ فەللاح و بەربەرەکانیی دەرەبەگی دەبینین . چارەسەر کردنیش هەندێك جیاوازیی تێدایە ، هەندێك جار ئاواتی خێرخوازانەیەو هەندێك جار هاندانە بۆ تێکۆشان ، بەلام بە هیچ جۆرێك بیانوو بۆ هیچ بابەتە چەوساندنەوەیەك یا دانە پاڵ موڵکداری نابینین . ئەمەش وا دەکات کە گوناهبار کردنەکە بۆ پلەی دوای دەرەبەگیش درێژە بکێشێت بێگومان گوناهبارکردنی موڵکداریی تایبەتی بیرێکی سۆشیالیستییە ، پاڵپێوەنەرو جوولێنەری گوناهبارکەر هەرچی یەك بێت .

شیعری ئەو پلەیەو چیرۆکەکانی پاش ئەویش پڕن لەم گوناهبارکردنە .

رەنگە شاشییەك لە نەخشەکێشاندا یا سەرنەکەوتنێك لە هەڵبژاردنی نموونە یا مەیدانی سەرەکیی کێشەدا ببینین ، بەلام ئەمە لە بنەڕەتەوە لە دەسەلات نەبوون بەسەر هۆی تەکنیکیدا هاتووەو هەڵوێستێ نییە لە بیرو راوە پەیدا بوو بێت .

هەندێك چیرۆك خۆشویستنی فەللاحی چەوساوەی لێ دەتکێت ، بەلام ئەو خۆشویستنە زیاتر لە بەزەیی دەچێت بە فەللاحی چەوساوەدا وەك لەوەی

هەستی هاوکاریی چینایەتی بێت بەرامبەری ، ئەمەش لە وێنەدا دەچێتە خانەی بەزەیی ساختەگەرانەی بۆرژوازیەوە ، هەر چەندە خۆی لەوەوە هاتووە کە نووسەر بەتەواوی بەناو ژیانی ڕاستەقینەی ڕۆژانەی فەللاحدا ، ڕۆنەچۆتە خوارەوەو ئەو نووسەرانەی ناتوانن وێنەیەکی زیندووی ئەو ژیانەمان بدەنێ لە نزیکەوە ، لەگەڵ فەللاحدا نەژیاون ، وێنەی ناوەوەو مەنەلۆژی ناو دەروونیان پێ نەخشە ناکێشرێت . بەلام ئەمەش لە هەلوێستی ئایدیۆلۆژیان ناگۆڕێت .

ڕابەرە بەرایی یەکانی چیرۆکی ڕیالیستی ی کوردی لە ڕوانگەی ئەم جیهانبینی یەوە تەماشای مەسەلەی فەللاحیان کردووە ، چیرۆکی کوردی لەم سێ ساڵەی دواییدا هەر لەسەر ئەو ڕێبازە ڕۆیشتووە . وەك ووتمان : ڕەنگە چوونە ناو هەندێك وورده شتەوە هونەرمەندی لە دووبارەکردنەوەی واقیعەوە دوورخستبێتەوە ، بەلام نەخشە کێشانەوەی واقیعی بە ئاوات خواستراو هەر بە چەشنێك بووە کە موڵکداریی تایبەتی ی تێدا کوژابێتەوەو واقیعی بە ئاوات خواستراو هەر موڵکی زەوی چێنەر بووە یا لە وێنەی خەویشدا بووبێ .

لەبەر هەندێك هۆ جاروبار شەخسیەتی نموونەیی هەڵنابژێرێ ، یا شەخسیاتە هەڵبژێراوەکان ڕووی تێکۆشەرانەیان نی یەو مەیدانی کێشەکە لاڕێی یە ، بەلام ڕاستەقینەیە . کامیرای هونەرمەند نوختەی ڕاستەقینەی ڕووناکی پێبەخشین باش دەستنیشان ناکات ، بەلام ڕووی واقیعی ی تاوانباریش ئارایشت ناکات و سووراوو سپیاو لە دەم و چاوی چرچی دەرەبەگی و کۆنەپەرستی و دواکەوتوویی نادات .

ئەدەبیاتی کوردی یەکجاری دەرەبەگی ی تاوانبارکردووەو لە پاڵ فەللاحی زەبووندا وەستاوەو زوربەی زەویی ئەو واقیعەی ڕووناك کردۆتەوە کە خەڵك تێدا ژیاون و جاریکی تر واقیعی بەلێ زیاد کردنی مەردانەی بیری هونەرمەندان خۆیانەوە نەخشە کێشاوەتەوە ، بەلام ساکاری و سەرەتایێتی ی کەرەسەو هۆی نەخشەکێشان و نەبوونی توانای بلیمەتانە ، هەندێك سووك پیشاندان و سادەیی و گێڕانەوەگەری و خوتبە خوێنەریی داوە بە گەلێك بەرهەم و بەرهەمی باش کەم و کورتەو لە چەند چیرۆکی کورت و ناوەندیدا دەبینرێ و هێشتا ڕۆمان نووس خۆی نەگەیاندۆتە ئەم واقیعە .

ڕاستی پێوەندیی سادەی بەرهەم هێنانی تا چەند ساڵ لەمەوبەری کوردستان و لەناوئەچوونی تەواوی پێوەندیی دەربەگی تا ئێستا شێوەیەکی واقیعی لە ئەدەبیاتی کوردیدا ڕەنگی داوەتەوە ، بەمجۆرە وێنەی فەللاح بەسەر وێنەی کارگەرێ ڕابەری ئەودا زاڵبووە .

هەرچەندە چەکوشی کریکار لە دەرگای شیعرو چیرۆکی کوردیشی داوەو هەر لە کۆتایی جەنگی دووەمی جیهانەوە دەنگی کۆمۆنەیی لە شیعری کوردیدا بەرزبۆتەوەو بە سام و بە شکۆوە ڕۆڵی چینی کرێکاری لە ڕابەریی کۆمەلانی خەڵك و کۆڕی خەباتدا دەست نیشان کردووە . ئەو بڕیارانەی بەسەر پێوەندیی کارکردنی لادێدا دراوە ، ئەنجامە گشتی یەکانیان بەرەو شاریش دەبەن . ئەو بەرهەمە کەمانەی بۆ نەخشەکێشانی ژیانی چینی کرێکاری نەونەمام تەرخانکراون ، هەلوێستی هونەرمەندی سەر بە بیری کرێکاران و بەرژەوەندیی چینی کرێکار دەردەخەن . لەو بەرهەمانەدا شکۆدانی ڕێك و ڕەوان بە ڕەنج کێشان و تاوانبارکردنی نموونە خۆماڵی و جیهانی یە کانی کەرت و دەستە بۆرژوازی یەکان دیارن . هەرچەندە ئەدەبیاتێکی کرێکارانەی تەواومان نی یە ، بەلام بیری سۆشیالیستی لە هەموو ئەو بەرهەمانەدا کە بۆ ڕەنج کێشان و کارکردن تەرخانکراون دیارن .

لێرەدا دەتوانین دوو مەسەلە جیا بکەینەوە ، کە ئەوانیش هەڵوێستی بیرو توانای تێگەیشتنی تەواوی واقیع و بیرو جیاکردنەوەیانە لە بەرهەمێکی ئەدەبی ی وادا کە لەگەڵ هەڵوێستی خاوەن بیرەکە خۆیدا تەبابن .

لە ڕێی بەرهەمی ئەدەبی یەوە سەر بە بیرو ئایدیولۆژی بوون لە ئەدەبیاتی کوردیدا دەگمەن و ناجێگیرە ، هونەرمەند لە بەرهەمدا دژی هەڵوێست و بەرژەوەندیی چینی کریکار بێت ، شتێکی نەبینراوە .

ڕێك و ڕەوان دانەپاڵ ئەوچینە ڕابەرە تەواو ئاشکرایەو دەیان پریشکی ئەدەبی و پارچە شیعرو چیرۆك بەڵگەی ئەوەن ، هەروەك گرێدانی خەباتی چینی کرێکار بەبیری سۆشیالیستی یەوە ئاشکرایە . تەنانەت ڕێکو ڕەوان دەربڕینی ،

دەگاتە رادەی پەیدابوونی جۆرێکی تر لە ئەدەبیاتی دروشم دەربڕین ، کە لە سەرەتای سالانی چلەوە لە شیعرەوە دەستی پێکردووەو تائێستاش شوێنەواری دیارە . ڕۆشنی لەم مەسەلەیەدا لەوەدایە کەخەباتی چینی کرێکار خراوەتە چوار چێوەی جیهانی‌ی خۆیەوەو بەستراوە بە خەباتی شۆڕشگێرانەی جیهان‌و بنیاد نانی سۆشیالیزمی جیهانەوە .

2 ـ ئەگەر بەرهەمە ئەدەبی‌یە کوردی‌یەکانی سەدەی بیستەم دانێین‌و بەپێ‌ی باس‌و مەبەس خانەخانەیان کەین . دەبینین مەسەلەی نەتەوەیی کورد ، ئەگەر لەڕووی چۆنێتیشەوە پێشیان نەکەوێت لە ڕووی زۆری‌یەوە پێش هەمووان دەکەوێت . ئەمەش ڕەنگدانەوەی ئاسایی ڕاپەڕینی بزووتنەوەی نەتەوەیی کوردە کە لە کۆتایی سەدەی نۆزدەهەمەوە دەبینرێت . شاعیرو نووسەرانی کورد بەدەرەو کەلێنی ئەم بزووتنەوەیەدا دابەش بوون هەریەکە کەرتێکی فراوانی پڕ لە کەرەسەی تەسەلی لێ‌گرتووەو وێنەی کێشاوە .

مێژووی کورد بەگشتی کەرەسە بووە بۆ شیعرو بۆ چیرۆکی تازە بابەتیش هەر لە قارەمانێتی‌ی کۆنەوە تاگیانی هاوچەرخی بەخشین بەهەندێك ڕەگەزی میتۆلۆژی لە فۆلکلۆری کوردیدا تا ڕووداوی ڕۆژانەی ئەم خەباتە بەردەوامە ، هەموو ئەدەبیاتێکی لە ئاراستەو بیر کردنەوەدا یەکگرتووی دروست کردووە ، کەلەباس‌و بابەت‌و بۆچووندا جیایە ، زۆر گران نی‌یە کە تاقە باسێك ببینین ، چەند کەسێك بۆی چووبن‌و بیرو بۆچوونیان یەك بێت ، بەلام ئالەت‌و وێنەو دەربڕینیان جیا بێت . ئەمەش وای کردووە کە بەرهەمەکە چڕو بەپیت‌و فراوان بێت .

لەپلەی سەرەتاو پلەی کەلاوێژدا زیاتر باسی ژیانی خەلك دەکرا ، مەسەلەی نەتەوەیی کورد بەو چەشنە پڕ لە ئاوازەی لە شیعردا دەربڕراوە لەچیرۆکی ئەوسەردەمەدا دیار نی‌یە . ڕەنگە درەفەتی بلاوبوونەوە نەبوون هۆیەکی ئەم دیاردەیەبێت . هەرلەبەر ئەوەیە کە پاش 14 ی تەمووز ئەم باسە دێتە ناوەوە ، لەسەرەتادا زۆر بەهێمنی هەموو مەسەلەکە بەجۆری جیاواز لەکونجی مەسەلەیەکی بچووکەوە لە «سەرگول»ی مەدهۆش‌و «کفن‌و دفنی ناوێ» ی حەسەنی قزلجی‌و شای قەرەجەکانی محەڕەم محەمەد ئەمیندا خۆی دەردەخات‌و شتە بچووکەکە دەکرێت بە وێنەی گشتی واتە (تعمیم) دەکرێت‌و تائێستا ئەم نموونانە باشترین وێنەی ئەم مەبەسەن . بەلێ ... لەبەرهەمی محەمەد مەولودو دوکتور کاوس قەفتاندا چەند چیرۆکی سەر بەم مەسەلەیە دیارە ، بەلام هەر چەندە لەمەبەسەکانی تردا زۆر سەرکەوتوون ، لەم مەبەسەدا زۆر لە خۆکردنیان پێوە دیارە .

هەرلێرەدا دێمە سەر هەندێ چیرۆکی کۆمەلەی سیکۆلی ئەهریمەن‌ی کاکە مەم بۆتانی ، کە هەموو سەر بەم مەسەلەیەن بەلام دیسان تەکنیك بەزۆر دروست کردن هەلوێست دەربڕینی لەچیرۆك نووس سەندۆتەوە .

ئەگەر بۆیەکێك لە لووتکەکانی چیرۆکی ئەم سەردەمە بگەرێین ، ئەوا چیرۆکی پێشمەرگەی دوکتور رەحیمی قازی یە کێلە لەو لووتکانە . بێجگە لەناوەڕۆك ، بابەت‌و روخسارو دارشتن ، هەموو پێکەوە ئەو سیفەتە بەو چیرۆکە دەبەخشن .

چاوێکم بەو پێشەکی‌یە سادە ، پڕ لە دلسۆزی‌یەدا خشاندەوە ، کە 19 سال زیاتر لەمەوبەر بۆ چاپی ئەو چیرۆکەم نووسیبوو ، هەر ئێرەش دەرفەتی ئەوەیە کە دان بەو ساکاری‌و دلسۆزی‌یەدا بنێم‌و هیچ نەبێ لەو بڕیارە پەشیمان بم کە لە ڕووی زمانی ئەدەبی‌ی یەکگرتووەوە بەسەر چیرۆکەکەمدا داوە . بەلام بنەڕەتی ناوەڕۆکی پێشەکی‌یەکە ، وەك چیرۆکەکە خۆی تائێستا ڕاستی‌ی خۆیان دەسەلمێنن .

بەکورتی دەبێ چەند دێری تر بخەینە سەر ئەو پێشەکی‌یە . چیرۆکەکە باباسی کوردستانی ئێرانیش بێت ، بەلام وەك نووسەر خۆی بۆ گێڕامەوە ، یەکسەر لەژێر تەئسیری شۆڕشی چواردەی تەمووزی عیراقدا نووسراوە . ڕاپەڕینی گەلی عیراق‌و پەیدا بوونی دەرفەتی چاپ ، نووسەرو هەموو پەنگەوە خواردووی دەروونی‌ی لە یادگارو زانیاریی مێژوویی‌و هەست‌و لەخوێندنەوەوە پەیدا بووی توانای تەکنیکی‌ی چیرۆك نووسی‌ی هەژاندو ئەو چیرۆکەی لێ پەیدابوو بەداخەوە نووسەر پاش ئەوە کتێبێکی تر نەبێ لەسەر مێژووی کۆماری کوردستان یا

لەسەر شەخسی پێشەوا هیچی تری نەنووسیٚ .

ئەوسا ئەو چیرۆکەمان بە «پۆڤیست» دانابوو ، کە لەنێوان چیرۆك و رۆماندایەو سروشتێکی ریالیستی هەیە . لێرەدا دەتوانین ئەوەندەی لیٚ زیاد بکەین کە . ئەو چیرۆکە بابەتێکیشە لە چیرۆکی مێژوویی ، تێکەڵ کردنی گیانی مێژوویی یە لەگەڵ یەکێك لەو بابەتانەی ئەدەبدا کەڕووداوی مێژوو نەخشە دەکێشن .

چ لەبابەتە ئەدەبی یەکەیداو چ لەو تەجروبە مێژوویی یەدا کە خستبوویە بەردەم دەرسێك بوو ، بەگوێی نەکرا . دوایی دێمەوە سەر بابەت و دەرسی بەگویٚ نەکراوی ، بەلام کە ئەدەب و ڕەخنە لای ئێمە بەشی خەبات و ژیان بن ، دەبیٚ بە دەرسی ناوەڕۆکەکەدا بچینەوە .

چیرۆکەکە بەم چەند دێرە دوایی هات کە ووتی :

«پیرۆت و هەواڵەکانی جەنازەی کاك مامەندیان هێناوە دیٚ و زۆر بەحورمەت لە قەبرستانەکەی پشت ماڵان ناژتیان ... دوو ڕۆژ پاش ئەو بەسەر هاتە نۆکەرەکانی کە لەگەڵ قەرەنی ئاغا چوو بوون بۆ ڕاو بۆکانی سەوزە گەڕانەوەو ڕایانگەیاند ، کە قەرەنی ئاغاو سەرۆکی ژاندارم و ئەفسەرەکانی تر لە (کانی سەیدە) جل وبەرگی ژنانیان لەبەرکردو بۆلای تاران هەلاتن ... چیرۆك بەم دێڕانە دوایی هات .

لەپێشەکی یەکەشدا لە باسی ئەو وێنانەدا کە چیرۆك خستوویەتی یە ڕوو نووسرابوو :

«وێنەی ژیانی جوتیارانی کوردستان ، پێوەندیی نێوان فەللاح و دەرەبەگانی خائین ، دوژمنایەتیی دەرەبەگانی نۆکەر بەگەلی کوردو کوردایەتی و هەوڵدانیان بۆ خنکاندنی جمهوریەتە جوانەمەرگە لە دلا زیندووەکەی» .

لەپێشەکیشدا هەر ئەمە نووسرابوو . بەلام ئەوانەی بیریان تیژەو دڵ و ویژدانیان بینایە لەبیریانە کە یەکێك ڕاپەڕیو نووسی ی : «کەی کورد دەربەگی تێدایە ، کەی کێشەی چینایەتی لەناو کورددا هەیە ؟» .

ئەو دەرسەی چیرۆکەکە دەییەخشیٚ ، دەرسی پشت بەفەللاحی کوردو ڕووناك بیری شۆڕشگێڕەوە بەستن بوو ، دەرسی ئەوەبوو کە دەرەبەگی کوردو خوێندەواری سەر بەدەرەبەگی ، زەوی و پارەو کورسی لەکوێ بیٚ لەوێن و مێژووی سالانی دوایی ئەو دەرسەی باش سەلماندو ئێستا تەنانەت زۆر بەهەڵەدا چوو لەسەر ئەوەن کەجەماوەری خەڵك چەك و پشتی هەموو بزووتنەوەیەکی نەتەوەیی ڕاستەقینەن و ڕێگەی ئەوانیشس ڕێگەی نەهێشتنی چینە ڕەنج خۆرەکانە ، ڕێگەی پێشکەوتنخوازی یە ، ڕێگەی چەپ و هاوکاری گەلانە .

ڕێگەم بدەن لەبەردەوامی ی ئەو دەرسەدا کە بەگوێ نەکرا ، تاوێك لەباسەکە بچمە دەرەوەو بەو هاوارکەرە کۆنە بڵێم .. ئەوسا بەلای تۆوە کورد دەرەبەگی نەبوو ، چینی جیاوازی نەبوو ، خەباتی چینایەتی و پێشڕەویی زەحمەتکێشان لە خەباتدا ڕاست نەبوو لات ، ئەوسا دوژمنی کورد لای تۆ میللەتانی پێکەوە ژیاو بوون و کێشە لە ناو کوردو ئەو میللەتانەدا بوو . بەلام ئێستا دەنووسی : کورد مێژووو ڕابوردووو شارستانیتی ی نەبوو ، زمانەکەی بەکەڵکی ئەوە نەماوە ، تەعبیر لە دەروونی بدا ، کەواتە دەبیٚ یاس لە هیچ خسووسیەتێکی نەتەوەیی نەکەین ...

دیارە ئەم هەڵوێستەش تەواوکەری ئەوی پێشووەو یەك سەرچاوەی کۆنەپەرستانەیان هەیە ، هیچ پیٚ خۆش بوونی تێدانی یە کە پاش بیست ساڵ بڵێین ، ئۆباڵی هەموو ئەو کارەساتانەی کۆنەپەرستی کورد بەسەریاندا هێناین بەئەستۆی ئەو چەشنە کەسەو بابەتەکانی . کەوا ووردە ووردە ئەوەش لە هەموولا دەسەلمێنێت کە کورد بۆ تواندنەوە پەیدا نەبووەو چ لە وولاتی ئێمە (لە عیراقدا) و چ لە وولاتە دراوسیٚ یەکاندا وا دان بە بوون و خسووسیەتی نەتەوەییدا دەنریٚ ، ئەوسا وەباڵی ئەو هەموو دووبەرەکی نانەوەو ئەو هەوڵی بە فیڕۆبۆلەناودانی ئەو خسووسیەتە نەتەوەیی یەی درا دەکەوێتە ئەستۆی کیٚ ؟ .

نووسەرێك کە خۆی بەکورد دانابێت . دەبیٚ ئەم جارە چی بڵێت ؟ وابزانم بیست ساڵی تری ناویٚ ، تا بار بگۆڕێت ، با کۆنەپەرستی کورد بێدەنگ بن . قەڵەم و سەربەستیش دەبیٚ هەر بۆ ئەوانە بێت کە سەر بەمیللەتن . سەر بەبرایەتی یەکن کە لەسەر بناغەی ماف و ئەرکی هاوسان دامەزرابێت .

زۆر لە ڕووداوەکانی پاش ساڵی 1961 تاکەو بەکۆمەڵ هاتۆنەتە ناوچیرۆکی کوردی یەوە . دوولایەنی ئەو ڕووداوانە لە چیرۆکی کوردیدا خۆی نوواندوە . لایەنی سیلبی و هەڵەو چەوتی . ڕەنگە شانازیش بێت کە ئەوانەی لایەنی سیلبی یان گرتووە ، خۆیان لەناو جەرگەی کاردا بوون و ئەمەش بە جۆرێك

لەڕەخنە لەخۆ گرتن دادەنرێت . دیارترین چیرۆکی ئەم بابەتە «هەنگاوێك بە ڕێگای دووڕا»ی ڕەووف بێگەردە .

دەبێ ئەوەش بڵێین کە دیمەنی ڕەش بینی «تشاؤم» لەم چیرۆکانەدا هەر ئـەنجامی هـەرەس هێنانی کـۆششی خەڵك و چەند ساڵە نی یە . چـونکە زۆر لەو ڕەش بینـانە لەنـاو کوڕی ڕووداودا ڕەش بین بوون . بەلام لەبەر ئـەوەبوو کـە کێشەی ڕاستەقینەیان نەدەدی ، پێوەندیی کۆمەلایەتی ناو کۆمەڵیـان نەدەدی ، زنجیرەی ئەو خەباتەیان نەدەدی کە خۆیان بەپاکی و ڕاستگۆیی یەوە چوو بوونە مەیدانی یەوە ، چاویان لەوە نەبوو کە پاش سەرکەوتن ، دەبێ چ گۆڕینێك بەسەر کـوردەواریدا بێت . تا بتوانن جێگەی خۆیان و هۆی ڕەش بینی دیاری بکەن .

ڕەنگـە مانـەوەی پێوەنـدیی دەرەبـەگی ، دەسـەلاتی دەرەبەگی (لە هەموولا) هۆی ئەم ڕەش بینی و ڕەخنانـە بن و ئەمەش لەجێ یە . بەلام کە تەوژم و سووتەمەنیی ڕووداو هەر فەللاح بووبێ ، ئەو ناکۆکیی قووڵی دەردەکـەوێت و هەرەس هێنان دەست پێ دەکات . لەم بارەیەوە ووتراوە :

لە کۆمەڵێکدا کە خەریکی هەرەس هێنان بێت ، هونەری ڕاستگو ئەو هەرەس هێنانە پیشاندەدات ، بەلام ئەگەر هونەر سووربێت لەسەر ئەوەی ئەرکی کۆمەلایـەتی ی خۆی بـەجێ بێنێ . دەبێ ئەوە دەرخات کە جیهان توانای گۆڕینی هەیـە و دەبێ یارمەتیی ئەو گۆڕینە بدات .

دەتوانین بڵێین «ژانی گەل» ی بلە گەورەترین بەرهەمی نوێنەری ئەوڕووداوانەیە . دیارە لێکۆڵینەوەی ئـەم چیرۆکـە خۆی باسێکی تایبەتی دەوێ هەڵبژاردنی هەڵوێست و قارەمان ، پێوەندیی بە هەلوێستی نووسەرەوە هەیە ، کە لێرەدا موناقەشە ناکرێت : بەلام سیمای گەورەی چیرۆکەکە نیشاندانی بەشێکی ڕتووش کراوە لەواقیعی ڕۆژانەی ئەوسا .

لایەنێکی تری ئەو ڕووداوانە ، دیمەنی کارەسات و ماڵ وێرانیی خەڵکە ، لە زۆر چیرۆکدا وێنەو دیمەنی ئەم کارەساتە نەخشە کێشـراوە ڕەنگی ڕەش و دووکەلاویی بـۆ چوتـە سەر کاغەز . لە «ئەسپ» و «دەستی ئۆخەی» ی ئەحمەد محەمـەد ئیسماعیل و هەندێ چیرۆکی عەبدوللا عەزیز خالیددا ئەم وێنەیە دەبینین . «ڕووی کردەوە شاخ» و «چالی جـەرگی پیرێـژن»ی حسێن عارف ، لە باری سەرنجی خۆیەوە چیرۆکی دیاری ئەو کاتەن .

بەلام لێرەشدا ، لەم باسەشدا ، هەربەناوی تەکنیك و هاوچەرخێتی یەوە ، کیشەی ناڕاست و ناواقیعی دروستکراوە . بۆ نموونـە کاکـە مەم بـوتانی لە چیـرۆکی «گولێکی پێ شێـل کراو ».. دا بیرێکی تازە دێنێتە کایەوە ، بەزمانی فـەللاحەوە سەر سوڕمان دەردەبڕێ :

«بۆمبا هاوێژ لە شارەوە دێن ، هەرچەندە ـ مـامۆستـا عەول ـ ش خەڵکی شارە ؟» .

هەموومان لەم وولاتەدا ژیاوین ، زوربەمان ماوەیـەکی ئەو ساڵانە لەناو فەللاحدا بووین ، کەی ساکارترین فەللاحی کوردیش وای بیر کردۆتەوە ، یا شار پێویستی بەم پـاکانـەیە هەبوو بێت .

کێشەی شارو دێهات و هەر ئەم دوو ڕەمزە لە ئەدەبیاتی جیهاندا هەیە بەلام جۆرە نا .

هەر لێرەشدا دەبێ لە چیرۆك نووسەکانمان بپرسین ، لە نـاو ڕووداوی چـڕی هەمـە ڕەنگەی ئـەم ساڵانـەدا کـوا بـەشی ئازایەتی و قارەمانی ؟

هیچ نموونـەی گەورەو دیـاری ئەوەمـان لەبەردەمـدا نی یە . لەبەرهەمی ئەم سەردەمە]دا ، لە پاڵ گەلێك مەسەلەی گشتیدا زۆر شتی تایبەتی هاتە کایەوە . واتە ئەو ئینسانـەی لەچیـرۆکی پلەکانی تـردا هەمیشـە « قارەمـان » و وێنـەی مەسەلەیـەکی گشتی بوو ، لێـرەدا ، لە زۆر چیرۆکـدا وەك گەردێکی بچووك دەخرێتە ژێر میکرۆسکۆبی چیرۆکنووسەوە . لە زۆر چیـرۆکدا « مـەنەلۆژ » دەبێتـە ئەو میکـرۆسکۆبـەی پەنگەوە خواردووی ناو دەروونی مرۆڤ دەردەخا .

زۆر هەستی ڕۆژانە ، زۆر دیمەنی ئینسانیی تـایبەتی دێتە کایەوە . نمونەش زۆرە . بابڵێین کاکە مەم بوتانی لە (تانەو ئـارەزوو) دا هـەستێکی ئینسـانی و ڕووداوێکی ئینسـان دەردەبڕێ . ئینســان لەوێدا نامرێ و بەرەی تازە جێی کۆن دەگرێتەوەو باوك دەکوژرێ کوڕ لەجێیەتی .

حسێن عارف وەستای ئەم مەسەلەیەیە . گەلێك (تاڵ) لە ناو دەروونی تاقە ئینسانـەوە دەردەهێنێ و دەیکات بـەوێنە : بەلام سووربوون لەسەر زاڵ بوونی ڕوخسار و بـەکارهێنـانی تەکنیکی تازەتر ، زۆر جار مرۆڤەکە ون دەکات و سـەرەتای شێواندنی ڕوخسـاری مرۆڤی خـۆماڵی دادەمـەزرێنێت . ئەو دەزانێ چی دەکاو هەموو پردەکانی نێوان خـۆی و ڕیالیـزمی

ئەرووخاندووەو ڕێگەی گەرانەوەی هێشتوتەوە . بەلام پاش ئەو ، لەزۆر چیرۆکدا زۆر ناوەستایانە جێی (بێ ڕەنگ) بۆ مەنەلۆژو دیالۆگو فلاش باكو كات و مەودا (بعد) فڕێ دەدرێتە چیرۆکەوەو هەندێکیش نەواو پشت دەکەنە مرۆڤی کوردو مێژووی وولاتو بەناوی هونەرەوە (خسر الدنیا والاخرة) ئەفرەت لەهەمووی دەکەن و ناشبنە هونەرمەندو نموونەشتان بوویت ئاسانە .

* * *

کەواتە تەوژمی مۆدێرنیزمی ئەورووپا لەڕێی بە عەرەبی خوێندنەوەوە هاتوونەتە ناو بەرهەمی چیرۆکنووسی کوردەوە ، بەلام بەناوی تەکنیك و هاوچەرخێتی و تازەگەری یەوە . بەلام ئەم تەوژمانە خۆیان لە بناغەی کۆمەلایەتیدا لەواقیعی کوردو عیراق دوورن و توانای ژیان و مانەوەو پەرەسەندنیان نی یە .

زۆر تری تەئسیری ئەم قوتابخانەو تەوژمو ڕێبازانە لەلای لابەلاوە هاتوونەتە ناو هەندێ کۆمەلە چیرۆکی واوە کە ناتوانین لەخانەی دوور لەمیللەتدا دایان نێین .

دەتوانین لێرەدا سەرنجێك لەم ڕێبازانە بدەین و سروشتی گشتیان دەرخەین و ئەوسا تێ بگەین پێوەندی یان بەکۆمەلی کوردەواری و بەچیرۆکی کوردی یەوە چەندە .

**هونەر بۆ هونەرە :**

ڕاستەو ڕەوان ئەم دروشمە هەلنەگیراوە ، بەلام ئەو هەموو باسکردنی ڕادەی هونەری و هێرشە بۆ سەر شێوەی کۆن و لادانی زۆر چیرۆك نووس لەڕێرەوی ئاسایی و شێوەی دابرین گرتن هەر ئەوە دەگەیەنێ ..

ئەم ڕێبازە واتە « L'art pour l' art » ، سەر بە ڕێبازی ڕۆمانتیکی یە یا لەوەو لەجیهانی پاش شۆرشگێرێتی ی بورژوازیەتدا پەیدا بوو ، بەلام ئەگەر بۆدلێرێك كە لە ناخیدا ڕیالیست بوو ڕێی بردبێتە بەر ئەم دروشمە هەر لەبەر نارەزایی بووە لەسەر ئاوەکێتی و شێوەی بازر کانێتی ی ئەدەبیاتی بۆرژوازیی و بۆ ئەوەبووە كە لە جیهانێکدا كە هەموو شت بۆتە کەرەسەی فرۆشتن ، هونەرمەندیش ئەوکەرەسە دروست کەرە نەبێت . فیشەرو ووتەنی : ـ ئالای جوانی پەرستی ی پیرۆزی بۆدلێر بەرامبەر بەو جیهانە بۆرژوازی یە هەلبررا كە بەواقیعی خۆی ڕازی بوو ئەو واقیعەی بەوێنەیەکی پیرۆزو دامرکێنەرەوەیەکی هەرزان دەزانی ، بەلام شیعری بۆدلێر دیوێکی گەورەی مەرمە ڕبوو ئەو خوایە بوو کە سەرەنجامی بەدەست بوو ، فریشتەیەکی تووڕە بوو شمشێرێکی ئاگرینی بەدەستەوە بووە پەردەی هەلدەمالی و نەفرەتی لەچارەی نگریس و بێ نرخ و نائینسانی ئەو جیهانە دەکرد . هەژاریی پەردە بەسەردا دراوە ، نەخۆشی ی شارراوە ، بەدزی یەوە داوێن پیسی ، ئەمانە هەموو لەبەردەمی جوانیدا ئاشکرا دەکران ، هەروەك شارستانێتی ی سەرمایەداری لەبەردەمی دادگایەکی شۆرشگێردا وەستابێت : جوانی بڕیاری دادوەری خۆی بەچەند دێرێکی پۆلایین بەسەریاندا بدا . »

ئەمەلایەنی سەرەتایی ئەورێبازە بوو کە دوای بۆدلێر بووە هۆی لەژیان ڕاکردن ، بووە هۆی دوور خستنەوەی ئەدەبیات لەکۆڕی ژیان و چەکی ئەدەبیات لە دەست خەلك سەندنەوەو لەچالی کپی و دووریدا ناشتنی . شاعیرێکی کورد ووتوویەتی

من و یارم لەکونجێ دابنیشین
بە من چی عالەمێ ژێرەو زەبەربێ

جا بێینە سەر هەر دوولایەنی ئەم ڕێبازەو هەندێك چیرۆکی ئەم سەردەمەو هەندێك تال و پارچەی ئەو چیرۆکانە .

چیرۆك نووس هەقی هەیەو ئەبێ هەموو دیمەنی ڕەشی و ناخۆشی و ناکۆکی و دواکەوتوویی کۆمەل ببینێ .. دەتوانێ یاخی بێ و دەبێ شۆرشگێر بێ و بەسەر هەموو ئەو دیمەنانەدا هەلبچێ . بەلام بۆچ بەسەر ئەدەبیاتی ئەو کۆمەلەدا هەلدەچێ ؟ کوا ئەو ئەدەبیاتەی پارێزەری ئەو لایەنە پەستەی کۆمەل بووە ؟ کوان ئەو چیرۆکانەی لەسەر نەخۆشی و برسیتی و دەرەبەگیان کردوتەوە ، تا ئێمە بەناوی جوانی یەوە بەسەریاندا هەلچین و ڕایانمالین و پەردەیان لەسەر لادەین .

نووسینی کۆنەپەرستانەو سەر بە دەرەبەگی و سەرمایەداریمان هەیە ، بەلام زۆرکەم و هیچیشیان نەگەیشتوونەتە هیچ پلەیەکی هونەرمەندانە . تەنانەت لەمەیدانی هونەر دوورن و زۆریان لەو قسەو چەنەبازی یانەن کە ناچنە ناو گیرفانەوە .

وابزانم ئەو چیرۆك نووسانەش كە بەناوی هونەرو تەکنیکی تازەوە لەڕێچکەیان لاداوە ، هیچیان بەسەر ئەوانەدا هەلنەچوون . ئەو چیرۆکی کوردی یەی لایەنی کزیێ تەکنیك ، یا بەرەوپێش نەچوونی هونەری چیرۆکی تێدا بەدی کراوە .

زوربەی زادەی کۆمەڵی کوردەواری بووە ، زۆر لایەنی ژیانی ڕەنگی تێدا داوەتەوە . پلەی هونەریشی بۆ ڕۆژی خۆی لەپلەی تێگەیشتن و پەیام گەیاندنی ئەدەبەکە بووە . چارەسەرکردنی بەقووڵ بوونەوەو دەسەلات بەسەر تەکنیکی چیرۆکی جیهانی پەیدا کردنداو خوێندنەوەو خۆ بەرەو پێش بردن و تێکەڵ کردنی ئەم دەستکەوتە تازەیەیە لەگەڵ ژیانی تازەی کۆمەڵ خۆیدا ، بەکار هێنانێتی بۆ بینینی هێڵی لێکدان و بەرەو پێش ڕۆیشتنی ناکۆکی یەکانی کۆمەڵ و ئاسۆی دوا ڕۆژە ، تێکەڵ کردنی تەکنیکی تازەیە لەگەڵ بناغەی پڕشکۆی چیرۆکی پێشووی کوردیدا .

ئیمپرسیونیزم ـ انطباعیەت ـ جۆرە یاخی بوون و هێرشێکە کە چەند کەسی بلیمەت ڕابەری بوون بەرامبەر بەو لەخۆ بایی بوون و ئیدعا کردنە وەستان کە لەهونەری ڕەسمی ئەکادیمیدا دیار بوو . ئەمە یان زۆرتر مەیدانی ڕەسمی گرتەوە باری ئایدیۆلۆژیی ئەمانە لەگەڵ ئیمپرسیونیزم ـ وضعیەت ـ ی فەلسەفەدا یەکی گرتەوە ، کە ئەویش جیهان بە تەجروبەیەکی « تایبەتی ـ خاس » و بەهەستێکی تایبەتی دەزانێ و بەواقیعێکی مەوزووعی ئەوتۆی نازانێ کە جیاواز لە هەستی تاقە کەس هەبن . یاخی بوونی ئەم ڕێبازە هەر لەبەر ئەوەیە کار ناکات چونکە ، ئەو تاقە کەسێتی یە پڕە لەگومان و ناتێکۆشەری و ووزە بەرداوی و هونەرمەند زۆر لەوە دوورە کە بیەوێ جیهان بگۆڕێت و فیشەر ووتەنی : تنۆکی خوێن ، لای ئەو هەر ڕەنگە و بەس و بەیداغی سوورو گوڵاڵە سوورەیەك لای ئەو هەر یەك شت دەگەیەنن .

وابزانم هەندێك نموونەی بچووکی ئەم چەند ڕایەش لای ئێمە دیارە . « با کەمیش بێت » ئەگەر هونەرمەندی ئەورووپا هێندەی بەرهەمی ئەکادیمی ڕەسمی دیبێت ـ بەتایبەتی لە ڕەسمدا ـ تاڵێی وەرس بووبێت و لێی یاخی بێت ، یاهونەرە ئەکادیمیەکە خۆی هێندەی بەرهەم دابێت کە نوێنەرانی خستبێتە فش و هوورو لەخۆبایی بوون . ئایا ئێمە کام بەرهەمی ئەکادیمیمان گەیشتۆتە ئەو پلەیە . کەی هێندە چیرۆکی بابەت ئەکادیمی نووسرا تاڵێی وەرس بین و یاخی بین .

بەلێ .. دەڵێن بەسە « سەرەتاو گرێ و کردنەوەی کۆتایی » بەسەکیرانەوەو دواندن و کاتی « فلاش باك و مەنەلۆژ » و تەکنیکی ترماتووە ، یا کاتی ئەوانیش بەسەر چووە . دیارەکەس دەستخستن و بەکارهێنانی تەکنیکی تازەی پێ خراپ نی یە ، بەلام دیسان دەبێ ئەم تەکنیکە بچێتە سەرسامانی ڕابوردوومان و وێنەی دابڕین نەبێت . هێشتاله « ڕۆنە زونگەکەی حەمەسەن » و « ژانی گەل » و چیرۆکەکەی دکتۆر ڕەحیمی قازی و « چای شیرین » و « چەندم لێ دەسێنی » و « نامەی سەر سنوور » و گەلێکی تر وەرس نین ، تا لێیان داببڕێین و وەڕس بین و هێرشیان بەرینە سەر .

جان جاك ڕۆسۆ بیری « ئەلینەیشن اغتراب ـ استلاب ـ ی هێنایە ناوەوە لای ئەو مەفهومێکی تایبەتی هەبوو بەلام هیگل و مارکسی لاو ئەم بیرەیان لە مەیدانی فەلسەفەدا بەرەو پێش برد . ئادەمیزاد کە بەهۆی ئیش و بەرهەمەوە لە سروشت جیابۆوە ، ئەوا « جیابوونەوە ـ اغتراب » دەست پێ دەکات وەك دەڵێ : «ئادەمیزاد هەر ئەوە نی یە بە شێوەیەکی زیهنی بەهۆی ئیشی خۆیەوە خۆی گەورەتر بکات ، وەك لەباری « هوشیاری » دا دەبینرێ بەڵکو بەگورج و گۆڵی و بەکردار خۆی گەورەتر دەکات بەم جۆرە لە جیهانێکدا کە بەرهەمی خۆیەتی لەخۆی وورد دەبێتەوە » . ئەم چەشنە « جیا بوونەوەیە » شتێکی ئاسایی ڕژێمی سەرمایەداری و کاتی دوور کەوتنەوەیە لە کۆمەڵی سەرەتایی و ئابووریی سروشتی ، کە لەم دەورەیاندا پێوەندیی نێوان خاوەن زەوی و فەللاح و کرێکارو پیشەساز .... هتد پێوەندی شەخسی یە . بەلام کە کۆمەڵ بەرەو پێش ڕۆیشت ، «کەرەسە ، نرخ ، فرۆشتن » جێی هەموو شت دەگرێتەوە . دەربارەی جیا بوونەوەو شوێنی تایبەتی (کافکاو برێخت) زۆر شت دەووترێت . بەلام ئایا چیرۆکی ئێمە ، بۆ ئێستا لە سەردەمی ڕابوردوودا بزووتنەوەی کۆمەڵی دۆزیوەتەوەو توماری کردووە یانا ؟ کە پێوەندی خێڵەکی لەڕووخاندا بوو ، شار لە ژیانی لادێدا ڕۆڵی پەیدا دەکرد . شتێکی تایبەتی تازە لە پێوەندی ئاغاو فەللاح و چەرچی و سووخۆرو پۆلیس پەیدا دەبوو . لەشێوەیەکی ساکاریشدا بێت هەندێك نموونە هاتەکایەوە : بچینەوە سەر عەلادین سەجادی و بلەو چیرۆکەکانی محەمەد سالح سەعیدو هەندێکی جەمال بابان ، دەنگی حەسەنی قزلجی . ئەمانە لایەنێکی ئەو گۆڕینەیان پیشان داوە . گۆڕینەکە لەوەی ئەورووپاو ڕێکاو ڕێك لە پەیدابوونی سەرمایەداری و پیشەسازی و ڕوخاندنی قەلای

دەرەبەگ ناچێت . بەڵام ئەم گۆڕانە .
شتێك كە لەوێو لێرە لەهەموو ساڵانی پەیدابوونی چیرۆكدا دەچێتە خانەی Alienation (جیاوازی یەوە) ئەوە (بیروكراتیزم) ە ئەمە ڕەگەزێكی بنەڕەتی جیابوونەوەی ئادەمیزادە لە كۆمەڵ ، بیرۆكراتی پێوەندیی ئینسانی بە كۆمەڵەوە نامێنی ، هەر لەوەدیو مێزەوەو بەزمانی « فایل و ... كتاب » قسـە دەكات .. ئـادەمیزاد لای ئەو دەبێتە فایلێكی مردوو و ژمارەی خـۆی هەیـە تـەنانـەت كە ئـادەمیزادێكیش دەهێنـرێتە بـەردەممان هـەر بەشەخس ناو نابرێ ، بەمەسەلەی ناو فایلەكەی ناو دەبرێ .
« مدیر بەگ » ی شاكیر فەتاح نموونەیەكی ئەمەبـوو ، بەڵام وێنەی تری ئەم « جیابوونەوە » یە پیشان نەدرا . لەشعیردا جێی خۆی هەیە . هەندێك چیرۆك بۆنی ئـەوەی لێدێ وەك « فرمانێكی بچووك » ی كاوس قەفتان . بەڵام هەندێ چیرۆكی پاش حەفتامان كە دەبوو باش لەم بابەتە ئەوروپاییەیە بگات ، هـاتـووە ئـادەمیـزادی لە كـۆمـەڵ جیـا كـردوۆتــەوە ، لەو بزووتنەوەیەی مێژووی دابڕیوە كە دەبێ خۆی دروست كەری بێ .

دەبێ لەڕەوتی پیشەسازی وولاتی خۆمان بگەین . چینی كرێكاری ئێمە لەژێر سایەو بەیداخی سەرمایەداریدا لەدایك نەبووەو ڕەنجی بۆ ئەوەنی یە .

سەرەتا كرێكاری نەوتو « ڕێگەی ئاسن » مان هەبوو ئێستاش وا دووكەڵكێشی كارگەكانی سلێمانیو هـەولێر جۆرە پێوەندییەكی تر لەنێوان كرێكارو دەوڵەتو نەقابەدا دروست دەكەن سەرمـایـەدار لێرە جێی نیـیە . دەبێ لەم جۆرە پێوەندییەو لەم خۆبەستنە (ئالەت) ەوە بگەین . كە دیسان لەپێوەندی وولاتی ترجیایە .

ئەگەر جیا بوونەوەك لای ئادەمیزادی سەردەمی ئێمـە هەبێ دیسان لەوەی ئەوروپا جیایە .

دەتوانین لە تەجروبە ئەوروپاییەكەوە ، پەردە لە ڕووی بیـروكـراتیـزم دامـالین . بیـروكـراتیـزم دەوڵەت لە خـەڵك جیادەكاتەوە ، با پێوەندیی بەرهەمو بازارو كرینو فرۆشتنیش لەوەی سەرمایەدارییە ڕادیكالییەكە جیاوازبێت .

دەتـوانـرێ هـەنـدێـك شت دەربـارەی نـەهیلیـزم « عەدەمیەت » و نیتشـەو هەمـوو ئەو ڕێبـازەش بووترێ . نمـوونـەش لەم ووردە چیـرۆكـانـەی ئـێستـادا بـوون « deshumansation » دیس هیومانیزەیشن . واتە ئینسـانێتی لە ئینسان دامالین دەدۆزرێتەوە . لای ئەم ڕێبازە بۆرژوازییـە سووكە ، لەم جیهانەدا كە هەر كەرەسە نرخی هەیە . ئینسان كەرەسەیەكە لەو كەرەسانەو لەڕەوالەتدا لەوان بێ دەسەلات ترو بێ نرخترو سووكو سەلیم ترە . لێرەدا ئەو سـروشتی « فتیشی ـ یابوون بەبتی كەرەسە » یە ئینسانیش دەگرێتەوە . بـەڵام لەنـاو بـوونی گـەلێـك دیمـەنی بـەڵگـەدەری ئـەم كەرەسەگـەرییەدا ، لای ڕیـالیستان ئـادەمیزاد لە هـەموو سەرمایەیەك بەنرخترەو نابێ بەسەرمایە .

ئەوەی بەهـەنـدێـك چیرۆكی ئـەم دواییەوە دیـارە دیمەنی ڕێبـازێكی تـری بـۆرژوازیی ئـەوروپـایـە ـ كـە mysification « میسیفیكـەشن » ە ـ كەتـەواو (كوێـركردن) دەگـرێتەوە . ئەمەش بریتییە لەدروست كردنی تونێكڵو بەرگێكی تەماوی بۆ ژیانو واقیع .

ئەمەش هەرئەنجامی ئەوەیە كە سـەرمایـەداری ئادەمیـزاد لەكـۆمەڵ جیـا دەكاتـەوە . لەم ڕێبازەدا پـەنا دەبـرێتە بـەر ئەفسانە . بەكـارهێنانی كـلاسیكی ئەفسـانە ، هـەر شتێكی ڕوخسارگەرییە ، كە لەم ڕێبازەدا دەبێتە هۆی دووركەوتنەوە لەبـڕیاری كـۆمەڵایـەتی دان .... بۆ ئـەوەی « كـەسێـك لە چیرۆكدا .... دروست كرێت كەپێوەندیی بەكات ، بە (زەمان) ەوە نەبێت ، سەر بەهیچ شتێك نەبێت ، گوێ نەداتە هیچ . وەك (كـولن ویلسن) دەڵێت بـەڵام بـەكـارهێنـانی ڕاستـەقینـەی « ئەفسانە » ئەوەیە كە ڕەگەزی پاكێتیو بەژیانو سروشتەوە لكاویی تێدا بدۆزرێتەوەو سەر لەنوێ دابڕێژرێتەوە .

زۆرجار هەموو ئەم ڕێبازانە هۆی ئەوەن ، یابیانـووی لەژیان دوور كەوتنەوەن .

* * *

ئـەمانـە كۆمـەڵێك تێبینیو جـۆرە بەراوردێكن لەنێـوان ئـەو ڕێبازانەو واقیعی چیرۆكی كوردیمانو ئەو ڕاستییـەمان بـۆ دەردەخەن كە مۆدێرنیزم هەر لەڕێی ڕوخسارو تەكنیكەوە تووڵە ڕێیـەكی بەرەو چیـرۆكی كـوردی دۆزیـوەتـەوەو ئـەوەش لەئەنجامدا ئەكەوێتە خزمەتی ناوەڕۆكی چیرۆكی كوردی كە تا ئێستا بەگشتی سەر بەگەلوزەویو ئینسانەو پێوەندیی چیرۆك نووسی كورد هەر بە گەلەوەیەو بۆ ئەو ئەنووسێو هەر دێتەوە سەر ڕێبازی خزمەتی ئەو .

# پەراوێز

(1) لەپێشەکی ووتارەکەی (الاقلام) دا نووسیبووشم : ... لەبەرئەوەی ئەو باسە (واتە ئەم باسە کوردی‌یە) دەربارەی ناوەڕۆك بوو ، لەبەر ئەوە دەبینین بایەخی زۆرم بەناوەڕۆك داوەو زۆر کەم لام داوەبەلای بابەت‌و ڕوخساردا دیارە ئەمە هەر لەبەر ئەوە نی‌یە کە من ناوەڕۆك بەجەوهەرو بناغە دەزانم‌و (ئەمە باوەڕمە) ە بەڵکو لەبەر ئەوەشە کە (حسین عارف) ی دۆستم ئاگاداری ئەوەی کردم کەدەستی داوەتە باسێك بۆ ئەو ژمارەیە خۆی‌و لەوێدا لەڕوخسارو تەکنیکی چیرۆکی کوردی دەدوێت ، لەبەر ئەمەئەرکی دواکەوتنی ووردی کە لایەنەکانی ئەو مەسەلەیەی لەکۆڵ کردمەوە . هیوام وایە ئەو ئەو لایەنانە تەواو بکات کە من گوێم نەداونەتێ . هەرچەندە هەست بەوەدەکەم تۆزێك دووری لە بایەخدان بەناوەڕۆك‌و ڕوخسار (بەدیاردە ـ ظاهـرە ، یا ، عرض ) یك زانین کە دەبێ خزمەتی ناوەڕۆك بکات ، لە نێوانماندا هەیە .

(2) مەبەس شاری سلێمانی‌یە کە ساڵی 1784 دامەزراوە .

(3) نالی دەڵێ :

فارس‌و کوردو عەرەب هەرسێم بەدەفتەر گرتووە

نالی ئەمڕۆ حاکمی سێ موڵکە دیوانی هەیە

(بڕوانە : دیوانی نالی بەغدا ، 1931 . ل 55)

(4) مەلای جزیری دەڵێ :

گوڵی باغی ئیرەمی بۆتانم

شەب چراغی شەبی کوردستانم

(بڕوانە : دیوان الشیخ الجزری . دار الکتاب بمصر ؟ ص 187)

(5) — نووسەر محەمەدی مەلا کەریم تێکستێکی پەخشانی مەولانا خالیدی نەقشبەندی بڵاو کردەوەو ئەوەی بەکۆنترین تێکستی پەخشانی کوردی دانا (بڕوانە : محەمەدی مەلا کەریم . عەقیدەی کوردی مەولانا خالیدی نەقشبەندی . گۆڤاری مەجمەعی عیلمی‌ی عیراقی ژمارە 8 بەغدا 1981) لە دەرفەتێکی تردا باس لەم تێکستەدەکەم . (تێبینی : ئەم پەراوێزە بۆ ووتارە عەرەبی یەکە نووسراوە . )

(6) بڕوانە : الدکتور عز الدین مصطفی رسول . الواقعیة في الأدب الکردي . بیروت 1966 ص ، 205، 206 .

(7) ئەم چیرۆکە یەکەمجار لەساڵانی 1925 , 1926 دا لە ڕۆژنامەکاندا بڵاوکراوەتەوەو بەیەکەم چیرۆکی هونەی کوردی دادەنرا ، بەڵام کە وێنەی ژمارەکانی (ڕۆژی کورد) ی 1913 سەر لەنوێ ساڵی 1981 بە ئۆفسێت بڵاوکرایەوە . ئەوە دەرکەوت کە لە پێش (لەخەوما) لەو گۆڤارەدا چیرۆکێك بە ناوی ، فوئاد تەمۆ ، وە هەیە . ئەمە مونـاقەشـەیەکی لەنێوان کۆمەڵێك نووسەردا دروست کرد .

(تێبینی : ئەمەش هەرپەراوێزی ووتارە عەرەبی‌یەکەیە ) .

(8) دیوانی ئەحمەد حەمدی بەگ صاحبقران . بەغدا 1957 ل 147 .

(9) زمان‌و ئەدەبی کوردی . بۆپۆلی پێنجەمی ئامادەیی (لەگەڵ چەند دانەری تردا) ج . بەغدا ، 1976 . ل 122 , 123 .

(10) بڕوانە سەر چاوەی پێشوو ل 123 , 124 . (تێبینی : بەشی ئەدەب لەکتێبی هەر شەش‌پۆلەکەی ناوەندی‌و ئامادەییدا بەپێی سپاردنی ئەندامانی لیژنە ، بەنووسەری ئەم ووتارە سپێررابوو ) .

(11) حسین عارف چیرۆکی هونەری کوردی (1925 — 1960) بەغدا ، 1977 ل 40 .

(12) ئەو سەرچاوەیە ل 42 .

(13) ئەو سەر چاوەیە ل 43 .

(14) ئەو سەرچاوەیە . (تێبینی : ڕەنگە هەر چیرۆکەکانی پیرەمێرد بەم چەشنە بن ، چونکە شیعرەکانی چوونەتە کۆڕی سیاسەتەوە (ع . م . ر) .

(15) ئەو سەرچاوەیە . ل (45) .

(16) ئەو سەرچاوەیە .

(17) ئەو سەرچاوەیە ل (77) .

(18) لە گۆڤاری هاواردا چەند چیرۆك بڵاوکراوەتەوە . جەلادەت بەدرخان خۆی چیرۆکی لەبابەتی نووسینەکانی حوزنی نووسیوە . هەروەك لەکاتی دانانی کتێبی قوتابخانەشدا چیرۆکێکی نورەدین زازام لەهاوارەوە بەناوی (خورشید) ەوە وەرگرت . هەرچی چیرۆك و ڕۆمانەکانی عەرەبی شەمۆو عەلیی عەبدورەحمان‌و ئەوانی تری ئەو مەڵبەندەیە ئەوەش دیارن .

(19) مەبەستم ئەو چیرۆکانەیە کە کورد بەزمانی تر نووسیوونی . لێرەدا دەبێ ناوی یەشار کەمال‌و عەبدولمەجید لوتفی‌و محێدین زەنگەنە ببەین .

(20) لێرەدا باس لە چیرۆکی هونەری ، یاپەخشان دەکرێت‌و ئەگەر ئەم بابەتە بشبرێتەوە سەر ڕەگ‌و بنچینەی خۆی ئەوە دەبرێتەوە سەر حیکایەتی فولکلۆری (واتە ـ سەرپەخشان) ـ هەرچی داستان‌و چیرۆکی شیعری‌یە ، ئەوە ڕەگ‌و سەرچاوەی شیعری کوردی‌یە ، باسێبەری جوانیشی بەسەر پەخشان‌و چیرۆکی کوردیدا کشاندبێت .

(21) الواقعیة في الأدب الکردي . ص 124 .

(22) عەلادین سوجادی . گۆڤاری گەلاوێژ . بەغدا . مارتی 1947 هەروەك بڕوانە : الواقعیة في الأدب الکردی ص 125 .

(23) بلە . کوێرەوەی . بەغدا 1959 . ل 79 .

(24) گۆڤاری هیوا . بەغدا . کانوونی دووەمی 1961 .

(25) بڵێسە . سلێمانی . مارتی 1960 ل 77

(26) لە ڕۆژنامەو گۆڤارەکاندا گەلێك ووتاری نووسیوەو دوو چیرۆکی « جوان » و « لەپێناوی دەرەبەگیدا » ناودارن . بەڵام گەورە ترین کاری چیرۆکی « کاکی ڕۆژگار » کە چاپ نەکراوە . ئەم چیرۆکە کە لەچوارچێوەی هونەرییدا دەچێتە سنووری ڕۆمان‌و لەناوەڕۆکیدا گەلێك مەسەلەی ژیان‌و ڕەفتاری ئادەمیزادی لە سنووری خەیاڵێکی فراوانی جواندا چارەسەر کردووە . ئەمە لەخۆیدا شەقڵ ئەدەبیاتی ڕیالیزمی سۆشیالیستی لەهەموو شت زیاتر دەداتێ .

(27) لەو ووتارەی (الاقلام) دا کۆمەڵێ نموونە نیشاندراوە کە بەشێکیان بەرهەمی پاش نووسینی ئەم باسەن (1979 — 1983) و ڕاستی‌ی ئەم بۆ چوونەی ئەو کاتە دەسەلمێنن .




# خواندنا «سلاڤەکێ بۆ دەلالێ» و چریسکێت رەخنێ

● اسماعیل ابراهیم محمد ●

هۆزانا کوردی‌یا هەڤچەرخ ڤێ دویمـاهی‌یێ گەلەك یـا پێشکەڤتی و هەرا بەردەوامە لسەر پێشکەڤتناخو ، هەروەسا ئەگەر ئەم بێین‌و بەرێ خو بدەینە رۆژنامەو گـۆڤارا یـان‌ژی کتێبخانێت کوردی دێ بینین گەلەك هۆزانڤانێت پـەیدابـوین. لڤێرە پسیارەك دکەڤیتە بەری مە ئەو ژی ئەرێ ئەڤ هۆزانڤانە هەمی دسەرکـەڤتی‌نەو گـەهشتینە وێ بـاوەریێ کو هـۆزان چی‌یە ؟ یان ئەم دشێین بێژینە هەمیا هـۆزانڤان ؟ نـەخێر !! هێشتا گەلەك نزانن هۆزان چی‌یەو مەرجێت هۆزانا هەڤچەرخ چـنـە، ژبلی پێنڤیسێ خـو د دەستێ خو بگـرن‌و پەیڤـا ژ مەڕا رێزبکەن. تشتەکێ دی مخابن ڤێ کاڤێ ئەم د ڤی چەرخی‌دا ئو هێشتـا مە رەخنـەگر نـەبن بـەرهـەمێت نڤیسـەڤـانێت مـە بسەنگینن.

بـەری دەمەکی بـهـاریکـاریـا ئـەمـانـەتـا گشتی یـا رەوشەنبیری‌و لاوان (خالد حسێن) دیوانا خو یا ئێکێ لژێـر نـاڤ‌و نیشانـا (سـلاڤـەك بـۆ دەلالێ) ئێخستـە بـەردەستێ خوێندەڤانێت کورد . ئەڤ دیوانـە ژ (40) چل پـارچە هـۆزانێت کلاسیکی‌و نوی ـ سەربخو ـ پێك د هێت ، هەمی د ناڤبەرا (183)ێ بەرپەڕا دا نە ، لێ نزا د ناڤبەرا چەند سالا دا هاتینە ڤەهاندن چنکی چ هۆزانا دیرۆك لسەر نینە .

لڤێرە دێ هێین پێداچونەکا سڤـك ل دیوانێ کـەین‌و چەنـد خـالەکا ژێ ئـاشکرا کـەین کانێ هـۆزانڤانێ‌مـە (خـالدحسـێن) گەهشتی‌یە راستی‌یا هۆزانا هەڤچـەرخ‌و لوکا هـۆزانڤانی‌یـا وی بزانین، هەروەسا چەند خالەکا دانینە بەرچڤ‌و چریسکێت رەخنێ بەردەینە سـەر لدویڤ هزرو بیـرێت خو، چنکی ئـەدەبێ نوی ـ چ هۆزان ببیت یان چیرۆك ... ـ پێدڤی رەخنەکا نوی‌یە بۆ زانیتا لوکا هۆزانڤانی‌یێ‌و شرۆڤەکرنا بەرهەمێ وی، هەروەسا ئەم نەشێین نـوکە راوەستـین هەڤبـەری یاسـاو مەرجێت ئـەوروپی ئانکـو ب شێوازەکێ گشتی رەخنەیا خاندنگەهێ (النقد المدرسی) چنکو ئەڤ رەخنەیە بو ئەدەبێ کلاسیکی دکەڤیت[1].

هەر نڤیسەڤانەکێ ئەڤرۆ ژ مەرا تشتەکێ بنڤیسیت چ هـۆزانڤان بیت هـۆزانەکێ بنڤیسیت یـان چیـرۆك نڤیسـەك چیرۆکەکێ بنڤیسیت ... دڤێت د بەرهەمێ خودا «بەری هەمی تشتا لدویف یاسـاو مەرجێت هـونەری بچیت »[3] . هـەروەسا رۆخسارو ناڤەرۆك دڤێت ژێك نەهێنە جودا کرن و پەیوەنـدی یەکـا موکوم دناڤدا هەبیت.

## ■■ ناڤێ دیوانێ :

(سلاڤەك بۆ دەلالێ) ناڤەکێ جوانەو گەلەك هەژی یە.. وەلێ دەمێ مرۆڤ هۆزانا (سلاڤەك بۆ دەلالێ) دخوینیت چ سلاڤ تێدا نینن، نە سلاڤا فرێ دکـەت و نە وەردگـریت . بەلێ ئـەگەر نـاڤێ هۆزانێ و دیوانێ کربا (سترانەك بۆ دەلالێ) گەلەك دا جوانتر بیت ئەو ژی ژبەر سێ ئەگەرا :ـ

1 - هـۆزانێ «رەسەنی یـەتەکـا راست و درست یاتێـدا هـەی و پەیوەندی یەکا موکوم یادگەل فۆلکلۆری مـەهەی بتـایبەتی سترانا کوچك و جڤاتا ...»[5].

2 — هۆزان ب سترانەکا فۆلکلۆری دەست پێ دکەت، ئـو ئەڤ سترانە یا بەلاڤە و گەلەك هونەرمەندا یا گوتی . ستران ژی (لێ لێ دینێ) یە.

3 — بارا پتر هۆزان بو سترانێ دچیت ژبلی سترانا (لێ لێ دینێ) دهۆزانێدا هاتی یە:

لێ گەلو
چما ئەڤرو؟
چنارو دیندارا
گوهارو فرکێت وەراندن
کراسێ (بیکانێ) زوی دراندن
بەنوك و مازیا
بڤیرو گازیا
(داوەتا) من و دینێ
گەلو چما ڤەدرەڤینێ
(ب 5)

ئەڤ پارچە بومە خویا دکەت کو سترانەك گەلەك جـوانترەو خوشترە، چنکی (بویك) نیشان و بەلگەیێ (داوەت) ێ یە .. هەروەسا چ (داوەت) ژی دبێ (ستران) نینن !!.

## کێش د هۆزانێ دا :

کێشێت هۆزانا کوردی یا هەڤچەرخ گـەلەك جودانـە ژ کێشێت هۆزانا کەڤن، چنکی هۆزانا کەڤن ـ کلاسیکی ـ دهاتە ڤەهاندن لسەر عەروزێت عەرەبی، لێ نوکە هاتی یە گوهیرین و بویە کێشا برگا. هەروەسا «کێشێت هۆزانا کوردی یا هەڤچەرخ بێت شەنگستە چارن (3 و 4 و 5 و 6) ، چار ژ هەمیا بـئـاوازترو خوشترە ..»[4]. هۆزانڤانێ مە ـ خالد حسێن ـ ی ژی دەست هاڤێتی یە ڤان کێشێت شەنگستەو بکارئینانە، ئـەگەر ئـەم بێین و هـۆزانێت دیوانێ شروڤە بکەین ژ لایێ کێشێ ڤە دێ بینین یێ کەتیە گـەلەك ئالوزی و تەنگاڤی یا، گەلەك جارا بـرگێت هۆزانـا خو لسـەر کێشا شەنگستە (4) ڤەهاندینە ..لێ بدرستی نەئینا یەو ژ (4)ێ کری یە (6)، پاشی کری یە (8) و (3) و (4) و (10). چێ نابیت هۆزان بڤی رەنگی بێتە ڤەهاندن چنکی ئەگەر ئەم بێین (6) ێ دابەش کەین لسەر (4)ێ هەر ئێکێ دێ «ئێك و نیڤ» گەهتێ، یان بێین و (3)ێ دابەش کەین !! دێ چ ژێ دەرکەڤیت، هەلبەت ئەم نـەشێین دەنگێ (3) بکـاربینین چنکی ئەو ژی دەنگەکێ تایبەتی یەو شەنگستەیە ،(ئەگەر کێشا شەنگستە (4) بـرگەیی بکـار بینین دڤێت ئـەو دەنگێت دیلسـەر (4) ێ بێنـە دابەش کرن، نەکو (6) ێ بـدەینە دگـەلدا یان ژی (3)ێ هـەروەسا (10)ێ).

بارا پتر هۆزانێت خو لسەر ڤێ چەندێ ڤەهاندینەو کری یـە رێکەکا تایبەتی بو خو، ئو ئەڤە د گەلەك هۆزانادا خویا دبیت وەك: (سلاڤەك بۆ دەلالێ، تێهنی، هویڤی، گەروك، تە بڤێ سێ هویڤی، چما تو ئەڤرو،...).

بو نمومە ئەم دێ هۆزانا (بزاڤا من و ب 151) وەرگرین لسەر ڤان برگا، د هۆزانێدا ئەگەر ئەم هندەك ووشـا جودا بخـوینین و بکەینە برگەکا سەربخو وەك پەیڤا (لسەر) ژێك جودا بکەین و (ل) جودا و (سەر) ژی جودا بخوینین ـ بنڤیسین ـ یان (بناڤ).. (ب) ێ و پـاشی (ناڤ) بخـوینین دێ هـۆزان ژلایێ کێشێ ڤە درست بیت و چ کێماسی تێدا نابن، هەر وەك دڤێ پارچێ دا خویا دبیت:

ئەو تشت نینە (لنك) هەمیا
پەلێ من گەش بە رون تر بە
(لسەر) جەرگا تو مەستر بە
دا بومە ژی (ببی) مەژی
دا سەر راست بن هەمی ئەژی

**وەکە هەمیا (بناف)و دەنگ**
**هەبت ئەو نیشانا رەنگ رەنگ**
(ب 153)

هۆزانڤانێ مە دە هندەك پارچادا ئەڤ ووشە کرینە دەنگەکێ سەربخوو لهندەك پارچادا ژی کرینە دگەل پەیڤا لدویڤدا، وەکی دهۆزانا (ئاوات ب 105)ێ دا دەمێ دبێژیت:ـ

**ناڤا بەفرا**
**سارو سرێ**
**(لزڤستانا)...**

**لڤێرە ووشا (ل) دگەل پەیڤا (زڤستان) دایە یان ژی دڤێ پارچێ دا:ـ**

**ئەڤی دلێ تێهنییێ ژینێ**
**(لرێکا) ژینێ**

هەروەسا ئەو ژی دگەل پەیڤا (رێك) دایە.مخابن هۆزانڤانێ مە د ڤان ووشاو پەیڤادا گەلەك جارا کەڤتی یە چەوتی یا چنکی هندێ لێ هشیار نەبویەو نەشیایە لسەر کێشێت هۆزانا خودا زاڵ بیت.

■ **دو بارەکرن :**

ئەڤ خالە گەلەك هاتی یە گۆتن و رەخنەگران لسەر نڤیسی یە، ئەگەر ئەم بەرپەرێت دیوانێ ڤەدەین دێ بینین گەلەك پەیڤێت دوبارەکرین و نە جارەکێ و نەدووا، لێ گەهشتی نە هژمارەکێ کو دڤێت مرۆڤ لسەر باخڤیت. هەروەسا ڤێ خالێ ئەم دێکەینە سێ بەش :ـ

1 — **دوبارەکرنا ناڤێ هۆزانا:** ئەڤ دوبارە کرنە دو ـ سێ جارەکا پەیدا دبیت دناف دیوانێدا .. پێدڤی ڤێ دوبارە کرنێ نە بو چنکی هۆزان ب رەنگەکێ گشتی بێتام دبیت وەك پەیڤا (هویڤی) کەتیە سەرسێ هۆزانا ئەوژی :(هویڤی و هویڤی یەك و سێ هویڤی) یان پەیڤا (دەلال) ئەڤەژی کەتیە سەر سێ هۆزانا : (دەلال و سلاڤەك بۆ دەلالێ و ـ جارەکادی ـ دەلال).

2 — **دوبارەکرنا پەیڤا د هۆزانێدا** :ژ ڤێ دو بارە کرنێ دیار دبیت پەیڤ دکێمن دناف زمانی دا وەربگریت و بکار بینیت[5] چنکی ژ یەکێتی یا پەیڤێت کوردی دویر بویەو هەر مایە دناف دەڤەرا خودا..

لسەر کێماتی یا پەیڤا (دکتور بدرخان سندی) دبێژیت: «مخابن لهەر دەڤەرەکێ ژ دەڤەرێن کوردستانێ تورەڤانێ کورد ژ توخیبێن وێ دەڤەرێ نادەرکەڤت.. پەیڤێت لوێ دەڤەرێ دێ بکارهینیت ئو بەرێخو نادت ژ دەرڤەیی وان توخیبا ،ژ ڤێ چەندێ سامانا ئەزمانی لنك تورەڤانێ کورد سامانەکی لاك ئو کێمە ، هەروەسا خویی یە » .

پاشی دبێژیت : «خوزی تورەڤانێ کورد وەختێ بریارا هێلانا پەیڤێن بیانی دایی، دویرتر چوبا، چوبا نێمچیرا پەیڤێن کوردی ل کوردستانێ، لهەمی کوردستانێ نەکو هەما پەیڤێن گوندێ خو بکارهینابا..»[6].

راستە هۆزا نڤان ژ دەڤەرا خو نە دەرکەڤتی یەو نەچویە نێچیرا پەیڤال کوردستانێ ، یاخویاو ئاشکرایە ، بتایبەتی پەیڤا (دەلال) کول دەڤەرا (زاخو) بکار دئینن ، باشە ئەگەر ئەم ڤێ پەیڤێ دناف هۆزانا دا بهژمێرین دێ بتە چەند جارا !! وەرن دا بەرێ خو بدەینێ : دهۆزانا «دەلال» ب (95) ێ هەڤت جاران ، «فەرخ وستی» ب (166) ێ شەش جاران . «دبێژە»ب (161)ێ نەهـ جاران بکارئیتایە ، چنکی ژ ئێکەتی یا پەیڤێت کوردی دویر کەتی یە . نەهەما بەس پەیڤا (دەلال) د زمانێ کوردیدا هەیە ، نەخێرواهەنێ : (شرین ، زەری ، پەری ، ئەسمەر ، خەزال ، ناریـن ، گـەلەکێـت دی ..) . وەرن داقـەست بکـەینـە پەیڤەکادی یاژ ڤی رەنگی وەك پەیڤا (سلاڤ) . دهۆزانا «سلاڤ» دا پێنج جاران بکارئینایە ، یان پەیڤا (تێهنی) د هۆزانا «تێهنی» دا دەهـ جاران ، ژبلی ڤان پەیڤا .. قەفتە کادی یا پەیڤا دهۆزانا «بیرهاتنا جزیری» دا هاتنە بەرچاف ئەوژی ئەڤەنە : پەیڤا (هویر = 4 ، تیر = 6 ، جزیر = 5 ، کویـر = 4 ، میر = 5 ، جاران بکار ئینانینە دگەل چەند پەیڤە کێت دی تر .

ژڤێ دوبارەکرنێ ئەڤ هۆزانە (سلاڤ ـ تێهنی ـ «هەرسێ» دەلا ـ دبێژە ـ فەرخ وستی ـ بیرهاتنا جزیری ..) دکەڤنە دبن ڤی دەرگەهی ڤە

3 ـ **دوبارەکرنا پەیڤا د دیوانێدا** : دناف بەرپەرێن دیوانێ دا چەند پەیڤا هاتینە دوبارەکرن وەك پەیڤا (دەلال) نزیکی (30) جاران ، پەیڤا (تێهنی) سێزدە جاران ، (هویڤی) هەژدە جاران هاتی یە دوبارەکرن ئەگەر ئەم لڤان پەیڤا بکە ریێن براستی دێ گەلەکێت دی کەڤنە بەر چاڤێ مە ، نزا کەنگی ئەڤ پەیڤە دێ دناف هۆزانا کوردیدا کێم بن ، چنکی دوبارەکرنا (پەیڤا) بڤی

رەنگی گەلەك هۆزان پێ دشكێت و چ تازەیی تێ نامینیت ، (بەلێ گەلەك رەنگێت دوبارەكرنێ بێت هەین كوهۆزان پێ جوان دبیت و چ كاری ناكەتە سەر هۆزانێ كو پێ پشكیت) .

**سەلما و سەلوا :ـ**

«سەلما» ناڤێ ئەڤیندارا هۆزانڤانێ مەزن (مەلایێ جزیری) گەلەك گێنگەشە لسەر هاتی یە كرن ، هەروەسا هێشتا بدرستی لنك هندەك هۆزانڤان و تورەڤانان نەهاتی یە زانین .

دەمێ د . بەدرخان سندی لسەر (یەكێتی یا توری كوردی) نڤیسی ئەڤ چەند پەیڤە لسەر جزیری و ئەڤینداره وی نڤیسی بون : (ئەز تێ ناگەهم هەكەر گەردەنی یا چاڤ خێلا نالی «حبیبە» زێربت بەلێ گەردەنی یا [سەلوا] جزیری زیڤ بت !! دێ بلا سەلوا ژی هاتبا گوڤەندێ .. گوڤەندا خال و نوحەتان ..)[6] .

هۆزانڤانێ مە ـ خالد حسێن ـ ی ژی (سەلوا) بكار ئینایەو د هۆزانا «بیرهاتنا جزیری» دا دبێژیت :ـ

**سەلوا جوان تائێ روحان**
**روی قورمزی نەرم وەك هەریر / ب 176 .**

جزیری بخۆ دبێژیت :
ما ب لەعلێن جانفەزا ناڤێ مە بینت جارەكێ
«بالدعا بلغ تحیات (لسلمی) یا برید»[7] .

هەروەسا رەحمەتی (صادق بهاء الدین ئامێدی) ب درێژی د (هۆزانڤانێت كورد)[8] دا دبەرپەرێ (110 ـ 130)ێ لسەر ئەڤینی یا جزیری و سەلمایێ ئاخفتی یە . لێ دڤێت ژبیر نەكەین هۆزانڤانێ پێشكەڤتی و بناڤ و دەنگ (عبدالرحمن مزوری) ژی گەهشتی یە ڤێ راستی یێ دەمێ د هۆزانەكا خودا دبێژیت :ـ

**جزیری :**
**سەلما .. سەلما**
**راستە ڤیراڤا منو تە ..**
**چیرۆكەكا ،**
**گەلەك درێژو بێ بنە**
**گەرمی یا چاڤ و پەیڤێن تە ..**
**ژمێژە وەرە ،**
**مەیا دیارەو یاونە**
**بلا .. بلا لبیرا منی**
**داڤا تەڕا ،**
**بلورو تەمبیرا منی**
**ئەزو تو وەك ،**
**ئاڤا دەریاو ریباران ..**
**دێ گەهین ئێك و بو منی ..**[10]

ئەز دبێژم ئەڤ چەند رێزكە لسەر دیوانا (خالد حسێن)ی بەسن . هەر چەندە مە ب رێكەكا زانستی ئانكو ب رەنگەكێ درست نەسەنگاند لێ ئەڤ چەندە بلا ب مینیت بۆ رەخنەگرێت زیرەك و خامێ خو ب هلگرن و چەند پەیڤێت شرین ژ مەڕا بنڤیسن .. ل دویماهی یێ هیڤی داری سەركەفتنا هۆزانڤانی مە .

ژێدەر :ـ
1 ـ اسامة فوزي : مقالات في النقد الادبي . بغداد ـ 1981 / ص 8 .
2 ـ سالم سلێمان حاجی : گوڤارا [ بەیان] هژمار : 67 سالا 1980 / ب 46 .
3 ـ ادریس محمد علي : رۆژناما [هاوكاری] هژمار : 532 ـ 1980/6/30 .
4 ـ ادریس محمد علي : رۆژناما [هاوكاری] هژمار : (؟) ـ 1981/7/9 .
5 ـ اسامة فوزي : مقالات في النقد الادبي : المصدر السابق / ص 34 .
6 ـ دكتور بدرخان سندی : رۆژناما [هاوكاری] هژمار : 599 ـ 1981/7/30 .
7 ـ دكتور بدرخان سندي : رۆژناما [هاوكاری] : ژێدەرێ بەرێ .
8 ـ صادق بهاء الدین ئامێدی : دیوانا مەلایێ جزیری : چاپا یەكێ / كوڕی زانیاری كورد / بغداد ـ 1977 / ب 201 .
9 ـ صادق بهاء الدین ئامێدی : هۆزانڤانێت كورد : چاپا یەكێ / كوڕی زانیاری عیراق ـ دەستەی كورد / بغداد ـ 1980 / ب 110 ـ 130 .
10 ـ عبدالرحمن مزوری : ژ ئەڤینا چراپێن كەڤن : بغداد ـ 1980 / ب 77 ـ 78 .

# داربەڕوو

# و

# هۆنراوەی ڕەنگ داکوتانو خۆشەویستی خاك ومرۆڤ

کمال غەمبار

هەر شاعیرێ کە کۆمەڵە هۆنراوەیەك دەخاتە بەردەمی خوێنەر ، دەبێ لە بەرهەمی دیکەیدا جۆرە هەنگاوێك بەرەو پێشکەوتن‌و سنوور شکاندنی پێشووی بهاوێ ، ئەگینا پێویست بەوە ناکات کە شیعر بە سەریەکدا کەڵەکە بکات هەر تەنیا بۆ ئەوەی بڵێین بەرهەمی ه.یەو ، سەرچاوەی هۆنراوەی ویشك نەبووە ، لەم چەند دێڕەدا ئەوەم مەبەستە کە دەبێ شاعیر ئاگای لە ڕێچکەی شیعریی خۆی بێ‌و ، هەنگاو بە هەنگاو بابەتی نوێ‌تروبەپێزتر بێنێتە بەرهەم‌و ، لەزەمینەیەکی دیکەدا پێ دابنێ ... مدحت بێخەو .. ی شاعیریش لەو شاعیرانەیە کە تائێستا جگە لە کۆمەڵە هۆنراوەی «دار بەڕوو» سێ کۆمەڵەی دیکەشی بە چاپ گەیاندووە : «زەنگی کاروان ، ڕابەری ژیان ، ورشەی‌ئاوات»

ئەگەر لە شیعرەکانی پێشووی بێخەو «دا جۆرە مۆرك‌و شەقڵێکی ڕاپۆرتی‌و شێوە ڕووکەشی بەدی بکەین ، ئەوا لەناو شیعرەکانی «داربەڕوو» دا ، ئەم دیاردەیە هەست پێ ناکەین ، هەر بۆیەش چەند ساڵێك لەمەوبەر چاوم بەچەند پارچە شیعرێکی شاعیر کەوت تەنیا چەند کۆپلەیەك سرنجیان ڕاکێشام‌و تام‌و بۆی شیعریان پێ‌بەخشیم ، ئەو حەلە بەچەند دێرێك ڕای خۆم بەرامبەریان دەربڕی‌و ئەوەم ڕاگەیاند کە خۆزیا هەموو هۆنراوەکانی شاعیر ئاوابان . لێرەدا مەبەستم کێشانی بازنەیەك نیە بۆ شاعیر کە نابێ لێی دەربچێ‌و ، وەك بڵێی ویستبیتم چەند مەرجێکی تایبەتی بۆ شاعیر دابنێم کە دەبێ پەیرەویان بکات . نەخێرو . وەك کولردج دەڵێ : «ئەگەر شیعر چەند بنکەیەکی هەبێ لەدەرەوەدا بە سەریدا بسەپێنرێن ئەوە لەشیعر ناکات ، بەڵکو بەرەو خاسیەتی میکانیکی دادەبەزێ»[1] ، بەلام مادامەکی خوێنەر لایەنێك بێ لە دامێنانی شاعیر ، ڕەخنەگر بۆی هەیە چەند تێبینی‌یەك دەربڕێ کە

پرۆسیسە داهێنانەکە زیاتر خەست بکاتەوەو پتەوترو بە پێزتری بکات ، ئەویش وەك دەربڕینی ڕای تایبەتی نەك بە شێوەی سەپاندن .

«بێخەو» لەم کۆمەڵە شیعرەیدا ، شاعیری ڕەگەو ڕیشەیە ، شاعیری خۆ بەستنەوەیە بە خاكو خۆڵ ، بەشێوەیەکی جەدەلی لقو پۆپی گوڵو دارو درەخت بەرەگەو ڕیشەوە دەبەستێتەوە ، زۆر جار ووشەی ڕەگ لە شیعرەکانیدا بە دی دەکەین ، ئەم خاسیەتەش لە شیعری «بێخەو» دا نیشانەی هۆشمەندیو خۆشەویستی نیشتمانو ئادەمیزادە ، مایەی کۆڵنەدانو خۆراگرتنو هەڵوێست نواندنە ، سەرچاوەی ڕەسەنیو گەڕانەوەیە بۆ سەرچاوە ڕوونەکانو کانیاوە سازگارەکان .

ئیلیا ئیهرینبورگ بە نیرۆدای گوت : تۆ ووشەی «ڕەگ» لە شیعرەکانتا زۆر دووپات دەکەیتەوە ، ئەم ڕەگو ڕیشە زۆرە لەبەرچی یە لە شیعرەکانتا هەن ؟
پابلۆ نیرۆدا لە وەڵامدا گوتی :

«من ناتوانم بژییم ئەگەر لە خاکەکەم خۆیدا نەبێ ، من ناتوانم بژییم بێ ئەوەی قاچو دەستو گوێم لەسەر خاکی نیشتمانەکەم دابنێم ، من ناتوانم هەناسە بدەم بێ ئەوەی هەست بەسووڕانەوەی ئاوو سێبەری بکەم ، من ناتوانم نەشو نوما بکەم بێ ئەوەی هەست بە ڕەگەکانم بکەم کە لە ناو قوڕی ڕەشدا لە خودی دایك ، لە کرۆکی بنەچەدا دەگەڕێن»(٢) .

ئەوەتا «بێخەو» لە هۆنراوەی «ڕەگ»دا تابلۆیەکی ئەوتۆمان بۆ دەکێشێ ، کە پەیوەندییەکی نەپچڕاو لە نێوان چڵو پۆپی دارو دەوەن دایە ، کە بوونی ڕەگو ڕیشە هۆی بنەڕەتی ئەوانە ، کە ئەوان لە ڕێگەی ڕەگەوە هەڵدەچنو بۆ ئاسمان دەکشێن بە شنەی با دەکەونە بەزمو سەما ، دەبێ ئەوە بزانن کەلەسەر بۆ شایی نەوەستاون ، هەر بۆیەشە دەبێ ئاگایان لە باڵندەکان بێ ، لانەیان لێ تێك نەدەن ، لە خۆیان بایی نەبن ، نەکەونە گیانی ئەو باڵدارانەی کە بەو ئومێدەوە دەژیان کە چڵەکان ببنە پەناگاو سێبەرو داڵدەیان ، لقەکان بەربگرن :

**وریابن وریا چڵەکان**
**ئێمە نەبین کەی ئێوە هەن !**(٣)

شاعیر بە دوای ڕەسەنایەتیدا دەگەڕێ ، کە لە سەر ڕەگی خۆی بڕوێتەوە ، بەڵام بە مەرجێ مایەی خۆشبەختیو ڕوو گەشی بێ ، ڕەسەنایەتی یەك هەرچەند پاییزی گەڵا ڕێزان بیشێوێنێو بیوەرێنێ ، بڕوێتەوەو پاییز ببەزێنێ ، ڕەسەنایەتی هیرۆبێ :

**ئەگەر ویستتان**
**ڕەسەنایەتی ون نەکەن**
**سەیری بنجی هیرۆ بکەن**(٤)

«داربەڕووی بێخەو ئەوەندە ڕەگی بە خاکدا ڕوو چووە ، ئەوەندە خۆی داکوتاوە ، هەرچەند ڕەشەبای شووم هێرشی بۆ هێناوە ، گەڵایەکانی وەراندووەو ، لقو پۆپەکانی تێك شکاندووە ، بەڵام مەرجی بنەڕەتی مانەوە ڕەگەو ، ڕەگێکی چەسپاوی پەل بڵاوی بەتین :

**بەڵام هەرگیز نەیتوانیوەو ناشتوانێ**
**دار بە ڕوێك لە ڕەگو ڕیشە دەربێنێ !**(٥)

هەر بۆ یەشە دار بەڕوو بۆتە هەوێنی سرووشی شاعیران ، ڕەمزو هێمای خۆ بەستنەوە بە خاكو خۆشەویستی ، نیشانەی نەبەزینو ورە بەرنەدان ، سەرچاوەی بەرچاو ڕوونیو ئومێد بوون بە دوا ڕۆژ .. مادامەکی خاك لە ئازادابێ ، هەشە بیپارێزێو خۆی لەبەر زەبرو زەنگی ڕۆژگاری ناهەموار ڕابگرێو ، بۆی ببێتە سەنگەرو بەرگری لێ بکات .

دەنگی سروشت ، دەنگی شاعیرە ، هەستو نەستی دەروونیەتی ، وەك بڵێی واقیعی سروشت لە خۆیدا دەبینێتەوە ، سروشتەکە ڕەمزێکە بۆ مرۆڤی هاوار لێ هەڵساو ، هەر مرۆڤێ بێو لە هەرشوێنێك بێ ، بەڵام مرۆڤێکی نەبەزیوی چۆك دانەداوە ، کە سەرەرای ئێشو ئازارو ژیانی وەیشوومە پڕ ئەشکەنجەو زریکەو قیژان ، هێشتا هەر قیت وەستاوەو خۆی ڕاگرتووە :

**کۆڵکە دارێکی بچووکیش**
**بە وێنەی دەستێکی قوچاو**
**قیت وەستابوو لە نێوانیان**(٦)

ئەم کۆڵکە دارە بچووکە لە هۆنراوەی «بەری ئەگەرەکان چۆن دێنە ڕوو» دا دەبێتە دار بە ڕوویەکی زلی قەد ئەستووری ڕەگ داکوتاو کە ڕەشەباکان دەبەزێنێو ، تریفەی دووریش لەشکری تاریکی دەشکێنێو ، ڕازی دیمەنی دەنگدارو قووڵی چاوی هەزارەکان لاوەکان دەهەژێنن ، کە مەسەلەکە ئاوابێ ،

ئەگەر لە دەریاش بدەن ترسیان نیەو بەسەر شەپۆلەکاندا زاڵ دەبن . ئەو معادەلانەی بێخەو دەبن بەزنجیرەیەکی ئەلقە نەپچراوی توندو پتەو کە ڕێگەی هەنگاو خۆش دەکەنو ، جۆرە بەرچاو ڕوونی‌یەك بە مرۆڤ دەبەخشن .

ووشە لای شاعیر شتێکی پیرۆزە ، هی ئەوەنیە بخرێتە بازاری مەزاد کردن ، یا ڕووێکی سەختە بە خۆیەوە بگرێ ، ووشە لە ئاستی فریودانو پایەو سامان‌دا چۆك دانادا ... وەك ڕێبوارێکی ماندووی ڕێگەی دوور تینووی ئاوە ، دەیەوێ تاسەی تینوویەتی خۆی بشکێنێ ، کە چاوی بەئاوێکی ڕوونی سارد دەکەوێ پڕ بەدڵ ئارەزووی نۆش کردنو هەناو فێنك کردنەوەیە ، بەلام کە زانی کانی‌یەکە «لاك»ی تیایە توخنی ناکەوێ ئەگەر لە سەر حیسابی خنکانو مردنیشی بێ ، ئاوەتا شاعیر دەڵێ :

**بەلام کە زانرا کانیەکە**
**«لاك» ی تیایە**
**تینوو نزیکی ناکەوێ**
**بەڵێ ڕازی ووشەش وایە !!(٣)**

بەستنەوەی کانی بەتینووو لایەنی بەرچاوو دیاریی ئاوەکەو دەرك پێ‌کردن بە بوونی لاك لەناو یاو پەیوەندی ووشە بە شاعیرو نووسەر ، چۆنیەتی مامەلە کردن لەگەڵیا ، جۆرە موعادەلەیەك لەلای خوێنەر ساز دەکات ، کە شاعیر بەشێوەیەکی مەنتیقی ماقووڵ مەسەلەکە شی‌دەکاتەوە ، مەسەلەیەکی مادی بە مەسەلەیەکی مەعنەوی دەبەستێتەوە ، کەتینوو نایەوێ هەناوی هەڵقرچاوی گەرم داهاتووی خۆی بە ئاوێکی بۆگەن فێنك بکاتەوەو تینوویەتی خۆی پێ‌بشکێنێ ، با ئاوەکەش لەرواڵەت‌دا ڕوونو ساردبێ ، هەروەها ووشەش ئەوەندە پیرۆزە لای شاعیر ، ڕازو نیازی دەبێ لەناو دێری گەشو ڕستەی بەپێزو هێژادا دەر ببڕێن ، هەرچەندە شاعیر نەیویستووە کە دیوی ناوەوەو دەرەوەی مەسەلەی ووشە ڕوون بکاتەوە ، بەلام سەرە دەزووەکەی بە دەستەوەداوە ، شاعیر بیرەکەی بەخەستو خۆڵی دارشتووەو مەرجی هونەری پەیڕەو کردووە ، لێرەدا ووشەکەی «غاندی»م دێتەوە بیر کە بەرامبەر ڕۆژنامەدا گوتوویەتی : «ڕۆژ نامە ژەمە خواردنێکە ، گەورەترین تاوان سەختەکردنە لەم ژەمە یاخود ژەهراوی کردنی‌یەتی» .

هۆنراوەی «پەروانە» ی بێخەو نیشانەو ڕەمزی گیان بەختکردنە لە پێناوی خۆشەویستی‌و عیشقێکی پیرۆزدا ، تەنیا خوێن ڕشتن ، یا ئازار کێشان نیە لە پێناوی مەسەلەکەدا ، بەڵکو مردنەو گیان توونا کردنە . ئەگەر «خەییام» خۆی بە پەروانە پێ دابنێ کە دەیەوێ بەڕووناکی بگاتو گەیشتنەکەشی سووتانو لە ناو چوونیەتی کە دەڵێ :

**مصباح قلبي يستمد الضياء**
**من طلعة الغيد ذوات البهاء**
**لكنني مثل الفراش الذي**
**يسعى الى النور وفيه الفناء(٤)**

ئەوا لای «سەعدی» دەبێتە دەرسێك بۆ مەلی بەیانی خۆشخوان کە داوای لێ‌دەکات دەرسی دڵداری لەپەروانە فێر بێت کە گیانی دەسووتێ‌و ئاوازی تیا نامینێ‌و دەبێتە زوخاڵ :

**اي مرغ سحر عشق ز پروانه بياموز**
**كان سوخته را جان شدو آواز نيايد(٥)**

بەلام پەروانەی بێخەو پێشێل دەکرێ‌و هەر دەنەخشێ ، ئەم قوربانی‌دانەی دەبێتە مایەی دەرسو یادگار ، دەرسی شەیدای خۆشەویستی ، خۆشەویستی ڕووناکی تارادەی شەهید بوون لە پێناویدا ، یادگارێکی گەشیش جێ‌دێلێ کە بە ڕۆژلەم گوڵ بۆئەو گوڵ دەفڕێ‌و دەم دەنێتە ناو دەمی گوڵ ، بە شەویش هەر دڵداری ڕووناکی‌یەو عەودالی‌یەتی ئەگەر لە پێناویشیدا بسووتێ‌و گیانی ببەخشێ ، چی تیانیە مادامەکی شەهیدی عیشقو دڵداری‌یە :

**خێرا خێرا وەکو شەیدا**
**باڵی ناسك لە چرا ئەدا**
**ئەسووتێ‌و ئەکەوێتەو خوار**
**پێشێل ئەکرێ‌و هەرد ئەنەخشێ**
**جێ‌دێڵێ وانەو یادگار .. !(٦)**

ئەگەر پەروانە وانەو یادگار جێ‌بێڵێ ، ئەوە ووشەکانی شاعیر ئەگەر لەڕێی ئامانجە پیرۆزەکانیاندا بشمرن ، بێ‌سەرو شوێن نین ، بەڵکو خاوەنی ناسنامەی خۆیانن ، چونکە لە ڕێگەیەکی پیرۆزو بەرزدا دەجەنگنو ڕێگە دەبڕن :

**ووشەکانی من نیشانچین**
**بۆ ئامانجی بەرزو دووری مرۆڤو ژین**
**لە ڕێگادا جەنگاوەرن**

**بازنەی ئاسۆیەکان دەبڕن**
**بەدوای بزەی ڕاستی لێوی**
**لاتو کلۆڵەکان وێڵن**
**گەر بشمرن**
**ناسنامەکەیان جێ دێڵن**[11]

کە قینو ژانو ئازارەکانی چەوساوەکان دێنە کەفو کوڵو هەڵدەچن ، کە بە ڕووی ئەهریمەنی بەدکار دەتەقنەوە ، دارو بەردوو کەژو چیاش لە گەڵیانا دەتەقنەوە ، سروشتیش زۆرداریو ستەمکاری بەخۆیەوە ناگرێت ، ئەویش تێکەڵ بەڕقو کینەی چەوساوەکان دەبێو زۆرداری تەفرو توونا دەکات :

**کاتێ چاوی چەوساوەکان**
**دەبن بە گڕو بەپشکۆ**
**بۆ پەنجەو داوی ستەمکار**
**کاتێ هاوارو ژانەکان**
**کۆ دەبنەوە**
**هەردو دارو کەژو چیا**
**تەنانەت ڕووبارو دەریا**
**وەکو بۆمبا ئەتەقنەوە**[12]

ئەگەر گەڵای درەختەکان لە وەرزی گەڵا ڕێزانا بشوەرێنو لە ڕەگو ڕیشەی دارەکانا دوور بخرێنەوە ، بەلام هەندێکیان لە دایکیان جیا نابنەوە ، دەبن بە پەینو زیاتر تینو تاوو گوڕو خۆڕاگرتن بە دایکیان دەبەخشن ، ئەمەش نیشانەی ڕەسەنایەتیو خۆبەستنەوەیە بەنەژادو بنەچە :

**هەندێ دەبن بە خاکوتین**
**بۆ ڕەگەکان**
**تاکو دایکیان زوێر نەبێ**
**تاپێیان نەڵێن نارەسەن .** [13]

**خۆشەویستی خاکو خۆڵ ئەوەندە لای شاعیر گەورەو پیرۆزە کە بە هیچ کلۆجێ نابێ پیاو لێی بێزار بێو لێی دابپچڕێو دوور کەوێتەوە ، هەرچەندە جاروبار لە هەندێ شوێنا تووشی ئەشکەنجەو ئازاریش بووبێ ، نیشتمان ئەوەندە گەورەو فراوانە هەموو لایەك دەگرێتەوەو باوەش بۆ گشت کەس دەکاتەوە ... نیشتمان وەك دەریا وایە هەموو ڕووبارو قەڵبەزو تاڤگەو جۆگەو جۆبارەکان بە خۆیەوە دەگرێو گشتیان یەك دەخا ، دژ بەگشت ناحەزانو نارەسەنان خۆڵو لمو ماسی تێکەڵ دەکات :**

**دڵی فراوانی دەریا**
**گشت ئاوازی خوڕو هاژەی**
**ڕووبارانی دۆڵو چیا**
**لەگەڵ خۆڵو لمو ماسی**
**تێکەڵ ئەکاو یەکیان ئەخا**
**دژی ئەوەی کانیاوەکەی**
**بەر بەرد ئەدا ...** [14]

زۆر لە هۆنراوەکانی ناو «دار بەڕوو» شقڵی پۆستەر بە خۆیانەوە دەگرن ، لە ڕێگەی وێنە کێشانی دیمەنی وورد ووردی تابلۆی هونەرمەندانەمان پێشکەش دەکات . تابلۆیەك کەجوانیو نازاداری سروشتو ئافرەتێکی شۆخو شەنگ نەبێ کە دلرفێن بێ ، سەرچاوەی سرووشی شاعیربێ ، بەڵکو تابلۆیەك لە ناخەوە کارت تێبکاتو بتهەژێنێ .. تابلۆیەك لە ناو هەزاران تابلۆی هونەرمەندان ، کە شاعیر خۆی هەڵبژێرەو سەرپشکە وەك هونەرمەندێکی کارامەی هێژا سەیری دەکاتو ، دوای ووردبوونەوەیەکی زۆر قووڵ بڕیاری خۆیدەدا :

**گەڕا گەڕا**
**لەدوای گەلێ وورد بوونەوە**
**دیمەنی لەپێکی زبرو**
**دوو چاوی قووڵ**
**یەکەم خەلاتی بردەوە ..** [15]

لە ڕاستیدا جۆرە تابلۆیەکی ئاواو یەکەم خەلات بردنەوەی بەڵگەی ئەوەیە کە شاعیر هەستێکی هونەرکاریی قووڵی هەیە ، شێوەی ڕووکەشی ڕازاوەو ئارایش کراو کاری تێ ناکات ، بەڵکو کارێکی هونەریی داهێنەرانە دەیجووڵێنێ ، کە دیمەنی لەپێکی زبرو دووچاوی بە قوولا چووی ڕووێکی چرچو سیسو ژاکاوە .. بەم شێوە «بێخەو» لە واقیع نزیك دەبێتەوەو ئەم جۆرە واقیعە هەڵدەبژێرێ کە خۆی مەبەستیتی کە ڕۆمانسییەتی لەگەڵ تێکەڵ دەکاو واقیعیکی دیکەی لێ دروست دەکاتەوە .. ئەم هەڵبژاردنەی شاعیر لەوانەیە کارێکی نەگونجاو بێ ، یابەلای هەندێ کەسەوە کارێکی نائاسایی

بێت ، بەلام وەك شیللی لە کتێبەکەی «بەرگری کردن لە شیعر» دا دەڵێ : «شیعر شتە ئاساییەکان وای دەکات کە خۆیان وابنوێنن وەك بلێی نائاسایین» .

ژیان لای شاعیر دیاردەیەکی وەستاوی چەسپاو نیە ، بەڵکو لە گۆڕانکاری‌یەکی تەواو دایە ، کاروانی ڕێگەی هاتو نەهاتیش هەر چەندە تووشی کەوتن و نشوستی بێ هەر ئەگاتە جێ ، مادامەکی بڕوای بەخۆیەتی ، وەك چۆن ئاوی ڕووبار ئاوی کۆن لەگەل خۆی هەلدەگرێ و هی نوێ دێتە سەر ، ژیانیش ئاوا هەمیشە بەردەوام دەگۆڕێ ، کۆن دەڕوات و نوێ لەدایك دەبێ ، لە ناو لەمەی هەموو کۆنێکدا نوێ چەکەرە دەکات ، شیعریش دەبێ بابەت ی تازە بەخۆیەوە بگرێ و لە نوێ بوونەوە دابێ :

**کاروانی ڕێ‌ی هاتو نەهات**
**ئەگاتە جێ**
**ئاوی ڕووبار لەیەك شوێن بێ**
**لە چرکەیێك هی کۆن دەڕوا**
**هی نوێ دێ** [١٥]

بێخەو لەم کۆمەلە شیعرەیدا تەقەلایەکی باشی داوە کە بە شێوەی شیعری پۆستەر دیمەن و وێنەی ڕێك و پێکمان بۆبکێشێ ، بیرو ڕای خۆی لە بۆتەی تابلۆیە شیعری تەکاندا ، قال بکاتەوە ، وەك هۆنراوەی «هەلمات ، هەور ، ئاسۆ ، ورشە ، بروسك ، کاروان کوژە ، دەبان و پێنووس ، کل‌وبیر ، شارێگا ، هێرۆ ، گرەو .. هتد»

زۆربەی هۆنراوەکانی ئەم کۆمەلەی بەردەستمان دەمانخەنە سەر ئەو ڕایەی کە «بێخەو» هەنگاوی گورجی بۆپێشەوە ناوە ، سەرکەوتنێکی باشی وەدەس هێناوە ، ئەم ڕاستی‌یەش وامان لێدەکات کە ڕایەکی دیکەمان بەرامبەر بە شاعیریەتی «دار بەڕوو» هەبێ کەلەگەل ڕایەکانی پێشوومان جیان ، ئەویش ئەوەیە کە شاعیر توانیویەتی ئەم جارە زەمینەیەکی دیکە بۆخۆی دیاری بکات و جێ پێ‌ی خۆی لەسەر بکاتەوە .

پاش ئەم هەلسە نگاندنە بۆمان هەیە چەند تێبینی‌یەکی تایبەتی بەرامبەر هەندێ لایەنی شیعرەکان دەربڕین کە شاعیر فەرامۆشی کردوون ، هیوادارین لەبەرهەمی‌دا هاتوویدا چارەسەریان بکات بۆئەوەی هۆنراوەکانی خەست‌ترو قووڵتربن . لەو تێبینیانەمان ئەوانەی خوارەوە دەست نیشان دەکەین و بە پەلە بەسەریانا تێدەپەڕین .

بۆ ئەوەی بیروباوڕی شاعیرو وێنە شیعری‌یەکان لە باوەشی دارشتنێکی قووڵی پتەو خۆیان بگرنەوە ، دەبێ شاعیر ئەوەندە خۆی بەسەردا نەبەستێتەوە بۆ نموونە :

لە هۆنراوەی «گزنگ»دا کۆتاییە کەی بە «هەتا هەتا» دێت ، ئەوە لە کاتێکا هەر لەبەر ئەوەی سەرەوای «پەیتا پەیتا لە شیعرەکەدا هەیە . ئەگەر «هەتا هەتا» نەشبێ باشترەو لە نرخی هۆنراوەکە کەم ناکاتەوە ئەگەر بە نرخ تری نەکات .

یا لە شیعری «هێرۆ» دا کە دەڵێ :

**هێرۆیەکانی هەلوەران**
**وای زانی توونابوون نەمان**

(توونا بوون و نەمان) یەك واتان ، نەمانە کە زیادەو پێویست بە بوونی ناکات .

یاخود لە شیعری «کل‌وبیر»دا :

**کوولەکەی دنیایان شکاند**
**کۆتیان پساند**

بەلای منەوە «کۆتیان پساند» زیادەو بێ ئەم دەستەوا ژەیە مانایەکە خەست‌ترو پتەوترە .

یا لە هۆنراوەی «بریقەی چاو» دا کە دەڵێ :

**بەلام بریقەی چاوەکانتان**
**بروسکی هەوری بەهارە**
**زەنگەو دەنگێکی بەکارە**
**سپیدەی جەژنی چەوساوەو**
**سەرکەوتنی تێدا دیارە**

«ڕستەی زەنگەو دەنگێکی بەکارە» زیادە ، ئەگەر لە جیاتی بروسك «هەورە تریشقە» بوایە جێ‌ی خۆی بوو کە زەنگەو دەنگیشی نەگەل بێ ، بەلام مادامەکی بروسکی هەوری بەهارە کە بریقەی چاوەکانەو بریقەکە سپیدەی جەژنی چەوساوەیە ، پێویست بەڕستەی ناوبراو ناکات ، ئەراگۆن گوتەنی : «جوانترین هونراوە کورترینیانە» بە تایبەتی کە شاعیر ڕێچکەی بابەتی پوستەری گرتووە .

تێبینی دووەمم ئەوەیە کە شاعیر جاروبار هەندێ وێنەی شیعری دووپات دەکاتەوە ، ئەم خاسیەتەش لەسەر حیسابی

شاش کردن‌و که له‌به‌ر تێکـه‌وتنی کۆمـه‌ڵه شیعره‌کـه ده‌بێ ، واپزانم هۆنراوه‌یه‌کی ره‌سه‌نی به‌پێزو خه‌ست‌و خۆڵ له ده‌یان هۆنراوه‌ی دیکه باشتره که‌رسته‌و وێنه‌و دیمـه‌ن‌و بیری نـاو شیعری دیکه‌یان تێدایه‌و دووپات ده‌بنه‌وه ، لێره‌دا مه‌به‌ستم ئه‌وه‌یه که شاعیر ده‌بێ ئاگای له‌به‌ر پێی خۆی بێ ، ئه‌و وێنه‌و دیمـه‌نانـه نه‌خـاته نـاو چوار چێـوه‌ی هۆنـراوه‌ی دی که له هۆنراوه‌یه‌کدا به کاری هێناون . بۆ ئه‌م بۆ چوونه‌مان چه‌نـد نموونه‌یه‌ك ده‌خه‌ینه ڕوو :

شاعیر له هۆنراوه‌ی «هێرۆ»دا ده‌ڵێ :

**به‌ڵام هێرۆی به‌رزو ڕه‌سه‌ن**
**دوای وه‌یشوومه‌و تۆف‌و زریان**
**له‌سه‌ر ڕه‌گی خۆی ژیایه‌وه**
**له‌سه‌ر هه‌ربنجێ به ده‌یان**

هه‌مان وێنه له هۆنراوه‌ی «به‌ری ئه‌گه‌ره‌کان چۆن دێنه ڕوو» دا دووپات ده‌بێته‌وه :

**ئه‌گه‌ر ویستتان**
**ڕه‌سه‌نایه‌تی ون نه‌که‌ن**
**سه‌یری بنجی هێرۆ بکه‌ن**

یـاخود له هـۆنراوه‌ی «تـابلۆ»دا ئه‌م وێنـه‌مان نیشـان ده‌دات :

**دیمه‌نی له‌پێکی زبرو**
**دوو چاوی قووڵ**

**له هۆنراوه‌ی «کام سه‌رچـاوه‌ی سرووشی بـیر » دا شاعیر ده‌ڵێ :**

**به‌ڵام لای من**
**ڕه‌نگ دزراو ان**
**قووڵی چاوان**
.....
**زبری ناو له‌پی زامدارو**
**خوێن تێزاوان**

هه‌روه‌ها له هۆنراوه‌ی «سوراغ» دا ده‌ڵێ :

**هه‌ندێ ووشه‌ی ناو په‌راسوو**
**قووڵی چاو بوو**
**ناڵه‌ی گیانی «سی» ی خوراو بوو**

جارێکی دیکه‌ش چاومان به‌م وێنه‌یه ده‌که‌وێ :

**ئاوازی ناڵه‌ی ناو سینه‌ی**
**پڕ زو خاوان**

له کۆتایی ئه‌م نووسینه‌مدا ئه‌وه ده‌سه‌لمێنم که‌له ناو «دار به‌ڕوو»دا هه‌ندێ هۆنراوه‌ی تر هـه‌بوو پێـویست بوو شی‌یـان بکه‌مه‌وه و به‌چاوی لێکۆڵینه‌وه مامه‌له‌یان له گه‌ڵدا بکه‌م ، به‌ڵام له ترسی درێژ دادری پشت گوێم خستن ، ده‌بێ ئه‌وه‌ش بڵێم که «مدحت بێخه‌و»ی دار به‌ڕوو ، بێخه‌وی زه‌نگی کاران‌و ڕابه‌ری ژیان‌ووشه‌ی ئاوات نیه ، به‌ڵکو بووه به شاعیرێکی دیکـه که پێناسی شیعری پڕ وێنه‌ی ووردکاری‌و تابلۆی هـه‌مه ڕه‌نگی بابه‌ت پوسته‌ر له هه‌گبه‌ی شیعردا هه‌ڵگرتووه و پێشکه‌شمان ده‌کات . جا ئه‌گه‌ر من وه‌ك ڕه‌خنه گرێکیش نه‌درێمه قه‌ڵه‌م با به خوێنه‌رێکی باش بژمێردرێم‌و هیوادارم تا ڕاده‌یه‌ك تـوانیبێتم بڕیاری خۆم له‌سه‌ر هۆنراوه‌کانی بده‌م . ئیلزا تریولیه گوته‌نی : «له‌ئاستی هه‌ر به‌رهه‌مێك‌دا دوو نـووسـه‌ر له ئارادان ، ئـه‌و نووسه‌ره‌ی به‌رهه‌مه‌که‌ی داهێناوه‌و خوێنه‌ر»[18] .

**په‌راوێزه‌کان :**

1 ـ بڕوانه «الشعر بين الواقع والابداع» صبيح ناجي القصاب
2 ـ مذكرات بابلونيرودا «اعترف بأنني قد عشت»
ترجمة الدكتور محمود صبح ل 246
3 ـ داربه‌ڕوو : مدحت بێخه‌و ل 42
4 ـ هه‌مان سه‌رچاوه : ل 53
5 ـ = = = : ل 41
6 ـ = = = : ل 33
7 ـ = = = : ل 16
8 ـ بڕوانه : رباعيات الخيام ترجمة احمد رامي
9 ـ گلستان : ل 7
10 ـ دار به‌ڕوو : ل 73
11 ـ هه‌مان سه‌رچاوه : ل 75 — 76
12 ـ = = = : ل 86 — 87
13 ـ = = = : ل 8
14 ـ = = = : ل 9
15 ـ = = = : ل 10
16 ـ = = = : ل 88
17 ـ بڕوانه «اراغون شاعر المقاومة»
18 ـ الثقافة الاجنبية ژماره (3) ل 218

صدیق شرو

# راوەستانەك دگەل چیروکا لەعلێ خانا گوڤەندی

ل بشکورینا گولا چەرخێ هەژدێ میللەتێت یوروپی دەست ب کومکرنا فولکلورو کەلەپورێ خوکر ئویشیێت زەڤیا ڤێ چەندێ خرڤەکرن ژ سەرلێڤا و ڤەحەجاندن چ چیروك چ سەرهاتی ، پەند .. ستران ... ژیاننامە و داستان . چیڤانوك .

ژ کەڤن و ل ناف هەمی میللەتا دوو تەخێت سەرەکی هاتنە پەیداکرن تەخا ئاغاو دەرەبەگا و یادووێ تەخا رەنجکێشاو بندەستا هەر ئێك ژ ڤان تەخا ب کریارێت خو رادبیت لدویڤ چەرخێ گەردونێ لێ ژبلی ماتێکرنا تەخا ئێکێ د کارو بندەستکرنا تەخا دووێ ئەڤ بزاڤتنا بوری دبیتە گیانێ مێژوێ هەمی دبنە چیروك و سەربور و کەلەپور ـ هوسا ـ لێ بێ ی ژمار ـ دوو جوینێت رەوشەنبیرا دگەل ئێك ریکەتن . مرازا دەرەبەگی دەستەسەریا جوتیار و رەنجکێش بو ئینا هەمی تشت بو بەختەوەریا خو ترخانکرن چینا بندەست بزاڤت ل مانا خو گەریا هاریێ ژیانێ بخو پەیداکر لێ د بازنێ هزرو بیرێت ئاغای دا روژ بویادی رەهێت دارا وان خو کویر دادهێلا و زانینا وان ژی وەکی مەکوتی وەرار نەددا ـ چونکە وان حەز نەدکر کوڤەقیر وژار تێبگەهن یان زانا ببن دا ژبندەستا دەرنەکەڤن .

دەرەبەگی نەدهێلا جوتیار یان کریگرتی بریارەکێ ژ هزرا خو بدەت یان ماتێ خو جارەکێ دکریارا وی بکەت ژبەر هندێ نەزانین و کێژاتی یاحشەبو لناف چینا هەژار و فەقیرا ، وڤێ چەندێ بێگومان داخا خو هەبو لسەر بەرهەمی و چ جورە سامانەکی تر .

هەر وەسا ئابوری ما یا بنکەڤتی گەنمێ سورکری ددا گیانەوەرێت خوکارس ژی ب دەست هەژارا نەدکەڤت . بووان وەسا دیارە هەگەر بەرهەم مشەبو جوتیار دێ ژبن «تەبا» وان دەرکەڤیت ژیارا وی دێ بشکڤیت لهێرە مەزانی وەرارا میللەتا پەیوەندی یاهەی دگەل مشەبونا بەرهەمیڤە ئانکو بشکڤتنا لایێ ئابوری .

باشە کەنگی هزرا کومکرنا فولکلوری لناف ڤی کومەلی پەیدابو ؟ دەراندەر ئەم نزانین ژکیش روژێ یان سالێ ـ لێ دێ شێین ژکومەلێ یوروپی ڤە بێ دائێین چونکە شیان و توانایێت وان پێتر بون ژمیللەتێت دی .. دەمێ کو بورژووازی پەیدابوی لناف بەرا هەردوو چینێت مە بەری نوکە بەحسکری . ڤیا دربەکی لدەرەبەگی بدەن و ب دەستڤە هات ل دەمێ کو جیهانێ بانگێ

پێشتر تەجرەبەی حوكمی توركی لە سلێمانی نەبووە تا بزانێ ئایا لەوانەیە تێیدا بحەوێتەوە ؟ یان نا ؟ .

ج - سەرنج لەموناجاتەكانی ڕێی حەج و قەصیدەی (ئەی ساكینی ریاضی مەدینەی مونەووەرە) و قەصیدەی (وەی كەڕوو زەردی مەدینە ..) بگرە هەست بەوە ناكەیت نالی ئاوارەو لێقەوماوە ، بەتایبەتی قەصیدەكەی دوایین (وەی كەڕوو زەرد ..) پێوەی دیارە كەنالی عوزری بەجێ هێشتنی مەككەو مەدینە بەوەدا دەهێنێتەوە كە دەڵێ (من كەبازی دیدە بازم نەك شەوارەی دەستەمۆم) . بازی دیدەباز [بازی چاوبڕكێ كەر] هی لێقەوماوی نییە .

ئەم چەند برە شیعرە توندو بەرزەی لەیەكەم سەفەری حەجیدا گوتوون كەجارێ تەنگانەی نەگەیشتوەتی . دوای جێهێشتنی حیجاز بەرەو ماڵ خەبەری تێشكانی بابانی وەرگرتووەو ماوەتەوە .. بەیەنیكی زۆری پێ دەچێ دەگەڕێتەوە بۆحەج . ئەم جارەیان لەقەصیدەی (ئەی تازە جەوان)دا ئاوارەیی پێوە دیارە كە دەڵێ :

**«مویدێكە كە هەم گەردشی دەورانی سوپیپەرم»**

هەموو بەیتەكانی دیكەشی دادو بڕوبە لەدەست پیری و بێ وەزعی و لێقەوماوی ..

ئەم بۆچوونە ڕێك دێت لەگەڵ ئەحواڵی مەعلوومی نالی :

ئەگەر نالی لە 1280 بۆحەج چووبێت و دوای سەفەری ئەو میرنشینی ی بابان تێك درابێت جێی خۆیەتی پاش چەند ساڵان پرس بە سالم بكات بۆگەڕ چونكە لە خۆی بەگومانە ئایا دووچاری چی دەبێ لەسلێمانی . شایەدیەكەی (خۆدزكۆ) كە دەڵێ لەساڵی (1853ز) ئەحمەد خان لەپارس پێی گوتم بچمە شام نالی ببینم ، بەچاكی جێی خۆی دەكاتەوە لەم لێكدانەوەیەدا . لە 1845 تا 1853 (8) ساڵان دەگرێتەوە ئەمەش مەودایەكی ئەوتۆیە هەم نالی تێیدا سەغڵەت بووبێ هەم پرسیش بكا بۆ گەڕانەوە : سالم لە خۆرایی جەوابی نامەی نالی بۆشام ڕەوان ناكات ، دیارە لەو دەمەی كە نالی كاغەزی بۆسالم نووسیوە لە شام بووە ، ئنجا لەكەیەوە هاتووە بۆ شام دەخلی بەسەر سەرەتای ئاوارە بوونیەوە نییە ..

لە پەراوێزی لاپەرە (32) لیژنە وشەی (هەڵبەستەر)ی بە واتای (ناظم) بەكار هێناوە . هەرچەند جۆرە قیاسێك لەداڕشتنی بەكار هاتووە ، دیسان لەبەر زەقی ی وشەكە چاو لێی هەڵدەبەزێتەوە . جگە لەمە هۆی دیكەی ڕێزمانی هەیە داڕشتنەكە دەخاتە خانەی ڕیزپەڕ (شاذ) :

بەزۆری كاری كوردی دوو جۆرە ناوی كارا (اسم فاعل)ی لێ هەڵدەستێ . بەنموونە : خواردن ، كردن ، بردن ، كوشتن تاقی دەكەینەوە دەگوترێ :

| | |
|---|---|
| نان‌خۆر | نان خواردوو |
| هەڵە كەر | هەڵە كردوو |
| بار بەر | بار بردوو |
| كورد كوژ | كورد كوشتوو |

هەرچی كاری (بەستن ، پەستن ، پەرستن)و یەك دوانێكی دیكەش ڕێژەی بەرانبەر (نان‌خۆر ، باربەر) یان نییە چونكە لە مضارعدا هەموو كارەكە دێتەوە و دەگوترێ (دەبەستم ، دەپەستم ، دەپەرستم) . كەچی لەفیعلەكانی دیكەدا دەگوترێ (دەخۆم دەكەم ، دەبەم ، دەكوژم) . ئەم شێوە كورت كراوەیە دەبێتە هۆی پەیدا بوونی دوو جۆرە ناوی كارا لەو فیعلانەدا .

ئنجا كەگوتمان (هەڵبەستەر) وەك ئەوەیە گوتبێتمان (تێكردەر) لەجیاتی (تێكەر) وەیا (نان خواردەر) لەجیاتی (نان‌خۆر) .. هتد . لەبەر ئەمە وەها بەڕاست دەزانم لەو كارانەی كەمضارعیان كورت نابێتەوە ڕێژەی (خواردوو ، كردوو ، گوتوو ..) بەكار بێت و بگوترێ (هەڵبەستوو - نەك هەڵبەستەر) . كەویستمان ڕێژەی كارای لێكدراویان لێ وەرگرین بڵێین :

خوا پەرست

بەر بەست

قتوو پەست

دەنا تووشی (خوا پەرستەر ، بەر بەستەر ، هەڵبەستەر ...) دێین .

لیژنە لە لاپەرە (64)دا بەشێوەیەكی گشتی (بۆ سەیركردنی ڕاڤەی هەڵبەستەكانی نالی) خوێنەر حەواڵەی لێكدانەوەی مامۆستا مەلا عەبدولكەریم و كاك فاتیح دەكات ، لەوەشدا كاغەزی سێی بۆ ئەو لێكدانەوەیە ئیمزا دەكا . دەزانین كەس نەهاتووە سەرلەبەری دیوانی نالی شەرح بكات وەك ئەو دوو بەڕێزە كردوویانە ، خۆیشم چەندی گرفتم بووبێ لە ڕاڤە كردنی بەیتێكی نالی پەنا دەبەمەوە بەر ئەو كتێبە ، خزمەتەكەشیان بە ئەدەبی كوردی لەلای هەموو قەدرزانێكەوە جێگەی سپاس و منەتباری و بەگەورە گرتنە . بەلام لەگەڵ ئەوەشدا ، تەواوی هەر بۆخوایە . وا لێرەدا چەند نموونەیەك

دەهێنمەوە لەو بەیتانەی کە ڕاڤەیان لەوکتێبەدا پێویستی بە
مشتومال هەیە لەلاپەڕە (352)دا ئەم بەیتە سەیر بکە :

وەرە تــا عــالەمـــی قـــەلبـت نـیـشـــان دەم
کــەوا فـــەقـــری غـیـنـــایـە مـــردنـــی ژیـــن

لەشەرحدا (عالەمی قەلب) بە عالەمی دڵو خۆشەویستی
لێك دراوەتەوەو هیچیتر ، کەچی ئەم عالەمەی قەلب هەرای
ناوەتەوە لەبەر زۆر واتایی :
عالەمی قەلب ـ عالەمی دڵ
عالەمی قەلب ـ عالەمی چرووك «قەڵب»
عالەمی قەلب ـ عالەمی وەرگەڕاو (وەرگەڕان)
هەرسێ جۆریش لەگەڵ (فەقری غینایە مردنی ژین) ڕێکن .
لەبەیتی دوای ئەمیاندا کتێبەکە وشەی (تێدا)ی هەڵبژاردووە ،
لە پەراوێزدا دەڵێ چـەند نـوسخەیـەك (تیا)یـان نووسیـوە ،
ئەمەشیان ڕاستە چونکە (تێدا)بەیتـەکە وەهـا تەنبـەڵ دەکا
بەلای لەنگییەوەی دەبات :

تـێـدا ئــومــمـیـدو بـیـمو گــریـەو و ســۆز
تــیـا ئــومــمـیـدو بــیـمو گــریـەوو ســۆز

**ئـاشکرایـە (تیا) شیـرە خۆرەی بـەیتەکـەیە . نـالی بـەپێی
داخوازی کێش و مۆسیقا (تیا) و (تێدا) ی بەکار هێناوە وەك
لەم دوو نموونەیەی خوارەوەدا دیارە :**

**پەچەیی پەرچەمی بوو پرچی سیا
هەر دەڵێی مانگە شەوە کوللی تیا
یەعنی ریاضی رەوضە کە تێدا بەچەنددەمێ
مشکین دەبێ باکاکوڵی غیلمان و زوڵفی حوور**

لەلاپەڕە (340) دا سەرەتای (مەدحی تاقمی مومتـازی شاهـ)
کەدەڵێ :

ئەم تاقمە مومتازە کەوا خاصەیی شاهن
ئاشووبی دڵی مەملەکەت و قەلبی سوپاهن

لەڕاڤـەیدا نـووسراوە (تێکـڕای پارچـە شیعـرەکـە وا
ئەگەیەنێ هەڵەیە .. ) لەڕاستیدا بەیتەکە شاکارێکە بۆخۆی :
1 ـ ئەم تاقمە مومتازە ئاشووبی دڵی مەملەکەتن . ئنجا ئەگەر
مەملەکەتەکە سلێمانی بێ ئاشووبەکە هی خۆشویستن و
پێوە شەیدا بوونە . ئەگـەر مەملەکـەتی دوژمن بێ دیارە
ئاشووب چ دەگەیەنێ .
2 ـ ئەم تاقمـە مومتـازە قەلبی سـوپاهن . جـاران لە سپادا
مەیمەنەو مەیسەرەو قەلب هەبوو . ئەم تاقمە قەلبەکەن کە
جەرگەو کۆڵەگەی سپان و بەدەوی سەرکردەوە دەوەستن .
3 ـ ئەم تاقمە مومتازە ئاشووبی قەلبی سوپاهن . لێرەدا قەلبی
سوپاهـ هی لەشکری دوژمنە .
نـالی بەمـەهارەتـە لەحەد بـەدەرەکەیـەوە هاتـووە بۆ
(مەملەکەت) وشەی (دڵ) ی إضافە کردووە بۆ (سپاهـ) یش
وشــەی (قــەلب) ی ضــافــە کــردووە چــونکــە لەزاراوەی
عەسکەریدا (قەلب) بەکار هاتووە هەرچەند لەواتـادا هەر
دەکاتەوە (دڵ) بەم دوو وشەیەی (دڵ ، قەلب) عـەسکەری و
مەدەنی گرتۆتەوە کە ئەوانیش لە دوو وشـەی (مەملەکـەت ،
سوپاهـ) دا دەر دەکەون .
لەلاپەڕە (342) بەیتی ژێرەوە هەیە :

صـەحـرا بـەتـەجـەللی دەکـەنـە وادیـی ئـەیـمـەن
قـامـەت شـەجـەرو مـەظهـەری ئـەلطاف ئـیـلاهـن

**لە ئاستی وشەی ئەلطافدا هەر ئەوەندە نووسـراوە کە
لەهەندێ نوسخە دا وشـەی (انوار) هـاتووە . ئێمـە ئەگـەر
مەهارەتی نالی بکەینە سەر پشك لەو دوو وشەیەدا بێ گومان
(انوار) ئەسڵییە ئەویش لەبەر هۆیەکی زێدە بنجی : (انـوار)
ڕیشە کۆی دوو وشەیە : (نور ـ بەواتای ڕووناکی)و (نور منەوەرە
بـەواتای غـونچە) . ئنجـا کـە واتـای (نـور ـ ڕووناکی) لێ
وەربگرین ، بۆ (تەجەللی) دەچێتەوە کە دەزانـین لە قورئـاندا
باس کراوە نوری خوا لە درەختێکەوە تەجەللی کردبوو . ئەگەر
واتای (نەور ـ غونچە)ی لێ وەربگرین ، بۆ درەخت دەچێتەوە .
وشـەی (ئەلطاف) بـەیتەکـە ڕووت دەکاتـەوە لەو سـامـان و
ئـاراییشتەی وشـەی (ئەنـوار) پێکی دەهێنێ چـونکـە ئـەو
(استخدام)ەی لێ دەستێنێتەوە ، وەك بزانم ئیستیخدامەکانی
نالی بێ مانەندن و قیاسی ناکرێ لەجیناس و تەورییەو ئەو جۆرە
هونەرانە .**

**بگەڕێینەوە بـۆ لاپەڕە (257) سـەیرێکی ڕاڤـەی بەیتی
خوارەوە بکەین :**

**دەس بـەنـدیـیـانـە دێـن و دەچـن سـەروو نـارەوەن
صـاحـیـب کـولاهـو سـایـەوو بـەرگـن وەکـوو مـلووك**

لەواتای (دەس بەندییانە)دا شەرحەکە (دەست گرتنی هەڵپەڕکێ)ی پەسەند کردووە ، بەڵام واتایەکی دیکەی هەیە (دەس بەستراوانە)یە کە وەصفی ئینسانی بەستراو دەکات . نالی بەم وشەیە وەصفی درەختەکان لە دوو ڕووەوە دەکات : یەکیان ئەوەیە کەدێن و دەچن بە شنەی باو دەستی یەکدییان گرتووە وەکوو ڕیزی شایی . بەڵام ئەو درەختانە (دەست بەستراوانە) دێن و دەچن چونکە درەخت بەزەویەوە داکوتراوەو بەستراوەتەوە . جان پۆڵ سارتر لەوەصفی پەرژینی باغدا شتێکی وەك ئەمەی نالی گوتووە ، لەعەرەبی‌دا خوێندوومەتەوە دەڵێ : كانت اشجار السياج حركة خضراء كبيرة مسمّرة . واتە (درەختەکانی پەرژین جوولەیەکی سەوزی گەورەی داکوتراو بوون) .

لەلاپەڕە (440) بەیتێك نووسراوە :

دنـیـا بـووە بـەتـاوەوو صـەحـرا بـەژیـلەمـۆ
دنـیـا دەڵێن کـە ئـاگـرە مـاری سـەمـەنـدەرە

لە پەراوێزدا ئیشارەت هەیە بۆ ئەوەی کە لە هەندێ نوسخەدا لەجیاتی (دنیا) کەی سەرەتای نیوە بەیتی دووەم وشەی (دەریا) نووسراوە ، ئەمەشیان جێی خۆیەتی چونکە دووبارە کردنەوەی دنیا لەوشوێنەدا بێ‌لزوومە ، دەریاش دەبێتە تەواو کەری دنیابە صەحراو دەریایەوە ئەوەندەش گەرمە لەو ڕۆژەدا وەکوو ئاگری لێ هاتووە . (دەریا دەرروونی ئاگرە ، ماری سەمەندەرە) .

لەئاست وشەی (سەمەندەر)دا نیشانەیەکی پرسەك (؟) داندراوە یانی واتای نادیارە . ئەم وشەیە (سمندر ، سمندل)ی هاتووە . وشەیەکی ئەفسانەیی‌یە بەو مارە دەڵێن گۆیا لە ناو ئاگردا دەژیت . لەطافەتەکەشی بەوەدا خەست دەبێ کە ماری سەمەندەر لەئاوی بەحردا بژیت دیارە بەحرەکە هێند گەرمە لەگەرمای وشکایی تێپەڕ کردووە وەك دەشبینین لەبەیتەکەدا صەحرا ژیلەمۆیەو دەریا ئاگرە ، ئاگریش لەژیلەمۆ گەرمترە .

لەلاپەڕە (489)دا بەیتی ژێرە وە هەیە :

لەصـەدجێ کلکی ئوشتـر گەیـیـە ئەرضی مـەهلەکـە هێشتـا
یـەمی فـەجی عـەمیقی ئـالی هـەر بێ قـەعـرو پـایـانـە

وشـەی (ئاڵ) لەشـەرحی بەیتـەکەدا هـەر ئـەوەنـدە جێگەیەی بۆکراوەتەوە کەدەڵێ (کەچی هێشتا دەریـای شینی ڕێگای دووری ...) بەو پێیـە واتاکـەی بەڕەنگی (شـین) لێك دراوەتەوە .

ئەم وشەیە (ئاڵ) نییە (آل ـ ئال)ی عەرەبییە کە بەواتای (سەراب) دێت . هەر ئەم وا یەشە مناسبی سەحراو بەحربێ چونکە سەراب دیاردەی سەحرایەو وەکوو ئاویش خۆی دەنوێنێ .

گـەییشتنی کلکی وشتـریش بـەزەوی ، وەك بـزانم ، کینـایەیـە لەمردن چـونکە وەهـا زانراوە کلکی وشتـر لەبیخ بـوونیش‌دا ناگـاتە زەوی . ئنجـا دەمێنێتەوە وشتـر بمرێ و بکەوێتە سەر تەنیشت چونکە بە زیندووەتیش پاڵ نادا تەوە .

پێی نـاوێ چی‌دیکە نمـوونەی ئـەوتـۆیی بهێنمـەوە ، مرازیشم لەو سەرنج ڕاکێشانـە ئەوەیـە بڵێم حەواڵە کـردنی خوێنەر لە لایەن لیژنەوە بۆ ئەم شەرحە نابێتە بەڵگەی تەواوی و بێ‌کەلەبەری‌ی شەرحەکە ، دیارە ڕیـزی لیژنـە بۆ شـەخسی مامۆستا مەلا کەریم کەمامۆستای هەموو ئێمەمانانە سەنەدی سپی پێ ئیمـزا کـردوون . ڕێشی تێ‌دەچێ کـەئـەوەنـدەی شـەرحـەکـە بـەدەستییـەوە داوە ، بـەلای نـووسـەری پێشەکیەکەوە ، ئەوپەڕی واتای شیعرەکانی نالی بێ ؛ ئنجامن دەمەوێ بڵێم جارێ بەکەس نەکراوە بگاتە بنی دەریاو ئەوپەڕی ئاسۆی واتـاکانی نـالی . توێـژینەوەیـەکی بەراوردی بکـرێ لەنێوان شیعری نالی‌و هی شاعیری زمانەکانی دیکـە لەتاکـە مەیدانی (استخدام)دا مەعلووم دەبێ نالی جۆرێکی استخدام بەکار هێناوە گەلێك بەولای مەبەستی وشەکەوەیەو بە خەیاڵی زاناکانی بەیان‌و بەدیعدا نەهاتووە . وشەو تەعبیری وەهـای هەیە لەچەقی دائیرەوە چەند تیر بەڕێ دەکا بۆ ئامانجی جودا جودا ، هەر بەڕێوە کینایەو تەورییەو جینـاس دەپێکی‌و سەر لەنوێ استخدام لەو فنـوونەوە هـەڵدەستێنێتەوە هـەمووشی بەلووسی‌و بێ‌گرفت .. بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا کە شـەرحەکـە پێـویستی بە تـەواوکردن هـەیەو زۆر خـۆی لە قەرەی ئـەو استخدامانە نەداوە هەر دەڵێم کەس نییە لەوانەی شیعری نالی دەخـوێننەوە قـەرزداری شەرحـەکە وەیـا موحتـاجی نـەبن

بەڵگەشم لەوەدا بەر لەهەموو کەس خۆم کەوا گەلێك پێوەی سوود مەند بووم . ماوەتەوە بڵێم پێویستە لەڕووی وەفاکاری بۆ حەقیقەتو بەنیازی حورمەت گرتنی مێژوو ئاشکرا بێ کە بەشێکی گرنگی شەرحی دیوانەکە ماڵی حەلاڵی سەربازی نەناسراو ، کاك محەمەدی مەلا کەریمە : لەو ساڵەی 1976دا من لەکۆڕی زانیاری کورد وەکیلی سەرۆك بووم و ئاگادارم کاکە حەمە چۆن هەفتەهاو مانگەها خەریکی توێژینەوەو پرسینو گردو کۆیی بوو بۆ ئەم کتێبە . هەر لەبیرمە ڕۆژێکیان دوای دەرچوونی کتێبەکە ، کە هەر خۆی سەرپەرشتیی لە چاپ دانی کرد ، بە پەرۆشەوە گوتی ، بەدرەنگەوە زانیوەتی (بوریا) واتای حەسیری هەیە ، ئەگەر زووتر ئەمەی زانی بایە ، لەشەرحی (ڕیشەکەی پانو درێژی بۆ ڕیا خزمەت دەکات)دا ئیشارەتی دەکرد کە (بۆڕیا) بە ڕێنووسی کۆن دەشبووە (بوریا - بووریا) بە واتای حەسیر .. شاڵلا بەم قسەیەشم کەسم نەڕەنجاندبێ چونکە کوڕو براو باوك هەمیشە بە شێری یەك بێشە دانراون .

دوایین قسەم ماوە لەبارەی ئەنجومەنەوە : خوا خێری بنووسێ ، هەڵەیەکی خۆمی بۆ ڕاست کردمەوە . من وام دەزانی شێخ ڕەزا گوتوویەتی :

**«خۆی کرد بەنێرە تورکو لێمی خوڕی کیم بلیر سزی»**

کەچی لەئەنجومەندا دەرکەوت کەڕاستیی بەیتەکە ئەمەیە :

**«خۆی کرد بەنێرە تورکو گوتی کیم بلیر سزی»**

من لە هیچە دووبڕگەم بۆ بەیتەکە زیاد کردبوو . ئەمما دەبێ بشڵێم من دیتوومە نووسراوە (خۆی کرد بە تورکو لێمی خوڕی کیم بیلیر سزی) بەحرەکەشی تەواوە . دیارە من هەردوو شێوەم لێ تێکەل بوون .

لەزەمینەی هەڵەی خۆمدا : مامۆستا جەمیل ڕۆژبەیانی بەتەلەفۆن پێی گوتم لەنووسینێکمدا گوتوومە وشەی (ئاش) لە (ئاشیانە)دا بە واتای هێلکەیە کەچی فەرهەنگەکانی فارسی هەمووی دەڵێن (ئاش) بە واتای تەیرە . زۆرم سپاس کرد بۆئەم پەرۆشەی ، بەڵام قسەیەکیش بۆ دز بکەم :

لەو باوەڕەدام کە دیتوومە لەکتێبێکی فارسی نوێ ، لەوانەی توژینەوەی زاناکانی ئەوروپا لەبارەی زمانە کۆنەکانی ئێرانەوە باس دەکەن ، (ئاش) لە کۆندا بەهێلکە گوتراوە ، تەنانەت کەئەمەم خوێندەوە بەبیرمدا هات وشەی (ئاش) نزیکە لە (هێك)ی کوردیو (egg)ی ئینگلیزی . گەڕامەوە بۆئەو کتێبە فارسیانەی لەبەر دەستمدان . تەنها سێیانم لێ چەنگ کەوتن 1 - کارنامك اردشیر بابکان 2 - فرهنگ ایران باستان 3 - مزدیسناو ادب پارسي .. چەند کتێبێکی دیکەی وەك ئەمانەم هەن ، لە گوێزە گوێزی کەلوپەلی ناو ماڵو ڕاخستنو هەڵگرتنە وەی رایەخ کەوتوونەتە قوژبنی ئەوتۆوە بە ئاسانی نایان دوزمەوە . لەنێوان ئەو سێ کتێبەشدا تەنها فرهنك ایران باستان لەبارەی وشەی (اش)ەوە دەدوێتو دەڵێ بەواتای خواردنەو لە بنەڕەتدا لە (ad)ی سانسکریتی وەرگیراوەو خۆی سەرچاوەی (eat)ی ئینگلیزی و (essen)ی ئەڵمانییە ، لەوڕیشەیەوە چەند وشەیەك ماوەتەوە وەك : کرگس کەبریتییە لە دووکەرت ، یەکەمیان (کەهرکە) بەواتای تەیر ، دوەمیان (ئاسە) بەواتای خواردنو دەبێتە (تەیر خۆر) . وشەی (ناشتا - بەواتای خورێن ، کوردیش دەڵێ (لەناشتا) ئەویش لە (نا)ی نەفیو (اس)ی خواردنەوە هاتووە دەبێتە (نەخۆر ، بێخواردن) . هەروەها وشەی (ئەسپەست) بەواتای (خۆراکی ئەسپ) کە ئێستا یۆنجەی پێ دەڵێنو لە سوریانی بوّتە (پەسپەستا)و عەرەب کردوویەتیە (فصافص) . فەرهەنگەکانی فارسی وەکوو (برهان قاطع)و هی نویتریش ئاگایان لەو تەرزە توێژینەوانە نییە چونکە کاتێك ئەوان دەردەچوون جارێ زاناکانی ئەوروپا نەکەوتبوونە سەر لێکۆڵینەوە لە مێژووی کۆنی ڕۆژ هەلات ، بە درەنگە وەش نووسینەکانیان بەناو وڵاتانی ڕۆژهەلاتدا بڵاو بوونەوە . بەهەمە حاڵ ئەوسێ کتێبە بەلای ئەوەدا ناچن کە ئاش بەواتای تەیربێ . ئنجا دەشێ من وشەکەم لە کتێبێکی ئەوتۆییدا دیتبێت دەنا دەبێ بەسەهوو لە جیاتی (مرغ) چاوم (تخم مرغ)ی خوێندبێتەوە چونکە وەك (فرۆید) دەڵێ زۆر جاران مرۆڤ شتێك دەبینێ وەیا دەبیسێ بەو جۆرە لەدڵدا پێی خۆشە ..

مامۆستا جەمیل ڕۆژ بەیانی هەر لەو تەلەفۆنەدا نیمچە هەڵەیەکی دیکەشمی بۆم باس کرد کە من لەگوتاری (دساتیر)دا ڕستەی (راهرا از چاهـ بدانیم)م بە (ڕێگە لە زیندان بناسینەوە) تەرجەمە کردووە لەجیاتی (ڕێگە لە چاڵ بناسینەوە) . هەرچەند (چاهـ) بەواتای زیندانیش دێت بەڵام لێرەدا بەجیرانەتی (راهـ - ڕێگە) دیارە مەبەست لە (چاهـ) قوڕتو چاڵە . سپاسم بۆ مامۆستا .

# قۆزاخەی خەنێنیەکانتان بۆ ئەم خەڵقە سەرەواڵا دەکەمەوە

* عەبدولکەریم عەبدوڵڵا *

کەرکوک 1982

هەموو بڕۆن بەجوتیاریٚ دانا بڵێن
گەر نەمامیٚ بچێنێت و پەروەردەی کات
بەری تاڵ بێت ، چی لیٚ ئەکات ؟
ئەی نەمامەکانی دەوروبەر
چی لیٚ ئەکەن ، ئەیبڕن یا
لەڕەگەوە ئەیسوتێنن ؟

(1)

بەبارتەقای رووناکی هەموو چراکان
ڕەشی هەموو تاریکیەکانی
ووشەی تە یسماوی ئەوان
بەهاژەی ئاوی رووباریٚ ناگۆڕمەوە
چونکە ڕووبار لەبوونیەوە ، تا ئەبەدی
دلداری سەر ڕاستی خاکەو بیٚ ئەو
ناژی

(2)

ئێوە هەموو ، وەکو پاییز
دبەرەتان شومە
ملیۆنەها گەلای تەڕو کەسکی باوەڕ
ئەوەرێنن
ملیۆنەها وشەی ڕاستی ئەخنکێنن
ئێوە عەشقتان ،
وەك دەلاقەی زیندانەکان بەری تەنگە
چرای دەستی کوێرەکانە خۆی نابینێت
ئاهی وەرزێکی نەزۆکەو
بەسەر کێڵگەی تەمەنما دێت
بیٚبەزەیی وەك دڕندە
گوڵە ئاڵ و سوورەکانم دەپرووکێنێت
ئێوە عەشقتان
وەکو لاستیك ، بەگۆڕانی گەرماو سەرما
دەکشێت و دێتەوەیەك
ئێوە کۆرپەن ،
عەشق جۆرە یاریەکە ـ وەکو هەڵماتێن ـ لەلاتان .

(3)

دڵت زەلکاوێکی رەشەو
خوێنی سەری هەزارەها ووشەی ڕاستی
تیاڕژاوە ،
هەزارەها ملوانکەو گەردانەی ئاڵی

تیابڕاوە
کێ بێ وەك بۆت تیاهەڵ کاتو
ئارام بگرێت

(4)

بۆ کڵۆڵی عەشق گریام
تێر .. تێر گریام
چوون هەموو کەس لەدەرگاکەی
دڵی دەدات
خۆی وەك بزمار وەکو چرێش
بەڕوومەتی سپیەوە دەلکێنێت

(5)

رووبارێکم جەستەم پڕی نهێنییە
ئێوەش وەکو باڵندەی سەرگەردان
بەپانایی‌و درێژیما دێن‌و دەڕۆن
دەتانەوێ لەقۆزاخەی نهێنیەکانم تێبگەن
بۆیە ڕیگای قات‌و قڕی دەگرنەبەر .

(6)

تۆو ئەوانەی وەکو تۆوان
ویستتان کۆتری باوەڕم بتۆرێنن
هێلانەکەی لەبیر بکات
بەلام نەتۆو نەئەوانیش
نەتان توانی تەنیا پەڕێ
لەباڵی کۆترە سپی‌یەکەم بکەنەوە .

(7)

چوون دڵی من شەیدای خاك‌و دارستانە
شەیدای خەندەی نیشتمانە
شەیدای گۆڕی کۆرپەکانە
هەر بەوانیش قەسەمی خوارد
تالەسەر لووتکەی بلندی ئاوات نەبێت
نەنشێتەوە هەر بفڕێت .



شعر : نزار بەزاز

ئۆ خەلکێ باژێرێ جانێ
کی دزانت مالا وێ کانێ
چ یێ بدەتە من نیشانێ
دێ دەمێ ژعەمری سالەکێ ..



ژبەروێ دێ قوتم خڕ دەرا
دێ ڕاوەستم لبەر پەنجەرا
دێ گرم ڕێکا پرچ زەرا
بەلکی ببینم رۆژەکێ ...



یا ئەز لێ وگەڕم ژێ نینە
تلو گەردەن کەڤە ڕینە
هەر دوو روینێت وێ عەینینە
بەژن جلنیا ریحانەکێ ....



هەمی وەختا وێ بورینم
چاڤێت خو لڕەخا گێڕینم
بەلکی جارەکێ ببینم
تەد ناهێلم کولا نەکێ ..؟



● بدرخان سندي ●

پێشکێشبت بۆ بزاڤا شریف پاشای‌یێ کو خازناما مللەتێ کورد پێشکێشی جڤاتا مللەتان کری پشتی بدویماهی هاتنا شەرێ جیهانی‌یێ ئێکێ ...

ئەی فەلەك بوتە دنالم بوچي نێرگز چرمسین
ئەوچما بەختێ مە هویە هەر بێ دوستو بێ کەسین

ڤەت دێهێت ئەو روژا مە دڤێت کەهنیاواری بزێت
ژێ ڤەخوین دەستا بهەلینین ژێ ڤەخوین چەند مەبڤێت

ئاگرێ سارو ڤەمری چاڤ مەلێیە گەشبیت
ئەو بوهارا تێهنێ کوشتی دارم خوشببت

کوردینو رابن ببینن بەرخەکێ ژارو زەعیڤ
دانەبەر پالوکێشانا خەنجەرەك دژوار لدیڤ

ئەوێ وەرێس تێ ئالاندی هەر ژ هریا بەرخی‌یە
پێ دکێشن سەربرینێ بوی وەریسی نوخی‌یە

مەزنا زمێژە واگوتی دوژمنێ سەرێ خو کەو
دار بداری تێت بزینێ دەستکێ بڤری دارە لەو

نێ مەنالینە ژبڤری سەد هزار جارا هەوار
ئەم بوی بڤری کەتینە هند نەساخو بریندار

نێ مەنالینە زمێژە بو حەتاڤەك روهنو گەش
داوەتی رابن سەمایێ پیچ بکەن بەربەرێت ڕەش

ئەڤرو کانێ لمن وێ روژی پر ژ خوشی‌و ڕەنگە رەنگ
ڤەبکوهێزن بویکا کوردا ئەو تورینا شوخو شەنگ

کانێ‌کەو بوچی ناخوینن کانێ وارێ گول گولی
لێ دچەرینن گورکو ریڤی بوشە لێ مارو کولی

کانێ مزگەڤتا مەتێدا سەد نڤێژ روژی کری
کانێ دارکیزا تیدا شین کیزە تەڕ مە ژێ کری

کانێ ریبارا پر بزاڤ کانێ پێلێت هیڤی‌یێ
کانێ بێری کاشڤان گەش بکن کوردینی‌یێ

کا گەلاڤێژا مەدیتی وەختەکێ زێرین بژار
لەو مەگوتی هندە ئێدی هەردێ مینت ئەو بوهار

باخچەیێ ڤینا نەمایی کێ وەکر کافل ببت
تورینا بەختێ مە ئەڤرو کێ وەکر زیزو سل ببت

ئەڤرو کانێ لمن وی روژێ پر ژ خوشو رەنگە رەنگ
ڤەبکو هێزن بویکا کوردا ئەو توینا شوخو شەنگ

دابیبنم کچو لاوان مل بمل بێنە شاهی‌یێ
بژکینم کولو ئێشا لبەر حەتافا شاهی‌یێ

دابهەلینم ژ کوردا ئالا سەرچیایت پڕ ژ خوین
داهاوارکم ژدلێ سوتی هەربژیت سەربەستو ژین

نەگونە هونە شەرمەژیك گەر مەژی ئالا هەبت
نە ئومێدەك کویرو دویرە باوەری بسالا هەبت

دێ ژ کلوخێت وان شەهیدا ستینەکێ دریژ ڤەدم
پێ ڤەکم ئالایێ کوردا دابگەهت طاڤا گەرم

بێژمە خەلکێت ڤێ جیهانێ ناڤێ کوردا ژی هەیە
کی دێ شێت ناڤێ مە تێك دت هندی کو رێبەر هەیە

ئەڤرو کانێ لمن وێ رۆژێ پر ژ خۆشیو ڕەنگە ڕەنگ
ڤەبکوهێزن بیکا کوردا ئەو تورینا شوخو شەنگ

بگرنژینم بەچکە شێران ئەو هەلالو ئەو رحان
بزو زاروکێت شەهیدان ئەو کولیکێت چ نەزان

بێنە هێزکی لناڤ چناران خەڤکو داڤێت خو ڤەدن
کێلو ڤێلا بچکلینن بێژنە ئێك دوو خو ڤەدن

بێژنە شالیلو نڤیرکا وەرنە هێلینیت بەرێ
وەرنە سەر گولبو چەڤێت خو بخوینن ڤێ بەرپەڕێ

بەر پەڕا ژینامە یا نوی ئەو ژیانا دیر ژ ژان
دیر ژ سالسکی و ریمەتی سەر فەرازی بوشیان

کوترینو دادن ژ دادێ بو خودێ دادێ نەکن
ئاهرەمەن ئەڤروکە پیچ بی سەد تلیلی بو ڤەدن

● غازی ئاکرەیی - هەڤلێر ●

تاریێنێ رۆناهییا چاڤێت منی
جانێ سۆرە خوینا ناڤ دلێ منی
تو رێبەرا ژینو ئەڤینا منی
شرینا من ل دنێ بویکا منی

× × ×

لێهاتی ل ڤی کاتی غەیری
دلێ تژی ئەڤین بۆ سارڤەکری
ئەو دلێ من بۆ تەیێ ڤالا کری
ئێزا ئیرۆ کچێ کێ تو ژ من کری

× × ×

نێ جانا من بشکوژا ناڤ بهارا
نە بشکڤت ژبەر ساری‌یا خویسارا
ئەو دەرمانێ برینا ئەڤیندارا
ئارمانجو ڕوکەها هەمی دلدارا

× × ×

ئەوبو گولا سپی دناڤ بیستانا
ئەوبو پەری‌یا دگەل بێری‌ڤانا
ئەوبو هیڤی‌یا ناڤ کۆما ژڤانا
ئەوبو خۆشی‌یا سەر خەمو کوڤانا



ئەوبو چاڤ ڕەشا بسك گوولی
ئەوبو هەر نەیارا دەرمانو کلی
ئەوبو کولیکا مێرگا کوردستانی
ئەوبو دیوانو پەیڤێن ئەحمەخانێ

× × ×

ئەو بو رۆناهییا ل تاریستانێ
ئەوبو کەڤی‌یا بەفرێ ل کویستانێ
ئەوبو ڕەنجکێشا ب دلێ خۆ هاتی
ئەوبو لەپ زێرینا خودان کەلاتی
ئەوبو زەری‌یا وەلاتێ بکێرهاتی

× × ×

ئەوبو نێرگزا خوناڤ بسەرهاتی
نێ ئەوبو هەیڤا چاردە دناڤا شەڤا
نێ ئەوبو کەوۆکا من دگەل ڕەڤا
نێ ئەوبو هەمی گاڤا پەیڤا سەردەڤا
نێ ئەوبو ئاڤو لێلاڤا ناڤ تەڤا

× × ×

ئەوبو زین ئەژی مەمێ ل زیندانێ
ئەوبو شرین ئەز فەرهادێ لناڤ ژانێ
ئەوبو لەیلا ئەز مەجنونێ ڤێ جیهانێ
ئەوبو خەج ئەز سیامەندێ وێ سیهانێ

گیانە چۆن هەڵدێ بینایم
ئەبینم هێندە ناسازی
دڵە کاخۆشی دونیایم
ئەڵێی بازێکی بێ نازی
لەناو جێگای ماتەمینی
لێو بەبار زەرد هەڵ گەڕاوی
پێڵوو نووستوی دڵ غەمگینی
لەچوار چێوەی ژوور داماوی
لەتاو دیمەنی شێواوت
گوڵە ، خنکاوی خوێناوم
لە ناڵەی جەرگی سووتاوت
بەجاری ویڵو سووتاوم
چاوەڕوانی مژدەتم دەی
بۆم هەڵبڕە سەری کاست
سەرم داناوە بۆ مژدەی
هەواڵی باسێکی خاست

● علي صالح ميران ●

شقلاوە ـ 1982

سەراب

ئەی خانمە دڵ ڕەقەکە
کە سەیری ڕابوردوو ئەکەم
لەگەڵ هەموو سەرنجێکا
بە ئەنجامێکی نوێ ئەگەم
تێ ئەگەم کە درۆزن بووی
لە کردارو گفتوگۆتا
درۆزن بووی لەگەڵ منا لەگەڵ خۆتا
تێ ئەگەم کە
چەندساڵی دوورو درێژە
بەشوێن سەرابا ڕائەکەم
کەچی هێشتا خۆشم ئەوێی
هێشتاکوو هەر بیرت ئەکەم

فەرمیوون عەبدول بەرزنجی
سلێمانی ـ زستانی 1983

## کچێ هاوڕێم

محمد مولود فتاح

ئەگەر هاتوو شیعرەکانم بۆ تۆ نەبوون بیان درە
گەر ئەزانی حەزەکانم بۆت ناڕوانن سەریان بڕە
کچێ هاوڕێم چ دڵێ واوەك دڵی من بۆتۆ سووتا ... ؟
بارگەی ئەوین لەکوێ بخەم کەدڵی تۆ ساردو سڕە !

* * *

پێنووسەکەم تا کۆتایی تەمەنی خۆم ئەخەمە کار
گوڵی هۆنراوەی پێ ئەچنم لەسەر ئاسۆو لەناوبنار
بۆ ئازیزێك .... بۆ ئەو کەسەی تاکو ئێستاش لەمن ناگا
منکەیلچیم! کەیلی ئەوەم لەدەست دەرچێ وەك ئاوی
پار!

* * *

لەوکاتەوە تۆم ناسیوە چاوی خۆشیم لێك نەناوە
ئاوازی غەم بۆناوگەرووی دڵەکەی من وەك لێشاوە
نەشمیلەکەم جگە لەتۆ تاکوئێستاش بڕوا ناکەم ....
بۆ کام نەسرین، بۆکام دیمەن شیعرێکی وام کەی داناوە!

* * *

دیمەنی تۆ بۆ هۆنراوەم فەرهەنگێکی مەستو تێرە
مێشکی منیش بەو فەرهەنگە ئێزگەیەکی پەیام نێرە
کچێ هاوڕێم ئەگەر هاتوو خوانەکردە بەجێت هێشتم
لەگەڵ پۆستەی شارەکەتا خواستی دڵم بۆبنێرە !

هشیار رێكانی

# هەڤال هێل و هەڤال كێ ...

جلێ زفستانی یە ، شەڤەكا تارستانە ، باران و بارۆڤەیە ، سەرماو سرەكاتوندە ، زێمار دگەل هەڤالێن خۆ ژكاروانی ڤەد گەریانەڤە ، نێزیكی گوندەكی بوون رەوینا سەگا ژگوند بوو ، دەما كاروانێ یابهیستی ، زانی كو گورگ و دەهبەیێن هاتینەوێ دەڤەرێ و سەدا سەد رێكاوان یالێ هاتی یە برین ، وزانی دەرهەق نائێنە دەر ، ڤێجا بهەڤدوورا پەیڤین و دان و ستاندن كرن و گەهشتنە سنۆرەكێ ، بریاردان رێكاخۆ بڤە كو هێزن ، ئەڤجا خۆژرێكێ ڤەدەركرن و چۆلبر چوون ، پێ ڤەد یەشن ، بكوتەكێ خۆگەهاندە دانگاگەلی یەكێ كوێر ، بریاردان كوبێهن ڤەدانەكا كورت ڤەدەن ، ڤەدەوارێن خۆبقورمێن داراڤە گرێدان و راكهەڤتنە وێرێ ، ژسەرماو سرێ داو لبەر تاڤێین بارانێ وەلی هاتبوون خۆل سەرێن خۆ نەدگرتن ، لێڤێن لێ دلەرزن ، پۆندكێن ژچاڤێن وان دپەشن ، ددانا لێ قرچە قرچە ، داڤا زوهابجلكێن وان نەمایە لێ بچ رەنگێ هەی خۆژگورگ و دەهبا رزگاركرن .

زێمار لاوەكێ گەهشتی یە و ئەڤە جارا ئێكێ بوو چوویە كاروانی لنگێن وی یێن جڤابووین ، چاڤێن وی یێن تاری بووین ، گەوری یاوی یاگەهشتی یە ئێك نكارێت خۆزی یا خۆ داعیرێت شەڤ چەندا تاری یە لبەر چاڤێن وی تاریترە ، لێ هەڤالێ وی (شەڤگێر) جار بۆجارێ دەستێ وی دگرت و ژئاستەنگا رزگاردكر ، پشتی بێهناوان پیچەكێ ڤەرەسیای شەڤگێرێ ژكاروانی یارا گووت : برانۆ درەنگی یە رابن چنكو چەند ئەم ڤەمینین دڤێت هند ژی برێكێ بچین ، هەموی كاروانێ بهەڤرا رابوون و دەوارێن خۆ ڤەكرن و دانە پێشی یا خۆو داریكێ ، ژووردانی و ژێهەلی پیڤان ، ژگەلی یەكی بۆ ئێكەدی ، پێ دكەڤرو تەراشا دهەلنگڤن ، وەلێ هاتن ترس ژناڤ دلێ وان رابوو . ـ زێمار ـ جاربۆ جارێ پێ رێزێ ژهەڤ دبزدینیت و دویماهێك یاهندا دبێت و جارەك دی پێ ئێك دهێنە دەرێ ، چاڤێن وی ژخەوا دایێ تۆ قرۆسكا دكەن لێ ـ شەڤگێر ـ پشتاخۆ نادەتێ .

چوون و چوون تاكو نزیكی قویناغا خۆ بوون و راوەستان و بلەپەقوتێ هەڤدوو هژمارتن ، هەڤالەك ژێ كێم دەركەڤت ، ژهەڤدوو پرسین :

كێ یە ؟ كێ نینە ؟ زانی ڤەهێلە ـ چەند لێگەریان نەدیت ، هێشتا شەڤە تاری یە و دوەستیاینە ، ئەگەر ئێك تبلێن خۆ درێژ كەتە چاڤێن مرۆڤی مرۆڤ پێ ناحەسێت .

لدەلیڤەكێ دا هەڤال ـ زێمار ـ كەڤت و نەهشیاربوو لناڤ هەری و كورێ دا جلكێن وی بوونە گلەسۆر ، شەڤگێری رێنالێدانا دلێ وی زانی هێشتا نەمری یە ، دەستی وی گرت و راكێشابن گڤاندەكێ ، ئاگرۆشكەك بۆ هەلكر ، پشتی تێهنا گەرماتی پێ گەهشتی یە لەشێ وی پیچەك خولقاندو چاڤێن خۆ زل كرن ـ شەڤ گێری ـ دەستێ خۆ دانابن پشتاوی و راكرەڤەو یاری یەكێ نانی مابوو دناڤ چەنتكاوی دالێ چ نان ؟ پێ بوویە هەڤیر ژبەر ئاڤا بارانێ ـ شەڤگێری هاڤێتە ددهڤێ ـ زیماری ـ داو فرەكا ئاڤێ بسەرداكرو هێدی هێدی رابوونەڤەو رێنا دەورو بەرێن خۆ كەس نەدیت كاروانی یاهێلابوون ، واناژی ل پەی شۆپا كاروانی یاداریكێ . پێ برێكێ دچن و ل دەمەكی جیهان پیچەك رۆن بووو سپێدە هەلات و تاكو گەهشتینە كاروانی یا رۆژ وەریسەكی ژعەردی بلندبووو كاروانی یائاگرەكێ مەزن هەلكربووو بارێن دەوارا دانابوون و دەوارگرێدابوون و تێشتا وان لبەربووو خەریكی نان خوارنێ بوون ڤێجاژنوی بدروستی بێهنا (زێمار) ی ڤەرەسی یاو دگەل ـ شەڤگری ـ مینا وان كر .

پشتی هەمووی یاتێشتا خۆ خواری و بێهنا خۆڤەدای و جلكێن خۆ زوهاكری ، ڤە هێل ـ ژدویرڤە دیارو بەرەبەرە نێزیك بوو تاكو گەهشتی یە نك وان ، بكەڤ و كورڤە گازندەو تان و تڤەنگ دكاروانی یا وەركرن و گووتی : بابۆ چەوا هەوە ئەزبتنێ هێلامە دناڤ گەلی دا ؟ ماخۆدان و ویژدانەك نەبوو من ژخەو راكەت و من پێ ئاگەهداركەت بۆچوونا هەوە ، پائەگەر دەهب و گورگا ئەز خوار بام هوین داچ بێژنە رویێن خۆ ؟ بخودێ پا ئەگەر شەڤگێر ل ـ زیمار ـ ی نەببا خودان ، ڤێكاڤێ هەستی یێن وی ژی بكور گارا نەدگەهشتن ، ماهەڤالێنی تاكو ڤێ پەیسكانزمە ؟ ...

محمد رشید فتاح

# شەپۆلی گەرما..

گەرماش هێندێجار چەشنی دەریاو ، با ، تووڕە دەبێو ، داخی دڵی خۆی دەرێژێ . ئەونیوەڕۆیە خۆرەکە لەچەقی ئاسماندا ، ستوونی تیشکی سووتێنەری خۆی بەسنگی زەویدا داکوتابوو .

نەك ئەو راستە کۆڵانەی ئەوی پێدا رادەبوورد ، بەڵکوشار وادەهاتە پێشچاو .. کەسی تێدا نەماوەو ، خەڵکەکە لەترسی قامچی سوورەوەبووی خۆرەکە خۆیان شاردۆتەوە .

بۆکارێکی تایبەتی بەو قرچە قرچی گەرمایە لەماڵ دەرکەوتبوو ، گێژو وێڕ دەهاتە پێشچاو ، هەر فریای ئەوە دەکەوت ئارەقەی نێوچەوانو لاجانگی بسڕێو ، لەبەرخۆیەوە ورتە ورتێکی بۆبکات . تابۆی دەکرا بن دیوارەو ، بندیوار ، خۆی دەکوتایە باوەشی سێبەرەکانەوە .

لەپەنادیوارێکی بەرزدا وێستێکی بۆکرد ، ئەو دەمە هەموو بوویەك ، تەنانەت داروبەردی نێوکۆڵانەکەش سوجدەیان بۆسوڵتانی گەورەی گەرما بردبوو .

کەمێ بەدەورو بەری خۆیدا هەڵی ڕوانی ، هەتاوەکە چووبەگژ روانینەکانیا .. هەستی بەوەکرد گەرووی وشك بووەو ، قومێ ئاوی سارد گڕی دەروونی دادەمرکێنێتەوە . بەڵام ئەوەتا کەس بەدەرەوە نییەو ، ئەمیش نایەوێ لەمکاتەدا دەرگای ماڵێك دابگرێتەوەو ، خەڵکی بێدار کاتەوە .

نەیتوانی بەرەودوا بگەڕێتەوە ، دووکۆڵانیتر دەکاتەسەر شەقامەکەو ، ئەوکاتە خۆی دەهاوێتە نێو ئۆتۆمۆبێلێکەوە .. جائۆتۆموبیل کوا ؟.

« ـ دەهەستە بڕۆ ، خۆت دوامەخە ، خۆلەچوڵی قوڵفە گیرت نەخواردووە .. ئەوە ژیانو مرۆڤو ، ئاواییو ، شتەکانیتر ، گەرماش وەك هەمووشتێکیتر پێردەبێو ، لەناودەچێو .. خۆتۆ هەموو رۆژێك وەکو ئیمڕۆ ناکەوێتە نێو داوییەوە !. »

جارێکی دیش بەدەورو بەری خۆیدا هەڵی ڕوانی ، کەسی بەدی نەکرد ؟ نەدەنگێك ، نەرەنگێك ، نەجوولەیەك . لەناکاو وەك شتێك لەئاسمان بەربێتەوە ، روانینەکەی بنە گونیەیەکی خەت سووری دەم بەستراوەوە گیرسایەوە .

« ـ ئا .. ئەی ماوەیەك لەمەوبەر بوئەمەم نەدی ؟!. یا .. نازانم ، لەوانەیە دەمێکبێ لەوێدا کەوتبێ ، کێفڕێی داوە ، دەبێت ئیشی هێندێ منداڵی لاسار بێتو ، بۆگاڵتە پێکردنی خەڵکی دایان نابێت !..

سەرنجێکی قووڵی لەدەرگەو پەنجەرەی ماڵەکاندا ، وای بەبیردا هات .. کاتێك ئەم دەچێ بەلای گونیەکەوەو ، دەمەکەی دەترازێنێ ، کۆمەڵێ منداڵ بەدەم قاقای پێکەنینەوە فرکە دەکەن !. « ـ ئەم بنەگونیەیە چیتیابی ؟. »

لێی چووە پێشێو ، سەیرێکی ئەملاولای خۆی کردەوە ، خەریکبوو دەستیبداتێ ، هەرزوو دەستی کێشایەوە ..

« ـ تۆبڵێی شتێکی خراپی تێدا نەبێتو ، بەسەرو چاویا بتەقێتەوە !. نا .. باوەڕ ناکەم .. ئەی بۆپارە نەبێت ؟!. جاپارە بەم شێوەیە لەچەقی رێگەدا دەکەوێت ؟.. نا .. ئەی چیبێت ؟!. » هەزارو یەك شتی دژبەیەك بەمێشکیا هاتو چوو . ویستی هەمدیس دەستی بۆ درێژ کاتەوە ، بەڵام دیسان دەستی کێشایەوە . لەکەسێك دەترسا ، لەکەسانێك دەسڵەمیەوە ، کەپێی پێبکەننو ، پلاری تێگرن !. مرۆیەکی بەدینەکرد ، گەرماکە هەموو زیندەوەرێکی لەقاوغی متبوونا متکردبوو . « ـ چیبێ ؟. هەرپارەیە ، دەناچییە ؟.. ئەیبۆ وردە واڵا ، یاشتی بێکەڵك ، یاجلو بەرگی کۆنە ، یا .. بەڵام نا .. لەهیچیان ناچێت !. شێوەو قەبارەی گونیەکە ، شتەکەی ناویوا دەرناخەن . دەسا هەرپارەیە .. باوەڕناکەم !.. » راما .. ماوەیەك راما .. ئارەقەی نێوچەوانو لاجانگی لەبیرکردو ، تنۆك ، تنۆك ، بەلاملیا دەچۆڕا . گەرووی وشك بوویو ، گڕی ناوەوەی خۆی بیرچووەوە . لەپڕ وای بەخەیاڵدا هات ، باچش بکاتو ، پڕ بە بنە گونیەکەدا بکاتو ، بیفڕێنێو ، لەپەنایەکدا بیکاتەوە ، گەر پارە بوو ، ئەوا دەبێتە یەك شەوە ، خۆ گەر شتی دیکەشبوو .. ئەوا .. « ـ ئەی گەر ـ شتێکی تۆقێنەر بوو ؟!. » چاوێکی بەمسەرو بەوسەری کۆڵانەکەدا گێڕاو .. هەمووشتێکی خستە لاوەو ، ملی گونیەکەی گرتو ، گوڕی دایەخۆی ، بێئاوڕ دانەوە ، بێ لاکردنەوە ، تیژرەوانە ملی پێوەنا .

گەیشتە کەلاوەکەی ئەوسەری کۆڵانەکە ، بنە گونیەکەی دانا و ، خێرا پەتەکەی دەمی ی ترازاندو ، سەیرێکی تاوەکەی کرد ، زارەترەك بوو ، چەشنی پەیکەرێکی بێ گیان لەجێی خۆی وشك بوو . هەرچی مرۆیەك لەودەمەدا بەدی بکردایە دەم و دەست دەی وت :

( ـ رەق بووەو ، کابرایەکی مۆمیاکراوە !.) دەبێ کێ تائێستا مرۆیەکی مۆمیاکراوی نەدیبێ ؟.. هەیە ، دەیان مرۆی مۆمیا کراو لەم جیهانەدا هەیەو .. کەچی کەس بەدی یان ناکات !.
لەپڕ کابرایەك بەئاگای هێنایەوەو ، وەك تەنەکەیەك ئاوی سارد بەسەریا بکات لێی پرسی : ـ ئەمە چی یە ؟.
ئەویش بێ ئاگا پێی وت : ـ فەرموو سەیری کە . کابراکە دەمی گونیەکەی کردەوەو ، سەیرێکی ناوەکەی کردو ، وەك بەنێوچەوانیا بکێشی ، سەری هەڵبڕی و ، بەتووڕە بوونەوە پێی وت : ـ ئەم ز.ڵفە گوناحی چی یە ؟. بۆ کوشتووتەو لێرەدا فڕێی ئەدەی ؟!.
ئەو راپەڕی ، هەرگیز بەوجۆرە رانەپەڕی بوو .. هێندەی بۆکرا بڵێ : ـ دۆزیمەوە !. چەند کەسێکی تری نێو کۆڵانەکە بەپێر دەنگی بەرزی کابراوە لێیان کۆبوونەوەو ، دەم و دەست گوێیان بۆشتێکی نوێ هەڵخست و هەستو ، هۆشیان بۆ رووداوێکی سەیر ڕاخست .
کابراکە رووی کردە خەڵکەکە .
( ـ ئەم کابرایە .. دەناسن ؟!. )
خەڵکەکە کەوتنە لێورد بوونەوەی .. ئەودەمە ئەو خۆی واهاتە پێش چاو ، کەبەدەستی خۆی تووشی گێچەڵێکی سەیر بووەو ، چەشنی تاوانبارێك لەنێو قەفەزی تاوانباریدا وەستاوەو ، ئەوە دادگای گەرەك موحاکەمەی دەکات و ، سزایەکی هەر بۆ دادەنێن !.
« ـ ئەمەش گۆبەنگی پارە ؟. باشەگەر ئەمە پارە بوایە .. لەبری ئەم تولفە ئێستامن لەچی دادەبووم ؟ . ئەی ئەم خەڵکە هەڵوێستیان چۆن دەبوو ؟. بێگومان کڕنۆشیان بۆدەبردم و ، سەری رێزیان بۆدادەنەواندم .. چونکە خاوەنی بنە گونیەیەك پارە دەبووم !!.. »
کابراکە بەپێش چاوی خەڵکەکەوە دەمی گونیەکەی والاکردو ، وتی : ـ وەرنە پێشەوە .. مەیەڵن ئەم تاوانبارە دەرباز بێت ..
بڕوانن ئەم تولفە ساوایەی خستۆتە نێو ئەم گونیەیەوەو ، هێناوی یەتیە نێوئەم گەرەکەی ئێمەوە فڕێی ئەدات !. توخوا ئەمە موسڵمانە .. ئینسانە ، توخوا هەرچی ئێستا بیکوژێت دەستی سەوز نابێت !.
خەڵکەکە کەوتنە مقۆ ، مقۆ ، یەك دوویەکیان وتیان : ـ جاکێ دەڵێ .. ئەمە منداڵی خۆیەتی ؟. لەوانەیە دۆزی بێتیەوە !.
ئەویش خێرا وەك پشتگیری یەك بەدی بکات . وتی : ـ وەڵلا باوکم من ژن و ماڵم نی یە .. تۆزێك لەمەوبەر لەو کۆڵانەدا دۆزیمەوە .
یەك دوویەکی تر لەتولفە کەچوونە پێشەوەو ، دوای ئەوەی یەوردی سەرنجیان دایە . یەکێکیان وتی : ـ هەرگیز ئەمە لەمناڵی ئەم گەرەکە ناچێت .. چاك سەیری کەن !.
کابراکە دەستی بردو منداڵەکەی لەگونیەکە دەرهێنایە دەرێ .. لەوکاتەدا پارچە کاغەزێك بەپشتی تولفەکەوە کەوتە خوارەوە . دەم و دەست یەکێکی تر کاغەزەکەی هەڵگرتەوەو ، کەوتە خوێندنەوەی .
(ئەوەی ئەم منداڵە بگرێتە لای خۆی ، ناو بەناوێك پارەیەکی مفتی بۆرەوانە دەکرێت ، بەمەرجێك ئەوکەسە لەدایك و باوکی ئەم منداڵە نەپرسێت !. )
دیسان مقۆ ، مقۆ ، سەری هەڵدایەوە .
ـ من دەی گرمە لای خۆم .
ـ من بەخێوی دەکەم !.
ـ جارێکی تریش منداڵێکی وام هەڵگرتەوە !.
ـ هەرلای من دەبێت .. خۆم دەزانم چۆنی بەخێو دەکەم !.
ـ ئاخۆ پارەکە چەندبێت ؟ .
ـ ئەم منداڵە کێ بێ .. تۆبڵێی زۆڵ نەبێت ؟!.
ـ پارەکە چۆن بێت ؟.
ـ هەرمن بەخێوی دەکەم !.
لەپڕ کوڕە لاوێك ئاشی بگرەو بەردەکەی لەگەڕ خست .
( ـ ئەوە بۆوا کەوتوونەتە گیانی یەکتر .. خۆئەم منداڵە زیندوو نی یە . تائێوە بەخێوی کەن . ئەوە بۆلەپێناوی بەرژەوەندی تایبەتی خۆتاندا دەتانەوێ جارێکی تریش دوای کڵاوی بابردوکەون !. ئەویش بەبڕوایەکی نوێوە .. هەنگاوی ناو ، لەبەر خۆیەوە وتی : ـ بەراستی قسەیەتی .

هاوینی 1983




کەگەیشتیتە شارۆچکەکە ، بۆناو دەربەندەکە مابووت . زۆر وەستایت ، مێشکت لەهوورە هەنگێکی وورووژاو ئەچوو . چاویشت کامێرایەکی سرك بوو ، زوو زوو وێنە جۆربەجۆرەکانی ئەگرت و ئەشتەوە .

ئەت ووت بەسەر ئاگرەوەی ، ئاواتت ئەخواست هەر زوو جێیەکە بڕبێت و لێیداو بڕوا جێگەیەکت لەسەر کورسی یەکی پشتەوە لێگرت و پاڵت دایەوەو خستە پەنای خۆتەوە .

شەقامەکە جمەی ئەهات ، ئەم ئەهات و ئەو ئەچوو ، غەلبە غەلبە ئەو ناوەی هەڵگرتبو . هەرکەسێك بەشانی جێیەکەدا ڕەت بووایەو سەرنجی ناو جێیەکەی بدایە لێشاوی ترسێکی زۆری بۆ بەجێ ئەهێشتی . بۆیە تائەهات قین و ڕقت خەستر ئەبووەوە یەکەم لە شوفێری جێیەکە کەوەك پشیلە سەری بەهەموو جێیەکانی تردا دەکرد کەلەڕیزەکەدا وەستابوون ، دووەم لەهەموو ئەو کەسانەی کەئەگەیشتنە ئاستی ئێوەو لەوێدا خاویان ئەکردەوەو ، چاوێکیشیان بەناو جێیەکەدا ئەگێڕاو ، دووا جار پشتیان تێئەکردن و لێیان ئەداو ئەڕویشتن . بەبێ ئەوەی تەنها کەسێکیان کورسی یەك لەکورسی یە بەتاڵەکانی ناو جێیەکە پڕکاتەوە .

لەدوورەوە کۆمەڵێك هاتن ، زووربەیان سەڵت بوون . ڕووەولای ئێوە ئەیانکوتا ، تۆ هەر زوو لەدڵت چەسپی ئەوانەی بەرەو لای ئێوە دێن زۆر ناخایێنێ کورسی یە چۆڵەکان پڕ ئەکەنەوە .

هەرواش بوو ، چۆن بۆی چوو بوویت وادەرچوو . گەلێ جار ئەو بۆ چوونانە ڕاست دەرئەچن . ئەوانەی لەسەر سەفەرن هەر زۆر زوو جیائەکرێنەوە لەوانەی بە ڕێبواری سەرنجی ئۆتۆمۆبێلە وەستاوەکان ئەدەن و لێیان وورد دەبنەوەو لائەدەنە لایان . دووا جار لێئەدن و دەڕۆن .

جێیەکە کەوتبووە ڕێ ، پێچەکەی بڕی ، سەرەو خوار بووەوە . لەشارۆچکەکە دەرچوو . ملی نا . بە پەلەچنارەکە گەیشت . بەدەستەچەپدا داگەڕا . ئاوایی یە پێنج شەش ماڵە کەلی و کۆمەکە دەرکەوت . ئیتر تۆ ئاوێکی ساردکرا بەدڵتاو ، خەمە گەورەکەی سەر سنگت ڕەوی یەوە . ڕویشتن . تاکە خانووەکەی پشت چنارەکان دەرکەوت . بە دەرکەوتنی ئەو خانووە ئیتر تۆ ئاڵۆزایت و لەشوێنی خۆتەوە ئاخێکی قووڵ و دوورو درێژت هەڵکێشا . بەناختا شۆری کردیتەوەو یادگارەکانی هەژدە ساڵ لەمەو بەری بەبەر چاوتەوە ڕاگرت .

« بۆسێ مانگ ئەچوو لێت برابوو . هەموو ئێوارەیەك پێش ئەوەی خۆر بەودیو کەژەکەی پشت ئاوایی دا شۆر بێتەوە ، گوێ سەربانەکەت لێئەگرت . ئەوسا ئەم بەر مەمکانەبوو . ئەترووانی یە ڕێگەکەی سەر ئەنێت بەئاوایی یەوە سەرنجە دوورەکانت ئەناردو وورد ئەتروانی . بەمە ئەتزانی کێ ی

پیادیٚ‌و کیٚ ی پیادەڕووا .
هەموو ئێوارەیەك لەو کاتانەدا خەمەکان لای تۆ تا ئەهات خەستر ئەبوونەوە . تابەرەو تاریکیش بچووایە زیاتر هەستت بەتەنیایی‌و یەك باڵی ئەکرد . »



جێبەکە وورد وورد ئەڕویشت . بەدووای خۆیدا تەپ‌و تۆزێکی زۆری ئەدا بەدەم باوە . بەشێك لەو تەپ‌و تۆزە ئەگەڕایەوەو وورد وورد ئەنیشتە سەر ڕووو برۆو برژانگی سووار بووەکانی ناو جێبەکە . بەمە تائەهات لێوی ووشك ئەکردن‌و دەمی ئەکردن بەپەلاس . « تیژتر سەرنجت داو ووردتر ڕووانیت ، خۆر ئەوکاتە ماڵاوایی لەگوندەکە ئەکردو ئەچوو بەو دیودا . لەپڕ دڵت داخورپا ، لەسەرخۆ هەنگاوی ئەنا ، ماندوێتی خۆی لەهەنگاوەکانی‌یەوە پێچابوو . ڕاپەڕیت ، هێزت دایەخۆت . بەبانیژەی خانووەکەدا داگەڕایت ، هەر هەنگاوێکت کرد بەدووان . پێچەکانی ناو ماڵانت بڕی . کەوتیتە سەر ڕێگەکە . لەوێدا هەڵویستێکت بۆکردو باشتر ڕووانیت . خۆت بۆنەگیرا ، لاقەکانت دا بەدەم هەنگاوەکانتەوە . لەودیو کانی ژنانەوە پیٚ ی گەیشتیت . باوەشت پیاکرد . دەستت لەناو دەستی ناو ، سەرت نابەدڵی‌یەوە .



گوندی (ك) لەناو ڕەشایی شەودا نوقم ئەبوو . شەکەتی‌و ماندوێتی ڕێگەی سەخت‌و هەوراز دەستی پێکردە ملی خەوێکی قورس‌و ، خەونە پچرپچرەکانی پیٚ دی . بەر لەوەی ئاسۆ خۆر بەدووای خۆیدا بێنێ . بووە نێچیری ڕاوی ڕاوچی‌یەکانی ئەو بەرە بەیانە . ئێستاش دووای هەژدە ساڵ . پیاوانی ئەو گوندە کەلەدەوری سۆپاکەی مزگەوت کرد ئەبنەوە ، ئەگێڕنەوە ئەڵێن « تالەچاو وون‌بوون‌و تاچوشن بەودیو ئاوایی‌دا تەپ‌و تۆزی لیٚ‌هەڵئەساو ، تەپ‌و تۆز بەرز ئەبووەو لوولی ئەخواردو سەر ئەکەوت . »
جێبەکە ڕووەو دەربەندەکە ملی‌ئەنا ، هەر ئاوایی‌یەکی ئەهاتە ڕیٚ بەجیٚ ی ئەهێشت . جیبەکە لەچاو هەردوو کەژەکەی ئەمبەرو ئەوبەری دەربەندەکەدا میروولەیەکی سست‌و خاوو خلیچك بوو .

سوواربووەکانی ناو جێبەکە لەئاستی بڵندی‌و سەرکەشیی کەژەکەو باریکی‌و سەختی ڕێگەکە سەریان دائەخست . ئەوان واو ئەمیش بەناخی خۆی‌دا ئەچۆڕاو لەو سەرەوە بیرەوەری‌و یادگارە بەسوێکانی هەڵئە هێنجا .
پێش هەژدەساڵ لەوشەوەدا پیٚ ی ووت :
* ئەمانەتی تۆو ئەو منالە .
تۆپێت ووت :

* خەمی ئەوت نەبیٚ ، سەرمی لەڕێگەدا دائەنێم .
دەربەندەکە لەتەواو بووندا بوو . جێبەکە لەسەرخۆ شۆڕ ئەبووەوە . ئەوسەری دەربەندەکە دەرکەوت . سووار بووەکانی ناو جێبەکە جووڵە جووڵیان پیٚ‌کەوت . جێبەکە هێواشی کردەوە . لای کەپرەکەی نزیك ڕێگەکە لای‌دا . سووار بووەکانی ناو جێبەکە بەروو دووا دابەزین . سوواربووەکان ڕەنگی ئاشەوانیان لیٚ نیشتبوو .



ئێوەلاتان نەدا ، ملی ڕێگەکەی شانی کەپرەکەتان گرت . خۆر ئەو دەمە گەیبوە سەر سەرتان . سەرنجی چوار لای خۆتان‌دا . گوڵە گەنمە ئاڵتوونی‌یەکان بەشنەبای ئەو دەمەو نیوەڕۆیە ئەشنایەوە . بەرز ڕووانیتان مەلە ئازادەکان بۆشایی ئاسمانیان تەی ئەکرد . دووای هەنگاوەکانتان کەوتن . زۆر نەڕویشتن کەپرەکان خۆیان نیشان‌داو هاتن بەپیرتانەوە . بەدەرکەوتنی کەپرەکان ئارەق‌وماندوێتی ئەوچەند وەختەتان ووشك بووەوە . تۆ پەنجەت بۆ کەپرەکان ڕاکێشاو بەووت ووت :
* هەست بەئازادی ئەکەم .
ئەو بەدووای زەردە خەنەیەکی گەش‌دا بەتۆی‌ووت :
* واهەست ئەکەم کەئێستە لەدایك بووم ئیتر تۆ دوودڵۆپ فرمێسکی گەرم لەچاوەکانت ڕژاو بەسەر ڕوومەتە زەرد هەڵگەڕاوەکانتا چۆڕاو لەبەر پێت‌دا ئارامی گرت . بیٚ‌ئەوەی لەخۆت بەولاوە کەسی‌تر لەئەنهێنی ڕشتنی ئەو دوو دڵۆپە فرمێسکە بزانێت‌و تیٚ بگات .

ئابی / 1983

مەجید ئاسنگەر
کۆیە

# ورچ و مەیموون

منالە خۆشەویستەکان : ـ
هەبوو .. نەبوو کەس لە خوا گەورەتر نەبوو : کەس لە پێغەمبەر خۆشەویستتر نەبوو : کەس لە درۆزن روو رەشتر نەبوو ! دەگێرنەوە[1] دەڵێن : لە زەمانێکی کۆن‌دا وولاتێ هەبوو مەیموونی تیادا دەژیان ، جێگایەکی زۆر جوانو دڵگیرو بەپیت بوو .... پڕین بوو لە روبارو کانیاوو باخو باخاتو دارو درەختی مێوەجاتی جۆر بەجۆر : ئاوی سازگار ، هەوای فێنك ، کوێستانێ بوو بەهەشتی سەرزەمین خۆی بوو . مەیموونەکان بەکامەرانیو شادییەوە ، بێ گرێو گوڵو تەنگو چەڵەمە تیایدا رۆژگاریان دەبردە سەرو هیچ خەمێکیان نەبوو ، لەو لایشەوە ، نزیك وولاتەکەیان ، دەشتێکی گەرمەسێری بێ پیتو بەرەکەت هەبوو وورچی تیادا دەژیان . وولاتێ وورچەکان دەمێك بوو هێشكو برینگ هەلگەڕابوو ، بەجۆرێ بەچنگە چڕیو بەهەزار دەردی سەر نەبووایە خۆراکو بژێوی رۆژانەی تیادا بەرچنگ نەدەخرا ، بۆیە هەرسەکان هێندە لە ڕولاوازو بێ‌هێز بوو بوون هەر ئەوەتا گیانیان بەبەرەوە مابوو ! وارێکەوت رۆژێکیان برسییەتیو تێنووەتی وای لە وورچێك کرد سەری خۆی هەلگرێو بڕوا تاگەیشتە مەلبەندی مەیموونەکان . کە چاوی بەو شوینە کەوت ، چی ببینێ ، هەروەختابوو لە تاوانا شێتو هاربێت ! کەوتە قەپاڵ گرتنو مشەکردن .. لەوەڕا ... لەوەڕا ... هەتا وورگی ئاوسا ، وەتاکو چوارپەلی ڕەپ نەبوون لەهەڵ لووشین نەکەوت ... کاتێ ئێوارە ، بەمشەمشو لرفە ڕف گەڕایەوە ، هاوەڵەکانی بەرەو پیری هاتنو لە دەوریدا ویبوونەوە . لێی هاتنە پرسیارو سەرزەنشتیان کرد چونکە زۆریان خەم لێی خواردبوو کە بێ سەرو شوێن ڕۆیشتبوو ، کەس نەیزانیبوو چی بەسەردا هاتبوو . وورچەیش بەهەوەسو فیزێکەوە ، چی دیبوو چی خواردبوو ، بە مینگە مینگ بۆی گێرانەوە . هەمووی شاگە شکە کردن ئەم هەواڵە گەیشتەوە سەرۆکی وورچەکان ، سەرۆك ناردی بەشوێنی داو سۆراخی هەواڵەکەی لێکرد . مام وورچ بەنازو فیزەوە بۆی باس کردو تێی گەیاند کە ئەو شوێنە چ بەهەشتێکە بۆ خۆی .

منالە خۆشەویستەکان :
سەرۆك ناردی پیاو ماقوولو ریش سپی وورچانی کۆکردنەوەو کەوتنە پرس‌وڕا دەربڕین ، بڕیاریاندا هێرش بەرنە سەر ئەو بەهەشتەوەو داگیری بکەن ، چونکە چەندان ساڵە مەیموون ئەو بەهەشتە دەخۆن ، ئیتر نۆرەی ئەوانە لەمەولا بیکەنە چایەری خۆیان . بۆ گوایا خوا هەر بە مەیموونانی داوە ؟ ئەی وورچ ماف ژیانو خۆش گوزەرانی‌یان نی‌یە ؟
سوپای وورچان شەبەیخوونیان کردو شەو لە ناکاودا هەڵیانکوتایە سەر وولاتی مەیموونانو لەشکری مەیموونانیان شکاندو وولاتەکانیان داگیر کرد ، مەیموون لە خاکی خۆیاندا دەرکران پەڕاگەندەو پەرشو بڵاوبوونو کەوتنە هەندەران :
وورچی داگیرکەر کەوتنە ئاسوودەییو خۆشییەکەوە لە خەویشدا هەرگیز خەونیان پێوە نەبینیبوو . ئیتر تێرو تەسەل بوون ، هێزیان وەبەرهاتەوەو ملیان تا دەهات ئەستوور دەبوو .
منالە خۆشەویستەکان :
مەیموونی ئاوارەی دوورە وولاتیش ژینیان لێ تاڵ کراو لەو خاکە ووشکو گەرمەسێرەدا دۆزەخیان بۆ داخرابوو .. ڕۆژ بە رۆژ لەڕوگەڕ دەبوونو بێ‌هێزیو بێزاریی سوواری ملیان دەبوو ... هەر ئەوەتا نووزەیان لەبەردامابوو رۆژێکیان دونیا دیتەو قسە زانەکان چوونە لای سەرکردەکەیانو سکاڵای حاڵی پەشێوی خۆیانیان لا کردو گوتیان ئەگەر بێتو چارە سەرییەکی دەردی خۆیان نەکەن ئەوا بێگومان تێکرا لە ناو دەچنو کاریان تەواو

دەبێ پیرە مەیموونی بە سالا چووی دانا نەختێ فکری کردەوەو ئەنجا رووی کردە ریش سپی یەکانو گوتی ئێوە هەقتان بەسەر دانەبێ ، تەنیا چیتان لێ داوا دەکەم ئەنجامی بدەنو هیچی‌تر . گوتیان : فەرموو هەرچی تۆ ئەمر دەکەیت سەرمان لەرێتە سەرۆك گوتی : دەباشە . ئیمشەو سێ چوارێکتان لەگەلما وەرنو بمبەنەوە نیشتمانە داگیر کراوەکەمانو لەوێ هەندەم لێدەن ، هەتا لە پەلو پۆم دەیەخن ، ئەوجا بەجێم بێلنو بگەرێنەوە بۆ ئێرە . سێ شەوی‌تر ، بەبێ ترس هەمووتان بگەرێنەوە نیشتمانی ئازادکراوو بە بەهەشتی دێرین شادو گوشاد ببنەوە .

لەسەر ئەوە رێك کەوتن هەر ئەو شەوەیش بەرێ کەوتن . گەیشتنە سنووری دارستانەکەی پێشوویانو سەرۆك داوای لێکردن شلوکوتی بکەن ، بەلام ئەوان روویان نەهاتو دەستیان نەچوو ئەو ناماقوولییە بکەن .. پیرە مەیموون گوتی : چیتان پێدەلێم هەرئەوەیە . ئەگەر دلسۆزی گەلو نیشتمانی خۆتانن ئەوە دەبێ بە قسەم بکەن . کە دیتیان چاریان نی‌یە هەلسان بە هەرسێ چواریان سەرۆکی خۆیانیان وا دارکاریی کرد هیچ کوێیەکی ساخی نەماو ئێجگاری لەپەلو پۆ کەوت . ئینجا ، بە چاوی فرمێسکاویی‌و بەهەنسکی گریانەوە داوای بەخشینو دوعا خوازی‌یان لێکردو لە یەزدان پارانەوە بیپارێزی‌و سەریخاو لاشەی نیوە گیانیان لەوێ جێهێلاو گەرانەوە هەوارگەی خۆیان .

جا منالە خۆشەویستەکان ، بەیانی‌ی لەگەل گزنگی خۆردا ، کە گیانلەبەران لە خەو هۆشیار بوونەوەو جوولەیان تێکەوتو هەریەکە بۆ لایێ بۆ لەوەرو مژوومۆر بەو ناوەدا پەرشوبلاو بوونەوە ، وورچێکیان گوێ‌ی لە نووزە نووزو نالە نالێبوو . هەستی راگرتو سەرنجی‌دا ، بەرەو لای نالە نالەکەوە چوو ، دی ئەوا پیرە مەیموونێکی کۆنە سال لە سەردەم لێ‌ی کەوتووەو لە گیانەلادایە . لێوەی نزیك بووەو دواندی . مەیموون تکای لێکرد بیباتە لای پاشای خۆیانو گوتی کەوا نیشێکی گرنگی پێ‌یەتی . خەبەر گەیشتەوە سەرۆکی وورچەکانو ئەمیش فەرمانی‌دا مەیموونەی بۆ ببەن ، وورچ هاتن مەیموونیان هەلگرتوو بردیانە دیوەخان ، لە بەردەم سەرۆکدا دایانە زەوی ، سەرۆك داوای لێکردن تەنیایان بەجێ بێلن ، وورچ دیوەخانیان چۆل کرد ، ئەنجا سەرۆك لە پیرە

مەیموون هاتە دەنگو پرس : تۆ چ کارەیت و لێرەدا چی دەکەیتو ، بۆ ئاوات بەسەرا هاتووە ؟ مەیموون بە نووزەیێکەوە ، گوتی ، گەورەم منیش پاشای مەیموونانم . لەسەر ئێوە وام بەسەر هاتووە وورچ پرسی : چۆن ؟ مەیموون وتی : مەیموونەکان هاتنە لامو داوایان لێکردم پەلاماری ئێوە بدەینو ئەم وولاتەی لەمەر خۆمانتان لێبسەنینەوە ، منیش ئەرێم لەگەل نەدانو گوتم وورچیش برای ئێمەن ... ئێمە چەندان سال بوو ئەم وولاتەمان دەخوارد ، بام ئەوانیش چەن سالێ بیخۆن ، چەندی کردیانو کۆشایان رێگەم پێ نەدانو لەگەلیانا نەهاتمە رایێ . جالێم هەلگەرانەوەو گومانیان کرد کەمن نۆکەرو سیخووڕی ئێوەبم . لەبەر ئەوە لە سەرۆکاتییان یەخستمو هەندەیان لێدام هەروەختابوو بشمکوژن . ئەنجا منیان هینا هەتا سنووی وولاتی ئێوە رایانکێشامو لەوێ فرێیاندامو گوتیان : مادەم تۆ سیخوڕو پیاوی وورچە داگیر کەرەکانی دەبێ بچێتەوە لای ئاغاکانتو لەوێدا بژیت ، بەو نیازەیش کە ئێوە بێگومان دەمکوژنو دەمخۆن ، ئەمە بەسەر هاتی من ، گەورەم ئەمەشتان پێ‌بلێم ، گەورەم ئێستێ هەرچی مەیموونی لە دونیادا هەن کۆ بوونەتەوەو یەکیان گرتووەو لەشکریان کردووە . خەریکن لەم زوانەدا بەسەرتانا دابدەن ، پیرە وورچ نەختێ بیری کردەوە ئەنجا پرسی باشە ، جا بە ئێمە دەوێرن ؟ مەیموونی شلو کوت کراو گوتی ، سەروەرم لەبەر ئەوە کە ژمارەیان ئێجگار زۆرەو هەموو قسەیان یێکەو پیلانەکەشیان ئەوەیە کە بەشەو هەلیکوتنە سەر تانو رێگەتان نەدەن بەخۆ بکەونو بەرگری‌ی خۆتان بکەن ... بۆیە ، وابزانم دەردەستتان دێنو پەریشانتان دەکەن . پیرە هەرس پرسی ، باشە ئەی چار چی‌یە ؟ مەیموونی زامدار ووتی بەرای من تاکە رێگا ئەوەیە کە ئێوە دەس پێشخەریی بکەنو بەرلەوانەوە بەسەریانا بدەنو پیلانەکەیان لێ پووچەل بکەنەوە دەنا کارتان کراوەو حیسابتان تەواوە ، مام وورچ ریش سپی‌و پیاو ماقوولانی کۆکردنەوەو حیکایەتەکەی بۆ گێرانەوەو داوای راوێژی لێکردن . لە پاش گفتوگۆو رانیشاندان هەموو بریاریان لەسەر ئەوەدا کە دەستپیشخەریی بکەنو پەلاماری مەیموونەکان بدەن بەر لەوەی ئەمان بێنە سەریانەوە جا مام وورچ رووی کردە مەیموونو گوتی : باشە ئێستێ مەیموونەکان لە کوێ دان ؟ پیرە مەیموون تۆزێ داماو لە

پاشان گوتی گەورەم ، ئەمان لە شوێنێکی نهێنیدا کۆ بوونەتەوەو خەریکی خۆسازدانن . جێگاکەیان سەختو پەنهانە ، وورچ گوتی دەباشە بەپێشمانکەوەو ڕێنماییمان بکە . مەیموون گوتی ، قوربان خۆت دەیزانی من کەڵکی ڕۆیشتنم نەماوە مام وورچ ووتی : باشە هەڵت دەگرین مەیموون ووتی زۆر چاکە ، بەلام بۆ ئەوەی کارەکەمان ئاشکرا نەبیٚو مەیموونەکان پێمان نەزانن ، دەبێ هەر بەشەو بڕۆینو ڕۆژانەش خۆمان بشارینەوە ، مام وورچ گوتی چۆنت لاباشە وادەکەین .

مناڵە خۆشەویستەکان : با درێژەی پێ نەدەین کە ئێوارە داهات گشت وورچەکان گرد بوونەوە پیرە مەیموونیان سواری پشتی وورچێکی مل قەوی کردو بووە پێشڕەویان .

لەشکر بەدوایەوە بەر ەو وولاتی مەیموونان بەرێ کەوتن . ئەو شەوە تا بەیانی پیرە مەیموون بە ڕێگاییکی سەختی دژوارو هەورازو نشێوو هەڵەتو پەڵەتی دابردن کە لەوە پێش زیندەوەری پیادا نەڕۆیشتبوو .

کە ڕۆژ هەڵات گەیشتنە شوێنێکی چۆڵی گەرمو کەم ئاوەوە پیرە مەیموون گوتی دەبێ ئیمرۆ تائێواریٚ لێرەدا خۆمان حەشار بدە ین ، وورچ هەمووی هیلاكو برسی یو تینوو بوون ئەو ڕۆژە لەوێ مۆڵ بوون بۆ ئێواریٚ سەر لە نوێ کەوتنەوە ڕێو ملی هەردو هەڵدێرو شاخی هەزار بەهەزاری پێگرتنەوە . وورچ زۆر شەکەتوو ماندوو بووبوونو لە مەیموونیان دەپرسی : ئەوەچیبوو هەر نەگەیشتین ؟ هەی ماڵ خراپ ئەوە بۆ کوێمان دەبەیت ؟ ئەمیش دەیگوت ئارامتان ببێ ، ئارام چاکە هێندەی نەماوە ئەی نەمگوت شوێنەکەیان دوورو سەختە ؟ بەو جۆرە مەیموونی کۆنە ساڵ ڕێ گۆڕکێی پێدە کردنو کام شوێن سەختو ناڵەباربوو بەوێیدا دەبردن ... هەموویان وەڕسبوو بوون ژمارەیەکی زۆریان لەڕێگادا جێمانو دەریان نەدەبرد ، چەندانیان لە برسانا کەوتنو ژمارەیەکی زۆریشیان لەبەر بێ ئاویی لە توێنانا خنکان ... چەندانیشیان لەشاخدا هەڵدە دێرانو ڕاست بوونەوەیان بۆ نەبوو سەرتان نەیەشێنم ، لە ڕۆژی سێیەمدا پیرە مەیموونی دانا پاشماوەی لەشکری شەکەتووزە لەبەر براوی وورچانی گەیاندە دەشتێکی بیابانی گەرمەسێری هیشکو برینگ ، نەتەڕایەتی تیادابوو نەدەنکە خۆراکێك . هیشتا ڕۆژ ڕمبێ بەرز نەبوو بووە کە ئەو ناوە

کوورەی حەمام ئاسایی گەرم داهات تەنیا تاکە سێبەرێك لەو ناوەدا نەبوو خۆی تیادا مات بدەن .. بەردو زیخو خۆڵ وەك تەنوور سوور داگەڕابوون پاشای وورچەکان زمانی دووبست شۆڕ ببووە وە لە پیرە مەیموونی پرسی : ئەوە کوا لەشکری مەیموونان لەکوێیە ؟ تۆ چیت بەئێمە کردو بۆ کوێت هیناوین هەی نەگبەت ؟ ئەوا لەشکرەکەی منت لە ناو بردو ئەوەی کە ماوەتەوەیش تا ئێوارە قەت یەکێکی بە ساخیی لیٚ دەرباز نابێت ؟ پیرە مەیموون بە شادو مانییەوە دەستێکی بە دەمو چاوی خۆیدا هیناو شوکرانەی خودای کردو بەپێکەنینو بەقینەوە گوتی : ئەی خاکتان بەسەر ! گوێ بگرە مام وورچی گەمژەلو بێ مێشك ، ئێوە بە زۆرداریی‌و بە ناهەق وولاتی ئێمەتان داگیر کرد ، دادو مافتان پێ شێل کرد . ئێمەتان لە نیشتمانی خۆمانا وەدەرنایینو بێ ماڵ پەڕاگەندەی هەندەرانتان کردین ، منیش کە سەرۆكو دلسۆزی هۆزەکەی خۆم بووم بڕیارمدا هەر تۆڵەتان لیٚبسێنمەوە ، نیشتمانی خۆمان لە ئێوەی داگیرکەرو زۆردار پاك بکەینەوە بەلام ئێوە زۆر دەستو بەهێزو ئێمەیش بێکەسو کەم دەست بووین ، دەمزانی بەشەڕو شۆڕ دەرەقەتی ئێوە نەدەهاتین دەبوو بە هۆشو بە تەکبیر بە ئامانج بگەینو ملتان پێ کەچ بکەینو چۆکتان پێ دابدەین جا ئەم پلانەم دانا بۆ ئەو مەبەستە پیرۆزەوە کە بە چاوی خۆتان دیتان چۆنم جێ بەجێ کرد . ئێستایش ، هەتا ئێواریٚ نەمن نەکەس لە ئێوە لەم گەرمەسێرەدا بەگیان نامینیٚ مەیموونەکانیش هەر ئێمشەو سەربەستو ئازاد بە شادیی دەگەڕێنەوە هەوارگەی بابو باپیران ....وئێوەش هەرچیم لێدەکەن بیکەنو باکم نییە من بۆ ئەمە سەری خۆم داناوە . بەم جۆرە مناڵە خۆشەویستەکان سەرۆکی مەیموونەکان ، سەری خۆی لە پێناوی سەرفرازییو سەربەخۆیی نیشتمانو ئازادییو کامەرانیی گەلەکەیا بەخشیو بۆ ئەم ئامانجە پیرۆزە لەم ڕێگایەوە خۆی کردە قوچی قوربانی . مەیموونەکانیش کە گەڕانەوە خاکی ئازاد کراویانەوە پەیکەرێکی جوانو نایابیان بۆ سەر کردە مەزنەکەیان دروست کرد لە پاداشتی ئەو جوانمەردیو فیداکارییەوەو هەتا مابوون هەربەڕێزو نەوازشەوە یادیان دەکردەوە .

1 – ناوەڕۆکی ئەم حیکایەتەم لە شاعیری مەزن (کاك عەونی) م بیستووە .

# گەڕانەوە

نووسینی :
تیبور دیری

احمد محمد اسماعیل
لەتورکیەوە کردوویە بە کوردي

چیرۆکنووس و رۆمان نووسی مەجەری « تیبور دیری Tibor Dery » لەساڵی 1894 دا لەدایك بووە ..

لەسی یەکانی ئەم چەرخەدا ، بۆ ڤینا دوور خراوەتەوە ، کاتێکیش گەڕایەوە ماوەیەکی زۆری بەگۆشەگیری بردەسەر . لەدوای بگرەو بەردەکەی ساڵی 1956 دا ، بەند کراوەو چەند ساڵێك لەزیندان ماوەتەوە ، ئەم کارە بووە هۆی تورەبوونی خەڵکی ، ناچار بەرەڵلایان کردووە ، دووبارە ئەمە وای لێکردووە کە لەکۆمەڵ و رێکخراوە ئەدەبییەکان خۆی دوورە پەرێز بگرێت و گۆشەگیری و تەنهایی بۆخۆی هەڵبژێرێت .... لە دوایی دا گوایە ـ ردي اعتباری ـ بۆکراوە ..

گەلێك بەرهەمی نایابی هەیە ، زۆربەیان بۆگەلێ زمان وەرگێڕراون ، لەمانە : « رستەیەکی تەواو نەکراو » و « ئەسپ و پیرەژنەکە » و « دیو » ، هەرسێکیان رۆمانن ، سێ یەمیان کراوە بەتورکی .. هەروەها چەند کۆمەڵە چیرۆکیشی چاپ کردووە . ئەم چیرۆکە ، چیرۆکێکی ناو کۆمەڵە چیرۆکی « خۆشەویستی » یە ، کەلە ساڵی 1963 دا لەهەنگاریا چاپکراوە . « گولچین یوجەل » یش لەساڵی 1970 دا کردویەتی بەتورکی . لەکتێبی « MACAR HiKAYELERi ANTOLOJiSi » یەوەکراوە بەکوردی .

دەرگای زیندانەکە کرایەوەو گاردیانێك پریاسکەیەکی هاویشتە بەرپێی «ب» ووتی : ـ
ـ ها .. بگرە ..
پریاسکەکە ژمارەیەکی لەسەر نووسرابوو . «ب» هەستایە سەرپێ ، زاق زاق تەماشای گاردیانەکەی کردو هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا ، ئەویش بەلالوتێکەوە پێی گوت : « کەلو پەلەکانتن ... لەبەریانکە .. پاش چەند ساتێکی کە تەراش دەکرێی .. »

پرياسكەكە ئەو كەڵو پەڵو پێڵاوانەی تێدابوو ، كەحەوت ساڵ لەمەوپێش لەبەريان داكەندبوو .
كەڵو پەلەكان شێدارو لۆچ لۆچ بووبوون ، پێڵاوەكانيش رەنگيان گۆڕابووو كيفيان هەڵهێنابوو .. كەمێ دەستی بەكەڵوپەلە لۆچاوی‌يەكەيدا هێناو لەبەری‌كردن ، زۆری پێ‌نەچوو سەرتاشەكە هات ، سەروريشی بۆ تاشی ، پاش سەعاتێكی كە بەدوايا هاتن ، لەڕێڕەوەكەدا هەشت نۆ كەسی بينی ، كەڵو پەلەكانيان وەكو هی ئەم وابوون . لەپێش هەموويان‌دا ئەميان بردە ژوورەوە .. چاوشێك لە پشت مێزێكەوە دانشتبوو ، يەكێكی‌كەش بەتەنيشتی‌يەوە راوەستابوو ، كابرايەكی‌كەش بەژوورەكەدا دەهاتو دەچوو . ئەوەی پشت مێزەكە بەدەنگێكی بەرز تێی‌خوڕی : « وەرە ئێرەوە .. ناوت ؟ ناوی دايكت ؟ و بۆ كوێ دەڕۆی ؟ ..» لەسەر يەكەو لەنەفەسێكدا ئەم ريزە پرسيارانەی لێكرد . «ب» لەسەرەخۆ هاتە گفت « نازانم .. »
- مەبەستت چييە ؟! نازانی بۆكوێ دەڕۆی ؟!!.
- نەخێر نازانم بۆكوێم دەبەن .
گاردیانەكە ناوچەوانی لێ گرژ كردەوەو دانەكانی لەيەك توندكرد :
- بۆ هيچ جێگايەكی ترت نابەن .. دەگەرێيتەوە ماڵێو لەگەڵ دايكتا نان دەخۆی .. دەشتوانی شەوێ لە گەڵ ئافرەتێكدا رۆژ بكەيتەوە .. تێ‌گەيشتی ؟.

- ب - ورتەی‌نەكرد .
- ئەو جێگايەی بۆی دەڕۆی ؟!
- شەقامی سيڤا ژمارە 17 .
- لە كوێی بۆدابست دايە ؟ .
- لەوبەرە .. بۆ بەرەڵلام دەكەن ؟[1]
گاردیانەكە بەسەريا نەڕاندی :
- بەرت دەدەن‌و ئەهـ ... حەز ناكەيت لێرە نەمێنی‌و مل خۆت بشكێنی ؟!.
هەندێ شت‌ومەكی كەی مابوەوە ، بۆيان هێنا : سەعاتێكی دەستی هەرزان بەها ، پاندانێك‌و جزدانێكی كۆنی رەنگ پەڕيو ، جزدانەكە لەباوكی‌يەوە بۆی مابوەوە . بە بەتاڵی دايانەوە دەستی‌و ووتيان : « ئالێرەدا ئيمزايەكمان بۆبكە .. » . بەپەنجە لەرزۆكەكانی قەلەمەكەی گرت‌و ئيمزايەكی خستە سەر پارچە كاغزەكەوە ، كە وەرگرتنەوەی سەعات‌و پەندان‌و جزدانەكەی دەسەلماند .
« ئائەمەشمان بۆ ئيمزا بكە » . پاش ئيمزاكردنەكە 140 فۆرينت[2] يان پێدا .
دانە كۆن‌و شين هەڵگەراوەكەی دەرهێنا ، سەعات‌و پاندانەكەی خستە لايەكی‌و فۆرينتەكانيشی قەمچ‌كردو ئاخنی‌يە سووچێكيەوە ، لەدواييشدا نووسراوی بەرەڵلا كردنەكەيان بەدەستەوەدا .. لەئاستی « هۆی بەرەڵابوونی » دا بە بەبۆشی هێڵرابوەوەو هيچيان بۆ نەنووسيبوو .
پاش ئەم هەموو بگرەو بەردەيە ، سەعاتێكی‌كەش دوايان‌خست ، دواجا لەگەڵ سێ‌بەندی تردابەرەو دەرگای دەرەوە دايانن‌لەبەر . هێشتا نەگەيشتبوونە دەرگاكە ، گاردیانێك بەپرتاو خۆی پێ گەياندن‌و رايگرتن ، يەكێ‌لە چوارەكەيان تاك كردەوە ، لەم ساتانەدا چەند گاردیانێكی كەش بە هەڵەداوان پەيدابوون ، هەرچوارلای كابرايان تەنی‌و بەرەو دوايان كردەوە .. روومەتی تازە تەراش بووی كابرا رەنگی‌تيادا نەما ، لەچاوی‌پڕ بەفرمێسكەوە تەماشايەكی ئەوانی‌كەی كرد ئەمانی كەش بەدوودڵی‌و گومانەوە هەرچۆنێك بوو خۆيانيان گەياندە دەرگاكە .. دەرگاوانەكەبە - ب - گوت :
- دەی .. دەست‌و بردكە تابگەی بەترامـوايەكە . بەوردی تەماشای دەرگاوانەكەی كردو نووسراوی بەرەڵلابوونەكەی نيشاندا . - ب - سەری دانەواندبوو تەماشای بەرپێی خۆی دەكرد .
- چاوەڕێی چی دەكەی ها ؟!
ئەم هێشتا هەر چاوی بڕی‌بووە بەرپێی‌خۆی . دەرگاوانەكە بەتوڕە بوونێكەوە ئەمجارەش پێی ووتەوە : - ونبە بڕۆ چاوەڕێی چی دەكەی ؟!
- دەڕۆم ..... دەتوانم بڕۆم ؟.
دەرگاوانەكە وەرامی نەدايەوە ، - ب - نووسراوەكەی قەمچ كردو نايە تەنكی باخەڵ‌و بەرەو ئەوديو دەرگاكە هەنگاوی‌نا كەبەرە بەرە دوور دەكەوتەوە پڕ بەدل حەزی دەكرد ئاوڕێك بداتەوە ، بەلام زاتی نەدەكرد ، هێشتا بڕوای نەدەكرد كەبەربووە ، مەترسی ئەوەی دەكرد بكەونە شوێنی‌و بێن گلی بدەنەوە . بەدەم هەنگاونانەوە گوێی هەڵدەخست ، تا بزانێ

ئاخۆ کەسی بەدواوەیە ؟.. « گەر بێت و تا وێستگای تراموایەکە کەس قۆڵی نەگرتم و نەیان گەڕانمە دواوە ئەوا خۆم بە بەربوو دەزانم » . خۆی بێ ڕانەگیرا هێشتا مابووی بگاتە وێستگاکە ئاورێکی دایەوە ، کەبینی کەسی بەدوونەکەوتووە دڵنیابوو ، گیرفانەکانی بۆدەسەسرێك پشکنی تا ئارەقەی لامل و تەوێڵی بێ سڕێ ، پێی نەبوو ، لەوکاتەی گەیشتە وێستگاکە تراموایەك هات ، خۆی پیداکرد . گاردیانێکی روومەت ئاوڵەیین دادەبەزی ، ئەمیش کەسەردەکەوت روو بەرووی یەك بوونەوە ، چاوە زیتەکانی برییەب - و سەرتاپا پیایا هەڵروانی . - ب - گوێی پێنەداو رۆژباشیشی لێنەکرد . ترامواى جولا . کەوتەڕێ . لەوساتەدا .. ئالەو ساتەکورتەدا کە ترامواکە بەرێکەوت و - ب - سەلاوی لەگاردیانەکە نەکردو فەراموشی کرد ، ئالەوساتەدا جیهان تام و بۆیەکی تری گەیاند ، هەموو شتێکی زیندوو پڕ جوولە هاتەبەرچاو ، دونیا شتێکی دیکەی دەبەخشی ، لەو جۆرە هەستانە دەچێ کاتێ لەهۆڵی سینەمادا دادەنیشی فلیمەکە کاردەکات کەچی ئەکتەرەکان بێدەنگ دەجولێنەوە ، دواجا لەپڕێکدا ئەکتەرەکان لەناو قەدی رستەیەکەوە دەنگ هەڵدەبڕن ، هۆڵەکەو دەوروبەر پڕ دەبن لە مۆسیقاو گۆرانی و دەنگ ، دەوروبەریشی پڕ لەرەنگ دەبێت . ئوتۆمبیلێکی زەرد بەرەو رووی ترامواکە دەهات ، لەهەموو ئەو زەردانە کەدیبونی زەردتر دیاربوو لەبەر چاوی . بەجۆرێکیش گڤەی کردو تێپەڕبوو - ب - لەوە دەترسا کەئیتر هەتا هەتایە راوەستانی بۆنەبێ . دوو ئەسپی شێ ، بەچوار ناڵە گالیسکەیەکیان بە کێش کردبوو ، خرمەی ناڵەکانیان دەگەیشتە کەشکەلان . دیمەنی دوو پەنجەرەی بریسکەدار و باخچەیەکی بچکۆلانەو پەنجەرەیەکی کراوەی بچووکی چێشتخانەی ماڵێك بەبەرچاویا گوزەریانکرد . خەڵکێکی زۆر بەشەقامەکاندا دەهاتن و دەچوون ، کەسیان چوون یەك نەبوون . کەلوپەلی رەنگاورەنگیان لەبەردابوو ، لەبچووکی هەندێکیان سەری سوڕما . ئەوەندە بچووك بوون نەدەگەیشتنە ئاستی چۆکی خەڵکەکە ، هەندێکی کەشیان ئافرەتەکان لەباوەشیانیان گرتبوو ، تۆ ئافرەتەکان بۆ ناڵێی ئافرەتەکان !!.

- ب - هەستی بەماندوو بوونی چاوەکانی کرد ، رووی وەرچەرخاند بۆ ناوەوەی ترامواکە ئافرەتە بلیت فرۆشەکە دەنگێکی ناسك و پڕئاوازی هەبوو - ب - بلیتێکی کڕی و لە سوچێکەوە دانیشت .. چاوەکانی لێكنا . ترسا دەسەلاتی بەسەر خۆیدا نەمێنێ . تەماشای دەرەوەی کردەوە ، چەند کرێکارێك لەناو باخچەی کارگەیەکدا وەستابوون ، یەکێکیان دەستی بەقژی ئافرەتێکدا دەهێنا . کرێکارێك هات و بەتەنیشت - ب - وە دانیشت . چەند بیرەیەکی لەکیسەیەك نابوو بلیت فرۆشەکە پێکەنی و ووتی :

- زۆرت کڕیوە !.
- خێزانەکەم حەز دەکات بخۆمەوە ..

بلیت فرۆشەکە دووبارە پێکەنی .

- پێی خۆشە ها ؟.
- بێگومان .
- بیرەی رەشە ؟
- بەڵێ .
- بیرەی زەرد چاکتر نییە ؟.
- خێزانەکەم وای پێخۆشە ئەم جۆرە بیرەیە بخۆمەوە . بلیت فرۆشەکە قاقا پێدەکەنی :
- شووشەیەکیان بەمن نادەی ؟.
- باشە .. بەلام رەشە .
- قەیناکات .
- بۆ چیتە ؟!
- بۆ مێردەکەمە .
- بەلام ئەو حەزی لەزەردباوە هەمدیس بلیت فرۆشەکە تریقایەوە .

ترامواکە وەستا - ب - دابەزی و تەکسی یەکی راگرت .

- بۆکوێ ؟.
- بۆدا
- لەکامین پردەوە بەڕینەوە ؟.

« ب » وەك لە مەبەستی شوفێرەکە نەگەیشتبێ گێل گێل تەماشای شوفێرەکەی دەکردو ووتی :

- ووتت لە کام پردەوە ؟!.
- وا دیارە تۆ خەڵکی ئەم شارە نیت ؟.

بێ ئەوەی وەرامی پرسیارەکەی بداتەوە ووتی :

- لەپردی « مارگریت » ەوە .

تاکسی یەکە کەوتەڕێ ، - ب - قیت و بەل دانشتبوو ، لە

جامەکراوەکەوە گرمەو هاژەو ژاوەژاوی شەقامەکەو بۆنی بەنزین دەهاتە ژوورەوە . تیشکی رۆژ ئەو ناوانەی گرتبوەوە .. لەژێر چەترێکی کەسکی گەورەی بەردەم دوکانێکدا ، ئافرەتێك لەسەرەخۆ جگەرەی بەبادەدا . چەترەکە رەنگی سەوزی بەسەر ئافرەتەکەدا دەباراند . کەمێك لەولاترەوە دار کەستەنایەك سێبەرێکی خڕی فڕێدابووە سەر زەوی - ب - بەزبانێکی خۆشی پێی گوت :

- لەشوێنێك راوەستە باپاکەتێك جگەرە بکڕم .

لەئاستی دوکانێك وەستان . بەر دوکانەکە بەسەوزەو دەسکەتوورو لەهانە کەلەکە کرابوو . بەتەنیشتیانەوە سێوی لاسوورەو میوەی هەمە چەشنە دانرابوون ، دوکانەکەی ئەولای سەوزەفرۆشەکە دوکانی جگەرەفرۆشێك بوو . شۆفێرەکە پێیگوت : « تۆ دامەبەزە .. کام بابەتت دەوێ ؟ »

- ب - چاوی لەسەوزەو میوەی بەردەم دوکانەکە گیرکردبوو .

« کۆسۆت باشە ؟ » .

« بەڵێ باشە . » .

- ب - ویستی دەست بەباخەڵا بکات ، بەلام شۆفێرەکە دابەزیبوو . کەگەڕایەوە ، بەپەلە لەدەستی وەرگرت و جگەرەیەکی ئاگردا . شۆفێرەکە بەتیلەی چاو تەماشای دەکرد ، پێیگوت :

- زاوایەکی منیش دوو ساڵی تیا بەسەربرد ، کەبەربوو یەکەمجار خۆی گەیاندبووە دوکانی جگەرەفرۆشێك ، تا گەیشتە ماڵەوە ، پاکەتێکی فت کردبوو ... لەوەشە لەنەخۆشخانە هاتبێتە دەرەوە ، بەلام ئەم کەل و پەلانە کەلوپەلی نەخۆشخانە نین ... چەنی تیا مایتەوە ؟

- حەوت ساڵ ..

شۆفێرەکە فیکەیەکی بۆکێشا .

- مەسەلەی ... ؟ .

- بەڵێ ... ساڵ و نیوێکیش لەژوورێکی تەنیادا ...

- ئێستاش بەرەڵلاکراوی ... وانییە ؟ .. حەوت ساڵ !!

- زۆرە .. ها ..؟

شۆفێرەکە شانێکی هەڵتەکاندو وتی « حەوت ساڵ » . - ب - لەنزیك یەکێ لەئەستاسیونەکانی مەترودا دابەزی . ویستی پاشماوەی رێگاکە بەپێ ببڕێ دەیویست بەر لەوەی لەگەل خێزانەکەیدا بەیەك شادبن تەزی پێی دەرکات .. شۆفێرەکە-

بەخشیشی لێ وەرنەگرت :

- پێویستیت بەپارەیە .. بۆخۆت خەرجیکە وە بۆ ئەوەی هۆشت بێتەوەبەر هەموو رۆژێك پارچەیە گۆشت و شەراب بخۆرەوە ، زۆر ناخایینێ هێزت بەبەرا دێ .

- سوپاستان دەکەم ... خوا حافیز .

لەبەردەم ئاوێنەبەندی کۆگای کەل و پەل فرۆشێکدا راوەستاو بەخۆیا هەڵیڕوانی .. دواجارکەوتەوە هەنگاونان . شەقامی « پاسارات » قەلەبالغ بوو . بەنیازی قەدبڕکردنی رێگاکە ، بەتەپۆلکەیەکی بچووکدا هەڵگژا ، بەبەردەم پارێگاییکی تەنیشدا تێپەڕی گەیشتە شەقامی « هارمان نوتو » . بەدەستەراستدا پانتاییەکی پان و بەرینە ، فەرشی هەرێزی تیاراخراوە . لەسەر چیمەنەکە پێی لێدرێژکرد .

هەرچۆنێك بێ لەمکاتانەدا کەس چاوەرێی ناکات . بەئارەزووی خۆی دەتوانێ ئاوا نیوسەعاتێك چاوی بەم دیمەنانە زاخاو بدات . کەمێ لەولاوەیداو لەودیو پەرژینێکی نزمەوە دارسێوێك خونچەی جوان جوانی لەخۆی دابوو ، هەستاو چووە نزیك پەرژینە نزمەکەوە ... خونچەکان ئەوەندە سخ بوون ، بەحاڵ ئاسمان لە نێوانیانەوە دەبینرا . ئەو گوڵە بچووك بچووکانە خاڵێکی پەمەیی یان لەناوابوو ، هەنگ و پەپوولە لەدارەکە ئالابوون و بووبوونە تارایەك و بەسەر دارەکەدا دادرابوەوە . بەوپەڕی بێدەنگی یەوە وەستا ، گوێی لەدارەکە گرت !، لەنێوان دوولقەوە تلماسکێ لەئاسمانی شین دیاربوو ، لەو ئاستەدا لەدوور گەواڵە هەورەکان هەریەکەو بۆ خۆی دارسێوێکی رازاوەبوو . جارێك تەماشای دارسێوەکەی بەردەمی دەکردو ماوەیەکیشی بۆ دارسێوەکانی ئاسمان دەیڕوانی .. لەبەر ئەوەی سەعاتەکەی قورمیش نەکردبوو ، نەیدەزانی لەکەیەوە لەتاکسی یەکە دابەزیوە .. بەرەو ماڵ بوەوە ، چەند هەنگاوێك رۆیشت ، لایدایە پاڵ کۆمەڵتە ژاژێك و رشایەوە ، هەستی بەحەسانەوە کرد چووە کۆڵانێکی تەسکەوە ، بەژێرلق و پۆپی درەختەکاندا کۆڵانەکەی بڕی بەتەپۆلکەیەکدا سەرکەوت ، ماڵیان کەوتبووە ئەودیو تەپۆلکەکەوە .. گەیشتە بەردەرگا . جاران لەنهۆمی یەکەمدا دادەنیشتن .. بەردەم خانووەکە باخچەیەکی بچووکە . بەم لاو ئەولای دەرگای باخچەکەدا دوو داری « لەیلاك » رواون . بە

بەیژەکەدا سەرکەوت ، یەك دوو جار لەزەنگیداو چاوەڕێی کرد ، کەس بەدەنگییەوە نەهات . وا باوە لەسەر دەرگاکان ناوی خاوەن ماڵەکە بنووسرێ . ئەوەشی نەدی . دابەزییەوە ، لە دەرگای ژووری دەرگاوانەکەیدا « ڕۆژباش » . ئافرەتە دەرگاوانەکە وەکو ئەم لاوازو پیر دیاربوو .
- کێت دەوێ ؟.
بەهێمنی و لەسەرخۆ پێی گوت : -
- من - ب - م ... خێزانەکەم لێرە ماون ؟.
ئافرەتەکە بە دەنگێکی بەرز ووتی : -
- ئێستا ناسیمیتەوە .. خۆ من لەپێشدا نەتمناسی !
«ب» سەری دانەواندبوو ، تەماشای بەرپێی خۆی دەکرد . لێی پرسییەوە : -
- لێرە ماون ... هێشتا ..
- ئێستاکە ناسیمیتەوە ... ئەوە گەڕایتەوە ها ؟.
- بەڵێ گەڕامەوە .
تا ئەم کاتەش هێشتا سۆراخی خێزانەکەی نەزانیبوو ، بۆیە دیسانەوە پرسی :
- لێرە دادەنیشن ؟.
دەرگاوانەکە تائەو کاتە دەسکی دەرگاکەی توند گرتبوو ، بەریداو کەمێ هاتە پێشترەوە « گەڕایتەوەها .. » جار نەجارێ ئەوەی دووپات دەکردەوە .
- ناسیتم .. ئێستا ناسیتمەوە .. بەڵێ بەڵێ لێرەیە ... ڕەنگە نەزانێ کەتۆ گەڕاویتەتەوە .. ناسیتم بەڵێ لێرەیە ..
- ئەی کوڕەکەم ؟.
- ئەویش باشە .. گەورەبوە .. ساغ و سەلیمە ها .. دەتناسم .
« ب » ورتەی نەکرد .. ئافرەتەکە بەدەنگە لەرزۆکەکەی فەرمووی لێکرد .
- وەرە ژوورەوە .. دەزانم بێگوناهن .. دەمزانی ڕۆژێك دێ بەربین .
- سێ جارم لەدەرگادا ، کەس بەدەنگمەوە نەهات .
- فەرموو .. فەرموو . کەس لەماڵەوە نییە ، کرێچی یەکانیش لەماڵ نین ..
« ب » بێدەنگ چاوی بڕییە بەر پێی خۆی ..
- دەفەرموو .. دوای نیوەڕۆ دێتەوە . کرێ گرتەیان لەگەڵدایە ؟.

- مرۆڤی چاکن .. خێزانەکەی تۆش ئافرەتی چاکە .. ها .. دەتناسم .. گەڕایتەوەها ؟.
« ب » هیچی نەگوت ..
- کلیلی ژوورەکەتانم لەلایە .. بڕۆ پشوویەك بدە تا دێتەوە ..
- تۆ سەرناکەوی ؟.
- دێم ژوورەکەت پیشان دەدەم .. دوو ژوورەکەی ئەملام بەچوار کەس داوە .. گیورگی و خێزانەکەشت ژوورێك .. چێشتخانەو حەمامیان هاوبەشە ..
« ب » بۆ ماوەیەك کپ بوو .. دواجا ووتی :
- خۆ دەتوانم بچمە سەرەوە ؟.. چێشتخانەو حەمامیان هاوبەشە ها ؟!.
- بەڵێ بۆ هەردوو لایانە .
- دەتوانم خۆم بشۆم ؟
بەپێکەنینەوە وەڵامی دایەوە :
- گوایە بۆ ناتوانی ؟.
بۆ ئەوەی زیاتر دڵنیای بکات قۆڵی گرت و ووتی : -
- ژوور ژووری خۆتان نییە ؟ ... هەندێ سوتەمەنیتان لەپارەوە ماوەتەوە .. دەتەوێ حەمامەکەت بۆ گەرم کەم ؟ ... بیرم نەبوو ، کرێچی یەکان بەڕۆژ کلیلی حەمامەکە لەگەڵ خۆیاندا دەبەن .
« ب » بێدەنگ بوو هیچی نەگوت و سەری دانەواند ..
- بڕۆمە سەرەوە ؟
- ئارەزووی خۆتە .. دەتەوێ وەرە ژوورەکەی من .
- سوپاستان دەکەم ، بچمە سەرەوە چاترە ژوورێکی بچکۆلەی ڕوو لەشەماڵ بوو . ژوورەکە بەرامبەر پەنجەرە بچکۆلەکەوە دارێك ڕوابوو لەشووشەی تەڵخی پەنجەرەکەوە تەماشا بکەیت ، بەلای ڕاستدا تەپەیەکی بەرز دیارە . لاسك و گەڵا سەوزەکانی داری خوار پەنجەرەکە ، ئەوەندەی کە ژوورەکەی تاریك کردبوو ، کەبەتەنها مایەوە ، هەناسە سواری کەمێ لەمەو پێشی ڕوایەوە ، هەموو شتێکی ناو ژوورەکە بۆنی خێزانەکەی پێدەدا . لەبەر پەنجەرەکەدا دانیشت . هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا . ژوورەکە بەحاڵ جێگای دۆڵابە کۆنێك و قەرەوێڵەیەکی تیابوەوە . مێزێك و کورسی یەکیش خزێنرابوونە قوژبنێکیەوە . بۆ ئەوەی خۆت بگەیەنیتە قەرەوێڵەکە دەبێ کورسی و مێزەکە بترازێنی .. لەسەر نوێنەکە

دانیشت ، سەرمێزەکە سیخناخە ، : کتێب ، کەلوپەل ، یاری
مندالان ، ئاوێنەیە بچووکیش دانراوبوو ، هەلیگرت و تەماشای
خۆی کرد ، هەمان روخساری ناو ئاوێنەبەنەکەی بەردەم
کۆگاکەی بینی . لە جێگاکەی خۆی داینایەوە ، دەستکاری
شت و مەکی ژنەکەی نەکرد . تۆپێکی سووری بچکۆلە لەناو
تەپلەکی جگەرەیەکدا دانرابوو .. لەم کاتەدا دەرگاوانەکە
فنجانێ قاوەی شیرداری بۆهێنا . هەر ئەوەندە ئافرەتەکە چووە
دەرەوە بەپەلەپەل خواردییەوە . زۆری نەبرد ، ئافرەتێکی
دراوسێیان ، قاوەیەک و پارچەیە کەرەو لەتێ نان و سێوێکی
لاسوورەی هێنا ـ سێوەکە هەر لەسێوە لاسوورەکانی دوکانی
میوەفرۆشەکە دەچوو ـ ئافرەتەکە چاوەکانی پڕ بووبوون ،
دوای ئەوەی کەچووە دەرەو ئەمانەشی خوارد .. هێشتا
سەعاتەکەی نەنابووەوە ، بۆیە نەیدەزانی لەکەیەوە
لەژوورەکەدایە ..

ئەو رێگایەی کەکەوتبووە پاین باخچەی بەردەرگاکەوە
چۆلبوو ، لەنێوان دارەکانەوە بایەکی فێنك هەلیکردبوو ،
لەپەنجەرەکەوە دەهاتە ژوورێ . تیشکی ئەو دەمەو ئێوارەیە
دەکەوتە سەر دیوارەکان ، ژوورەکە لێلداهاتبوو . دابەزییە
خوارەوە ، لەتەنیشت دەرگای باخچەکەوە چاوی
لەرێگاکەبڕی . زۆری نەخایاند لەپێچی رێگاکەوە دەرکەوت .
چوار پێنج مندالی لەگەلدابوو . کەلەدوورەوە « ب » ی بینی ،
پێی بەیەکاهات ، هێشتا چەند هەنگاوێکی مابوو بەیەك بگەن
راوەستا . باوەڕی بەچاوی خۆی نەکرد ، ئیمجا خێراتر پێی
هەلگرت و کردی بەنەرمەغار . « ب » هەر لەدوورەوە بە بلووزە
خورییە میلدارەکەیدا ناسییەوە ، چەند رۆژێك پێش گرتنی
ئەو بلووزەی بۆ کڕیبوو ، کەیشتنەیەك ، باوەشیان
بۆیەك کردەوە ، یەکتریان لەئامێزگرت . بۆچەند ساتێك لەیەك
ئالان . « ب » پشتی بە دیواری باخچەکەوەدا .. لەپشت
ئافرەتەکەیەوە چوارپێنج مندال راوەستابوون . سەرسامی و
بێزاری لەروومەتیاندا دیاربوو .. مندالەکان لەتەمەنی پێنج
شەش سالان بوون .

ـ کامیانە ؟.

ئافرەتەکە پرمەی لەگریاندا .

ـ بابچینە سەرەوە .

« ب » دەستی خستە سەر شانی و بەهێمنییەوە پێی گوت .

ـ مەگری ..

بەدەم هەنسکدانەوە دووبارە ووتی :

ـ بابچینە سەرەوە .

ـ مەگری .. مەگری .. کامیان کوڕی ....

ئافرەتەکە دەرگای نێوان دوو (لەپلاکەکەی) کردەوەو چووە
ژوورەوە ... « هەر وەکو جاران لەڕو لاوازە ... هێشتا کچ
بوو ، جارێکیان چێلێك ترساندی وەکو ئێستا چۆن پەشۆکاوە ،
ئەوکاتە ئاواپەشۆکاو رایکرد .. » ـ ب ـ لەدەرگای نهۆمی
یەکەمدا پێی گەیشت ، سنگی لەژێر بلووزە میلدارەکەیدا
بەرزدەبووەوەو دادەکەوت . نەدەگریا بەلام چاوەکانی هێشتا
تەڕبوون . بەگوێیا چرپاندی :

ـ بابچینە ژوورەوە

ـ خەلکی کەی لێیە ..

ـ دەزانم ...... بابچینە ژوورەوە .

ـ چوویتە سەرەوە ؟.

ـ لەسەرەوە بووم ... کامیان کوڕیمنە ؟.

لەژوورەوە «ب» دانیشت و خێزانەکەی چۆکی «ب» لەباوەش
گرت و سەری ناوە بان رانیەوەو بە کولگریا .. پرچە
قاوەییەکەی تالە تالە سپی تێکەوتبوو ، بەدەم هەنسکەوە
ووتی :

ـ زۆرم چاوەڕێ کردی ...

«ب» قامکی لەرزۆکی خستبووە ناو قژە قاوەییەکەیەوەو بە
ئاستەم بۆی شانەدەکرد .

ـ بەگران لەسەرت تێپەڕبوو ؟.

ـ خۆشەویستەکەم . چەند جارێ لەسەریەکە ئاوای پێگوت .

«ب» لەگەل دەست بەقژهێنانەوە بەگوێیا چرپاندی :

ـ پیر بووم ؟.

ئافرەتەکە کە تا ئەوکاتە سەری نابووە بان رانی مێردەکەیەوە ،
سەری هەلبڕی و باشتر خۆی لێ نزیك کردەوەو ووتی :

ـ لەبەرچاوی من وەك ئەو رۆژە وای ، کەلە یەك دابڕاین .

ـ پیر نە بوومە ؟.

ـ تائەو رۆژە دەمرم خۆشم دەوێی .

ـ خۆشمت دەوێ ؟

ئافرەتەکە قولپی گریان شانی پێهەلتەکاند ، ئەمجارەش
گریا .. بەکول گریا .

« ب » دەستی لەناو قژیدا دەرهێنا
- دەتوانی سەر لەنوێ لەگەڵمدا رابێی ؟ دەتوانی لەگەڵمدا بژی ؟.
- بێجگە لەتۆ کەسیکەم خۆش نەویستووە .
- چاوەڕێت کردم ؟
- هەردەم لەگەڵتا دەژیام .. رۆژ نەبوو بیرلە تۆ نەکەمەوە .. دەمزانی رۆژێ دێت دەگەڕێیتەوە ، ئەگینا بۆم نەدەچووەسەر .. کوڕەکەت هەر لەخۆت دەچێ ..
- خۆشت دەوێم ؟.
- لەتۆ بەولاوە دڵم بەکەس نەداوە ، باگۆڕابیت منهەر تۆم خۆش دەوێت .
- پیربووم ... گۆڕاوم ؟.
ئافرەتەکە دەستی بەگریان کردەوە بەدەم گریانەوە باشتر چۆکی لەئامێز گرتەوە . « ب » دووبارە دەستی بە قژیدا هێنا ..
- دەتوانین منالێکی کەمان ببێ ؟.
« ب » کەمێ راماو ووتی :
- ئەگەر جاران ئاسا بەراستی خۆشت بوێم . هەستە بزانم ...
ئافرەتەکە هەستایە پێ و ووتی :
- بڕۆم بانگی کەمە ژوورەوە ؟.
- نەخێر .. جارێ راوەستە .. هێشتا من بەلای ئەوەوە کابرایەکی نەناسم .. باماوەیەکی کە پێکەوە بین ..
لە باخچەکەدایە ؟!.
- دەڕۆمو پێی دەڵێم جارێ چاوەڕوانبە .
کە ئافرەتەکە گەڕایەوە « ب » لەبەر پەنجەرەکەدا راوەستابوو ، تەماشای دەرەوەی دەکرد . شانی تەسك بووبووەوەو پشتیشی کۆم دیاربوو .. کەئافرەتەکە دەرگاکەی کردەوە ، ئەم وەرنەچەرخا . بۆ ماوەیەك هەر وا بەبێدەنگی مایەوە .
- پێم گوت : گوڵ بۆ باوکی بچنێ ...
« ب » هێشتا هەر تەماشای دەرەوەی دەکرد ، ئەمیش بەدەنگێکی لەرزۆکەوە بەردەوام بوو :
- گوڵە لەیلاکەکان پشکووتوون .. چەپکە گوڵی لەیلاك بۆباوکی دەچنێ ..
- دەتوانێ لەگەڵما رابێی ؟.
- کەسێکی دیکەم خۆشنەویستووە تاکو .... شەوو رۆژ بیروهۆشم لەلای تۆبوو .. هەموو رۆژێکیش باسی تۆم بۆدەکرد ...
لەپڕ وەرچەرخا . ژنەکەی لەئامێزگرت . سەرنجی لەروومەتی گیرکرد .. زەردەی خۆرئاوا ژوورەکەیانی پڕ کردبوو ، کە دەکەوتە سەر روومەتی پیردیاربوو ، لەدڵەوە ئەمەی پێ خۆش بوو .
بەڵام لەو وێنەیەی جوانتری بینی کەبە درێژایی حەوتساڵ هەموو رۆژێك دەیهێنایەوە بەر چاوی خۆی چاوەکانی لێك نابوون ، لێوانی کەمێك لەیەك ترازا بوون ، هەناسەی گەرمی بەر لێوی دەکەوت ، لەژێر برژانگی درێژیدا چاوە فرمێسك تیا قەتیس ماوەکانی بریسكو هوڕیان بوو ، چەند جارێ چاوەکانی ماچکرد ، دواجار بە ئاستەم لەیەك ترازان .
- کورەکەمانت خۆش بوێ .
- خۆشم دەوێ ... رادێم لەگەڵیاو خۆشم دەوێ .
- کوڕی تۆیە .
- کوڕی تۆیشە .

ئافرەتەکە دیسانەوە بارەشی پیا کردەوە
- دەتشۆرم .
کەلوپەلە لۆچاوییەکەی داکەند . لەسەر نوێنەکە راکشا . لەتەشتێکدا ئاوی گەرمی هێنا . خاولییەکی پاکی بۆدەرکرد .. لەتەوقی سەریەوە تاپەنجەی پێی پاك پاك شوشتی .. دوو جار ئاوی تەشتەکەی گۆڕی .. هۆشێکی بەبەراهات . هەستی بەحەسانەوە کرد :
- رادێی لەگەڵما ؟.
- گیانەکەم .
- ئەمشەو پێکەوە دەبین ؟
- بێگومان .
- ئەی منالەکە لەکوێ دانێین ؟.
- لەزەویدا جێێ بۆ رادەخەم ... ئەوخەوی زۆرگرانە .
- پێکەوە شەو دەبەینە سەر ؟.
- تادەمرین هەموو شەوێك پێکەوە دەبین .

(1) شاری بۆدابست ، رووباری دانوب دەیکات بە دووکەرتەوە ، بۆدا و بشت .
(2) فۆرینت پارەی هەنگاریایە

## لە نووسەرە دڵسۆزە ئاوارە بووەکانمان

# محمد ئەمین بۆز ئەرسەلان
# «شێرۆ»

**« نەریمان »**

ئەم کوردەی ئێمە نووسەری دڵسۆزی ئەوتۆی لێهەڵکەوتوە کەچەرمەسەری‌و نەبوونی‌و ئاوارەیی لەخزمەت کردن ساردی نەکردوونەتەوە ئەگەر قۆرتێکیان هاتبێتە بەرو مەترسی‌یەکیان کەوتبێتە سەر رێ‌و برسیەتیەکیان چێشتبێت‌و دەربەدەرو جگەریان سوتابێت زیاتر بەرەو پێشەوە تەکانیان داوە (بێکەس ، پیرەمێرد ، قانع ، رەفیق حلمی ، گۆران) هەر یەکەیان نموونەیەکی ئاشکراو شۆرە سوارێکی مەیدان‌بوون ئەم کەلەنووسەرانەمان سەریان نایەوە ناوێکی گەورەیان بۆ ئەم میللەتە بەجێ هێشت نەك پارەو پووڵ‌و کۆشك‌و سەرا .

ناوی ئەم شۆرە سوارانە مانگ نی‌یە لەلاپەرەی رۆژنامەو گۆڤارەکانمان یان لەکتێبە بڵاوکراوەکانماندا نەدرەوشێنەوە بەڵام رووناکبیری ئەوتۆشمان هەبوەو هەیە ناوی لەئارادانیە بەڵام دەربەدەری‌و نەبوونی‌و زیندان‌و تێهەڵدان‌و جگەر سوتان‌و ماڵ وێرانی ئەوەندە چێشتوە ئەوەندەی‌تر پێی قاڵ بوەو زیاتر بەرەو خزمەت کردنی روناکبیری تەکانی داوە نموونەی هەرە دیاری‌و ئاشکرامان مامۆستا (محمد ئەمین بۆز ئەرسەلان) یان (شێرۆ)یە .

زوربەی زۆری نوسەرو خوێنەرانمان نەك ئاگایان لەخزمەتە بێ هاوتاکانی شێرۆ نیە بەڵکو ناویشی نەهاتوەتە بەر گوێیان لەبەر ئەوەی ئەمە دە دوانزدە ساڵێکە پەیوەندیم لەگەڵ ئەم زانایەدا هەیە وەك (کاساوسی‌کەی) جاران کتێبمان بۆیەك ناردوە بەپێویستی دەزانم بەخوێنەری کوردی خۆمانی بناسێنم . (محمد ئەمین) لەساڵی ١٩٣٤ لە ناوچەی «لیچە»ی سەربە پارێزگای (دیاربەکر)ی کوردستانی تورکیا لەدایك بووە . نووسین‌و خوێندنی لای باوکی فێربوە کەپێش نوێژی مزگەوتی ناوچەکەیان بوە تا ساڵی ١٩٥٦ قوتابخانەی ئاینی تەواو کردوەو لە «ئەنقەرەوە» چوەتە تاقیکردنەوەی (مفتی) تی‌یەوەو تیادا سەرکەوتوەو بوەتە مفتی ناوچەی (هینە)ی سەر بە پارێزگای «دیاربەکر» دوو ساڵ سەربازی پێکراوەو گەراوەتەوە سەر وەزیفەکەی خۆی ئنجا لە (مەلاتیە) بوە یاریدەدەری مفتی پارێزگاو دەستی داوەتە نووسین‌و نازناوی «بۆز ئەرسەلان»ی لە نووسینە تورکیەکانیدا هەڵبژاردوە واتە «شێرەبۆر» لە نووسینە کوردی‌یەکانیدا هەر بەشێری (شێرۆ)؛ پەسەند کردوە لە ساڵی ١٩٦٥ لە کتێبەکەیدا بە، گرفتەکانی رۆژهەڵات) کەبەتورکیە داوای کردوە رێ بدەن بەوەی ئیستگەیەك بۆ هەشت ملیۆنە کورد دابنرێت‌و لەقوتابخانەکاندا بەکوردی بخوێنرێت لەسەر ئەمە کتوپڕ لەوەزیفە دەرکراوەو نەفی کراوەتە شا رۆچکەیەکی سەرسنوری یۆنان ، هەر لەوێ ئەلف‌و بێ‌یەکی بەکوردی بەتیپی لاتینی چاپکردووە کاتێك کاربەدەستان بەمەیان زانی ئەلف‌و بێ‌کەیان کت‌و مت کردو خۆیان قۆڵ بەست کردو توورردایە زیندانەوە ، لە ناو زیندانەوە تروسکایی‌یەکی دەست کەوت بەربەرەکانی بریارەکەی کردو بەرپەچیانی دایەوە ناچار دادگای ئیستئیناف پشتگیری لێکردوو بەرەڵلاکراو ئەمجارە ئەلف‌و بێ‌یەکەی چاپ

کردەوەو بڕیاری دادگاشی خستە ناوەوەی تاوەکوو بەدڵنیاییەوە بلاوبێتەوە هەزاران دانەی لەچەند رۆژێکدا لێ فرۆشرا ، ئەمە بووە هاندەرێکی هات مێژوە بەنرخەکەی (شەرەفنامە)ی کرد بەتورکی بەچاپی گەیاندو لەپاڵ ئەمەشدا چەندکتێبێکی تری چاپکردو لاوان و قوتابیان دەوریان لێدا ساڵی ١٩٧٠ جارێکی تر خرایە بەندیخانەوە چوار ساڵی رەبەق تێدا مایەوە کە بەرەڵلا بوو دەستی دایە نووسین لە گۆڤارو رۆژنامەکاندا ئنجا بەئاشکراتر دەنگی بەرز کردەوە ئەمە کاربەدەستانی هەژاند ئەمیش ناچار خۆی شاردەوە لەهەڵمەت بردنێکدا بۆسەر یەکێك لەو شوێنانەی کە گومانی لێوە دەکرا لەدەست درێژ کردنێکدا «عبدالغنی» کوڕی خوێنی بەناهەق رژا باوکەش لەوکاتە خاکی وولاتی بەجێ هێشت و رویکردە هاندەران ئەوەبوو لەساڵی ١٩٧٩ خۆی لەوولاتی سوید گرتەوە دەستی دایەوە قەڵەم و لەوساکە بەگوڕتر هاتەوە کۆڕی خزمەت کردن و پەیتا پەیتا ئەوا کتێب لەچاپ دەدات و بلاویان دەکاتەوەو جاربەجارێکش بەدیاری بۆمانی دەنێرێت ، ئێمەش بەرامبەری دەنەوێنەوە .

لەم چەند دێرەی خوارەوەدا ئێمە تەنها کتێبە چاپکراوەکانی ئەخەینە بەردەست دەرفەت نیە نوسینی ناو رۆژنامەو گۆڤارەکان و لەپرۆژەکانی داهاتووی بدوێین .

**ناوی کتێبەکان :**

1 - دەرەبەگایەتی لە روانگەی ئیسلامەوە ، تورکیە (1964) لە ئەنقەرە چاپکراوە ، ژمارەی لاپەرەکانی (172)ە .

2 - گیروگرفتەکانی رۆژهەلات - تورکیە ، ساڵی (1965) لە (206) لاپەرەدا لەئەنقەرە چاپکراوە .

3 - ئەلف و بێی کوردی بەلاتینی ، ساڵی 1968 لە ئەستەمۆڵ لەقەوارەی (64) لاپەرەدا چاپکراوە .

4 - مەم و زین - کوردیو تورکیە . هەر لاپەرە کوردییەك بەرامبەرەکەی کراوەتە تورکی ، لەئەستەمۆڵ لە ساڵی 1968 چاپکردوە ، (491) لاپەرەیە .

5 - خەلافەت و نەتەوایەتی . بە تورکیە ، لەساڵی 1968 چاپکردوە ، (309) لاپەرەیە .

6 - بەشی یەکەمی شەرەفنامە بەتورکی ساڵی 1971 لە ئەستەمۆڵ چاپکراوە (527) لاپەرەیە .

7 - بەشی دووەمی شەرەفنامە بەتورکی ، ساڵی 1971 لە ئەستەمۆڵ چاپکردوە (305) لاپەرەیە .

8 - (ئەوانەی لەناوەوەن و ئەوانەی لەدەرەوەن) بە تورکییە لە ساڵی 1974 چاپکردوە دەربارەی کوردستانی تورکیایە لە ئەستەمۆڵ چاپکراوە بریتییە لە (242) لاپەرە .

9 - مێژووی کوردی میافارقین - بەتورکییە . لە عەرەبییەوە لەمێژووی میافارقین و آمدەکەی (ابن أزرقی فارقی) یەوە وەری گێراوە . لەئەستەمۆڵ لە ساڵی 1975 لە «242» لاپەرەدا چاپکراوە .

10 - کۆمارە کوردییەکەی مهاباد - بەتورکییە لەساڵی 1967 لەئەستەمۆڵ لە (296) لاپەرەدا چاپکراوە .

11 - لبنانی شۆرشگێر - بەتورکییە لە ساڵی 1976 لە ئەستەمۆڵ لە (252) لاپەرەدا چاپکراوە .

12 - گێرە شێوێنی چیرۆکێکی بەزمەساتە دەربارەی کوردستانی تورکیا لەئەستەمۆڵ ساڵی (1977) چاپکراوە (67) لاپەرەیە .

13 - فەرهەنگی کوردی - تورکی . فەرهەنگەکەی یوسف ضیاء الدین پاشایە (الهدیة الحمیدیة) لەچەشنی فەرهەنگدا بە چاپی گەیاندووە ، ساڵی 1978 لە ئەستەمۆڵ چاپکراوە «400» لاپەرەیە .

14 - (مەیرو) کۆمەڵە چیرۆکێکی رامیارییە دەربارەی کوردی تورکیا لە ئەستەمۆڵ لە ساڵی (1979) لە (٦٧) لاپەرەدا چاپکراوە . مامۆستا (صەبری بوتانی) ئەم چیرۆکانەی لێ وەرگێراوەتە سەر عەرەبی و لەرۆژنامەی (العراق) دا بلاوی کردوەتەوە (فم الذئب ، کیف أصبح التبغ تبناً ، القدر ، الطاقیة) .

15 - (میرزۆرو) بۆمناڵانە بەوێنەوە چەند چیرۆکێکە بەکوردی لە ساڵی 1981 لەسوید چاپکردوە (75) لاپەرەیە .

16 - (بلویرژەن) چەند چیرۆکێکە بۆمندالان بەوێنەوە دەربراوە ، لە ساڵی 1982 لەسوید چاپکراوە (71) لاپەرەیە .

17 - «کچەخانمەکە» چیرۆکە بۆ مندالان بەوێنەوە دەربراوە . لەساڵی 1982 لەسوید چاپکراوە لە (76) لاپەرەدا .

ئێستاش واخەریکە رۆژنامەی «ژین» چاپ دەکاتەوە . ئەورۆژنامەیەی کە لە ساڵانی 1918 — 1919 لەئەستەمۆڵ پێنج ژمارەی لێ چاپکراوە ،

محمد عبدالجبار سلفەیی

# چەند شتێك دەربارەی دەربڕینی هونەری

حەز دەکەم پێش ئەوەی بچمە نێو باسەکەوە پەنجە بۆ ئـەوە ڕاکێشم کـە سـەرەڕای ئـەوەی بـاری ڕۆشنبیـری میللەتەکەمان لە برەودایەو ڕۆژ لە دوای ڕۆژ پەرەدەسێنێت ، بەلام تاوەکو ئێستایش بینەری وەهامان هەیە کە ناتوانێت لە بەرهەمێك تێبگاتو چێژی لێ وەربگرێت بێگومان مەبەستیشم لەبەرهەمی تەشکیلیە ، . بەڕێکەوت لە پیشانگایەکدا کۆمەلێ لاوم بەدی کرد کەوا بەرامبەر بە تابلۆیەك ڕاوەستابوون و لێی وورد دەبـوونەوە ، هـەریەکـەیان ڕایـەکی دەردەبـڕیو بـۆ چوونێکی خۆی دەخستەڕوو . بە چاکە ، یا ، خراپە ، کێشە ، مـرۆڤـو خـاکیـان دەزانی ! لەڕاستیشدا خـۆی دیمـەنێکی سروشتی جوانی کوردستان بوو هونەرمەندەکە بە بۆیەی تەنكو کاڵ ڕازاندبویەوە .

جا بۆیە هیوادارم ڕۆشنبیرو ئەدیبانمان قۆلی لێ هەلمالنو کەمو زۆر لەم ڕووەوە شت بنووسنو ڕەخنەی هونەری خۆیان بە خوێنەران ئاشنا بکەن تا لە ئاکامدا جەماوەرێکی ڕۆشنبیرتر پەیدابێتو ئەو تەلیسمەیان بۆ بەتاڵ بکرێتەوە کە گوایە هونەر (بەتایبەتی هونەری نوێ) تێگەیشتنی کارێکی گرانە !

ئێمە لێرەدا کە لە دەربڕین دەدوێین زیاتر مەبەستمان ئەو دەربڕینەیە کە هونەرمـەندانی تـەشکیل پێی هـەلدەستنو دەیکەنە هەوێنو بڕبڕەی پشتی کارە هونەریەکانیان ، جا ئەو بەرهەمە پەیکەر بێت یاخود وێنە ، ئەوە هەریەکێکیان لە چوار چێوەیەکی تایبەتی خۆی دایەق دەداتەوە .

لە کاتێکدا بەرهەمێك بەرەو ڕووی جەماوەر دەکرێتەوە بـەرچاوی دەکـەوێتە چـەندەهـا کەس ، کـە تـواناای چێـژ لێوەرگرتنیان بە پێی ڕادەی زانستیو هەست کـردنیان بـە جوانی دەگۆڕێت . بۆ ئەوەی زیاتر بینەران بناسین ئەوا بە پێی هـەست کردن بـە جوانیو چێـژوەرگـرتنیـان دەکـرێنـە دوو بەشەوە . یەکەمیان ئەو هونەر دۆستانەن کە تەنها یەك ڕووی بەرهەمەکە دەبیننو لایەنەکانی تری فەرامۆش دەکەن ، یاخود هەر دەرکی پێ ناکەن هەر لە جۆری بۆیە دانانەوە بیگرە تاوەکو دەگاتە چۆنیەتی هەلسوڕانی پەرەمووچەو قەلەم . ئەم بەشەی بینەران کە پۆلێنمان کرد ، بەوە جوێ دەکرێنەوە کەوا کەمتر سیفـەتی بینەری تـەواویان تێدایـە ، چونکی تـەنهـا چـاو بەکاردەهێنن بۆ بینینی تابلۆکە یاخود پەیکەرەکە ، کـەچی بۆ تێگەیشتنی کارێکی تەشکیلی دەبێت لە پاڵ چاودا هەستو هۆشی بینەرەکە بکەوێتە کارو شتی شاراوەی نێو بەرهەمەکە بە چاوی هەست ببینێتو جوانیە شاراوەکانیش بقۆزێتەوە . ئەم مەرجە ڕاستەقینانە لە سیفەتی هونەر دۆستی ڕاستـین کە بـە بەشی دووەمی بینەران دادەنرێن .

زۆربەی بەرهەمـەبەپێزەکانی جیهان ناوەڕۆکەکانیان لە دوو نێوەندا دەسوڕێنەوەو چەشنی ڕووەك لە دوو بەش پێك دێن بەشێکی شاراوەیە وەکو ڕەگی ڕووەك بەشەکەی تریشی دیارەو



به بەرچاوەوەیە وەکو گەلاولق و پۆپ . جا بەو مەبەستەی بچینە ناو قولایی هونەرەوەو ، شارەزای پڕ جۆشەکەی ببین ، ئەوا وەکو پێویستێك دەبێت نموونە بۆ باسەکەمان بهێنینەوەو جوانیەکەی لەڕووی ناوەڕۆك و فۆرمەوە بخەینە ڕوو .

شایانی باسە زۆربەی نمونەکان لە شاکارە هونەریەکانی قوتابخانەی (دەربڕین خوازی) Expressionism وەردەگرین . دەربڕین بریتی یە لەگەیاندنی مەبەستێك یاخود باسکردنی کارەساتێك و حالەتێکی نەفسی مۆدێلەکە .

بە نیسبەت (هێربەرت ڕید) ەوە کە ڕەخنەگرێکی هونەری ی ناسراوە ، دەربڕین هونەرێکە هەوڵ و تەقەلای پێشکەش کردنی زاتی یە ، لەبەرئەوە هەمیشە هەڵچوونی ناوەکی دەخاتە پێش هەموو شتەکانی ترەوە . لەم بارەیەوە دەڵێت (دەربڕین خوازی لە پێش هەموو شتێکدا باس لە هەست کردنی هونەرمەند دەکات ، تەنانەت ئەگەر نرخەکەیشی شێواندنی سروشت بێت و ، زیادە ڕۆی ی واقعی ئەوتۆی تیا ڕەنگبداتەوە کە نزیکی بکاتەوە لە گاڵتە جاڕی )[1] .

دەربڕین بەزۆری لە دوو شێوازدا دەبێت ، یەکێکیان بە دەربڕینی خودی دەناسرێت ، کە تێ ی دا باری نەفسی و دەروونی هونەرمەندەکە ، یاخود مۆدێلەکە دەخاتە ڕوو بەرهەمەکەیش دەبێتە کلیلی دەرگای ناخ و دەروونی کەسەکەو ، بە هۆیەوە دەتوانرێت ژیانی کەسایەتی ئەو تاکە شارەزابین . بەلام شێوازی دووهەم شێوازێکی زاڵ و باوە ڕێبازی زۆربەی هونەرمەندەکانی جیهان بووە ، مەسەلەیەکی کۆمەلایەتی مەوزووعی دەخاتە ڕوو ، زۆر جاریش گیانێکی ڕەخنەگرانەی دەخاتە بەرو ڕوو بەڕووی خەڵکی دەکاتەوە .

هونەرمەندی هۆڵەندی ی مەزن ڕامبرانت (1606 — 1669) باشترین نموونەیە بۆ ئەو وێنە کێشانەی کە لە قوتابخانەی دەربڕین خوازی کۆن دا جێ پەنجەیان وەکو نەخشی سەربەرد ماوەتەوە . ئەم وێنە کێشە ژمارەیە زۆر تابلۆی خۆی کێشاوەو هەریەکەیان باسی باروو زرووفی ئەو ڕۆژانە دەکەن کەوا ڕامبرانت تیایدا ژیاوە . گەر تیشکێکی زانستی یانە بخەینە سەر هەریەکێ لەو وێنانە یەکسەر دەتوانین دەست نیشانی قۆناخەکانی ژیانی بکەین . بۆرتریتە سەرەتایی یەکانی ڕامبرانت واتە هی سەردەمی لاوێتی ، بەتەنکی بۆیە دانان و دەورو پشتێکی ئەندێشاوی ڕۆمانتیکیانەوە جوێ دەکرێنەوە . گومانی تیا نیە ئەم دیاردانە شتێکی هاوبەشە لە نێوان هەرزەکاران دا کە جیهانێکی پەمەو شین بۆ خۆیان دروست دەکەن ، بەلام ئەو وێنانەی پاش ئەم قۆناخە دێن کە قۆناخی دووهەمە بەوە دەناسرێنەوە کەوا هونەرمەند زۆر پەشۆکاو دیارەو سەرو قژی بە تێك ئالاوی بەسەر شان و مل دا شۆڕبوونەتەوە . کۆمەڵە وێنەی (قاند) ی ساڵی (1628) وکۆمەڵە وێنەی (هیڤات) ی شاری لەندەن چاکترین بەڵگەن بۆ ئەم قۆناخە . ئەو وێنانەی کە لە تەمەنی پیری دا کێشاونی بینەر

دەخەنە نێو بێزاریو دڵ تەنگیەوە . پشتەکیی ئەم وێنانە بە زەردێکی چاوبێزارکەر کێشراون لەبەرئەوە ئەم قۆناغە بە کۆمەڵەی زێڕینی ناو دەبرێت ) ، هونەرمەند خۆیشی تەمو مژو ئاڵۆزیەکی زۆر لەدەمو چاویدا بەدی دەکرێت ، ئەوەی شایانی ووتنە ڕامبرانت لەم سەردەمەی ژیانیدا کەوتبوە ژێر قەرزێکی زۆرەوە بۆی مەیسەر نەدەکراو پارەی دانەوەی نەبوو ، زۆر پەرێشان بوو بۆ پارەو پوول ، (جا هەقی نییە گەر لە وێنە کردنیشدا خەون بە زێڕو زیوەوە ببینێت ) ، لە ئاکامی ئەو قەرزانەدا ماڵەکەیان هەرزان فرۆش کرد ، دەیان وێنەو تابلۆکە ئەمڕۆکە لە کڕین نایەن ئەوڕۆژە زۆر بەبێ نرخانە دەیان فرۆشتن و هەرزان دەیان قەبڵاندن .

باس هەر باسی مەسەلەی دەربڕینی هونەریە ، جا بۆ نموونەی بەرهەمی تازە ئەوا وێنەکێشی هۆڵەندی بەناوبانگ ڤان گوخ باشترین نموونەیەو بێ سێو دوو پێشەوای قوتابخانەی (دەربڕین خوازی) نوێیەو هەر ئەویش پەرە پێدەریەتی . هونەرمەند ڤان گوخ چەوساوەی سەردەمی خۆی بوو ، سەرتاپا ژیانی خەمو ناسۆری بوو ، هەموو ژیانی بریتی بوو لە زنجیرە ساڵێکی تەماوی کەوا سەرەتاکەی لە ساڵی (1853) وە دەست پێ دەکات و کۆتاییەکەیشی لە ساڵی (1890) دا بە کوشتنی خۆی کۆتایی دێت .

ڤان گوخ ئەوین داری خۆر بوو حەزی بە تیشکێکی وەها دەکرد کە هەموو ڕووکە شێکی دەرەکی مرۆڤ بسوتێنێت و تەنها وەکو گیانێك بمێنێتەوە ، چونکە گیان سەنگی تەواوە بۆ کێشانەی مرۆڤ و تەنەکانیتر ، هەر لەبەر ئەو هۆیە بوو زۆر کوڵە بەڕۆژەی خۆش دەویست کەوا هەموو دەم ڕووەو خۆر وەستاوە . هەمیشە دەیگوت کەوا ( تیشك گیان ڕاپێچ دەکات ) .

مرۆڤ لە هونەرەکەی هونەرمەند ڤان گوخ بگاو شارەزا بێت ، ئەوا بێگومان دەتوانێت لە جۆری ژیانەکەی بەئاگابێت و کونج وکەلەبەری دەروونیی بناسێت ، چونکە هەروەکو دەڵێن هونەرمەند وێنەی هەر شتێکی کێشا بێت ، ئەوا بەشێ لە ژیانی خۆیی تیا تۆمار کردووە .

تابلۆی « دەغلی گەنم » وەکو جوانترین نموونەو باشترین بەڵگە دەکەینە مایەی باسەکەمانو ، تیشکی سەرنجی دەخەینە سەر . لە ڕاستیدا گوخ زۆر جار وێنەی دەغلی گەنمی بەزۆر شێوە کێشاوە . بەڵام ئەمەیان مەسەلەی دەربڕینەکەی زیاتر ڕەنگی تێدا داوەتەوە . لە وێنەکەدا سێ ڕێچکۆکە شۆڕ بوونەتەوەو بەناو جەرگەی کێڵگەدا دەڕوون ، بەڵام هیچ یەکێکیان کۆتاییەکەی دیار نیەو نابینرێت ، ئەم دیمەنە ببێتە جیهانێك بۆ نامۆیەك ئەوا هەڵبەتە دەستە وەستان دەوەستێت و دۆش دائەمێنێت ، ئایا کام ڕێگە بگرێت بەردەیگەیەنێتە خواستی خۆی ؟ بێگومان ئەمەی باسمان کرد ئەو خاڵە هاو بەشەیە لە نێوان گوخ و تابلۆکەدا ، چونکە گوخ ئاوەها دەسوڕایەوەو ڕێگەی دەبڕی . نامۆی سەردەمەکەی وکۆمەڵەکەی خۆی بوو هەروەکو دەڵێن هونەرمەندی مەزن پێش سەردەمەکەی خۆی دەکەوێت . ئەو گەنمە زەردە زێڕینیە چرەی بەدی دەکرێت و ڕێگەکان هەڵدەلووشێت ، هەڵبەتە ئەو ژیانە چرە دەگەیەنێت کە سەرباری هەموو شتێك گوخ بەڕێزەوە تەماشای دەکرد هەروەکو ووتوویەتی ( ... هەرکەسێ ژیانێکی ڕاستەقینە بژیو تووشی ئێشو ئازار بێت وە شکستە بێت ، بەلام بێئەوەی ببەزێت و چۆك دادات ئەوە گەلێ لەوانە چاترە کەوا هەر لەخۆشیو ئارامی دانو هیچ لەژیان نازانن جگە لە ئاسودەگیو هێمنی ... )[2] .

بەنیسبەت جۆری دووەمی دەربڕینەوە کە دەربڕینی مەوزووعیە هەروەکو لەوەو پێش ووتمان زۆر جار بۆنی ڕەخنەی لێدێ ودەنگی ناڕەزاییەو تۆماری زرووفێکی نالەباری دەورو پشت دەکا . دەبێت ئەوە بدرکێنرێت کەوا مەرج نییە تەنها باس کردنی زەقوا لە بەرهەمێك بکات بەهێز بێت ، بەڵکو چۆنیەتی گێڕانەوەکەیو هەڵبژاردنەکەی بابەتەکەو توانای هونەرمەندەکە لە دەربڕین دەکرێنە سەنگێك و بەرهەمەکەی پێ هەڵدەسەنگێنرێت .

• ئۆنۆری دۆمێ هونەرمەندێکی ڕیالیستی مەزن بوو مەردانەش ژیانی هەژارانی دەوروپشتی دەردەبڕیو باسیانی دەکرد ، دۆمێ خۆی پەروەردەی ئەو ژیانە بوو ، بۆیە توانیی زۆر ڕاستگۆیانە جۆری ژیانی ئەو سەردەمە دەقاو دەق دەربخات .

قەرەج کۆمەڵگایەکی گەڕۆکی بێ سەرو شوێنن ، بێپەروا بێ ئەوەی جێ بە خۆیان بگرن دەسوڕێنەوە ، بەبێ ماندووبوون سنووری دێهات و شارەکان دەبرن . وێنەکێشی

فـەرەنسی هنـری ڕۆسـۆ (1848 — 1903) ئـەم دیـاردەیـەی گـواستۆتـەوەو بەو پـەڕی جوانی کـاریەوە لە چـوار چێوەی تابلۆیەك‌دا بە ناوی (قەرەجێکی خەوتوو) یلخـود (گەڕۆکێکی نووستوو) کـە لە ساڵی (1897) دا کێشـاویەتی دەری بـڕیوە . لەگەڵ ئەوەش‌دا کـەڕۆسۆ بـەوێنەکێشی دەربـڕین خوازی لە قەڵەم نادرێت ... لەم تابلۆیەدا قەرەجێکی نووستوو دەبینرێت کەوا بەدیار گۆزە ئاوو تارەکەیەوە لە بیابانێکی کاکی بە کاکی‌دا چـاوی لەیەك نـاوەو خەوتـووە لەپاڵ سـەریشیەوە شێـرێـك ڕاوەستـاوەو خۆی داوەتـە بەر تیشکی هـەیڤـەکـەی ڕووی ئاسمان . ئەمە هەموو پێکهاتووی نێو تابلۆکەیە ، ئەی کەواتە دەبێت ئەمانـە کێ بن‌و لەکوێـوە هاتبێتن ؟ تـەنانـەت جێ‌ی پێ‌یـانیش لەسەر زەویـەکە بـەدی ناکـرێت . بەڵێ ڕۆسـۆش دەیەوێت بمانکاتە نێو ئەندێشەوەو کۆمەڵێ پرسیارمان سەبارەت بە سەرو شوێن‌و مەنزڵگای ئەو قەرەجانە بەبیردا بهێنێتەوە . جیاکۆمیتی (1901 — 1966) کـە پەیکـەرتاشێکی نـاسراوی ئـەم سەردەمەیە دەڵێت ئەو قەرەجە دەشێت لەو هەیڤەی ئاسمانەوە دابـەزیبێت ، چونکـە قەرەج بـەگشتی لە هـەمـوو نـاوچـەو هەرێمێك‌دا هەر بێ پسوولەن‌و خەڵکی بە نامۆیان دەزانن .

زفس خواوەندی زەریا لە نێو ئـاودا دۆزرایەوە ، ئـەم پـەیکەرە یـۆنانی‌یـە کۆنـە بەشێـوەیەکی وەهـا تاشـراوە کە جیاوازییەکی تەواوی لەگەڵ خواوەندەکانی‌تردا هەیە ، ئەگەر مرۆڤ تەماشای قۆڵ‌و بازووی بکات کەوا هەموو ماسولکەکانی گرژ بوونەتەوە بێ سێ‌و دوو وەها تێ‌ەگات کـەوا لەساتی ڕم تێ‌گرتن‌دایە چونکە پێ‌یەکیشی جوڵاندوەو چۆتە سەر نـووکی پەنجە .

هەر لە کۆنەوە کۆمەڵگای مرۆڤایەتی هەوڵی بێ ووچانی ئەوە بووە ، کەمەسەلەی شەڕ لە نێوبەرێت‌و تۆوی ئاشتی لە جێ‌ی بڕوێنێت . هەڵبەتە هونەرمەندانیش لەو هەڵمەتە بێ بەش نەبوونـەو ، هەردەم وەکـو چـینێکی ڕۆشنبیر ویستـوویانـە لەو دیـاردە دڵتەزێنـە چاو نـەقوچێنن‌و بـاسی لێوەبکـەن ، بەڵام هەندێکی تریان ویستـوویانـە چارەکـەشی وەدەرخەن‌و بنـج‌و بنەماکانی بە خەڵکی ئاشنا بکەن . تێکـڕای هونـەرمەنـدانی قوتابخانەی ڕیالیزمی سۆشیالیستی لەو جۆرانەن ... وێنەکێشی ناسراوی ئیسپانی فرانشیسکۆ گۆیـا (1746 — 1828) لە تابلۆی « دوو جـووتیار شـەرە تێڵا دەکـەن » دا زۆر بـەئـاسـانی‌و


مۆنش ـ هاوار

بـەجوانی گـاڵتە بـەو مرۆڤـانە دەکـات کـەوا شـەڕ دەکـەن وەبەتایبەتی کە سەربەیەك چین بن ، جا بۆیە دەبینین ئەم دوو وەرزێرە کەوا بەسەرو گوێلاکی یەکتردا دەماڵن بە کـوتەك لە هەمان کات‌دا هەردووکیانیش تائەژنۆ لە قوڕدا چەقیون . بەڵام بێ ئـەوەی هـەست بـەوە بکـەن لەسـەر شـەڕکـردن هـەر بەردەوامن !

ڕەنگە تاوەکو ڕۆژی ئەمڕۆمان تاقە بەرهەمێك هەبێت کە بەجوانترین شێوە شەڕو ئەنجامەکانی تۆمار کردبێت تـابلۆی (گەرنیکا) ی پیکاسۆ بێت . ئەم تابلۆیە لە چوار چێوەی چەند هێڵ‌و دارشتنێکدا جوانترین‌و قارەمانـەترین داستـان نیشان ئەدات . پیکاسۆ ڕەنگی شینی وەك ڕەنگێکی خەملوی بۆ ئەم بـەرهەمـەی هەڵبـژارد لەکاتی پیشـان دانی ئەم تـابلۆیـەدا ئافسەرێکی نازی لێ‌ی پرسی کەوا ئەو کردویەتی واتە پیکاسۆ ، لە وەڵامدا ووتی : نەخێر ئێوە کردوتانە .. ! ئەم تابلۆیە وەکو کاردانەوەیەك بۆ بۆردومانەکەی شاری گەرنیکا هاتە کایەوە . هەربەشێك لە بەشـەکانی نێـو تابلۆکـە باسێـك‌و خواستێـك دەگێڕێتەوە ، تیشکێـك خراوەتـە سەر دیمـەنەکـەو پەردەی



لەسەر هەڵدەماڵێت ، کە لە شێوەی چاودایە ـ هەروەکو دەڵێن دەبێت چاوی وێنەکێشەکە خۆی بێت . گەر بینەر زۆر لێی وورد بێتەوە ئەوا بۆی دەردەکەوێت کەوا ئەژانەی بەرامبەر کۆنەپەرستی دەجەنگن هەمیشە سەرکەوتنیان بۆ دەنوسرێت . وەکو لە خوارەوەی تابلۆکەدا دیارە شۆڕشگێرە کوژراوەکان ئەوەندە سوورن لەسەر ڕێگاکەی خۆیان پاش کوژرانیشیان نەتوانراوە کۆڵیان پێ بدرێتو شمشێریان لەدەست بخەن . وەکو گوتوویانە هەموو مرۆڤێکی مەزن ئافرەتێکی لەپشتە ئەوا لێرەش‌دا ئەم شتە دووپات کراوەتەوەو ڕۆڵی ئافرەت بە ڕوونی خراوەتە ڕوو .

پابلۆ پیکاسۆ زۆر وێنەو تابلۆی دەربڕینی کێشاوە هەر لەو بارەیەشەوە دەڵێت : ( هەرکاتێ شتێکی وەهام چنگ بکەوێت کە شایانی دەربڕین بێت دایدەڕێژم بێ ئەوەی بیر لە ڕابردوو داهاتوو بکەمەوە ... هەرگیز هەوڵو تەقەللایشم بۆ نەداوە . هەر شتێکم هەبێت شایستەی ووتن بێت ووتوومە ، بەو ڕێگەیەی هەستم پێی کردوەو پێویست بووە بیڵێم . کاریگەرو هاندەرە جیاوازەکان پێویستە پەیڕەوی ڕێبازی جۆراو جۆربکەن لە دەربڕین‌دا ، ئەمەش هیچ شتێکی تیا نی‌یە جگە لە گونجانی بیرۆکەکەو شێوەی دەربڕینەکەی )[3] .

شایانی باسە تابلۆی (جەنگ) ەکەی شیکویرۆس نموونەیەکی باشە لە هونەری ڕەخنە سازیدا . ئەم تابلۆیە تۆمار کردنی هاواری منداڵێکە ، دەنگ دانەوەکەی وەکو دەبینین تادێت بەرز دەبێتەوە ، هەر بۆیە بە (دەنگ دانەوەی هاوار) یش ناو دەبرێت ، ئەم تابلۆیە لە ساڵی 1937 دا کێشراوە .

لە ڕاستی‌دا نمونە زۆرن بۆ بەرهەمی دەربڕینی ، چونکە دەربڕین خوازی هەر لە پاش سەر هەڵدانی قوتابخانەی کارتێکراوی (الانطباعیة) وەتوانی لە نێوەنە هونەریەکاندا جێی پێی خۆش بکاتو سەقام گیرانە ئالای خۆی بەرز کاتەوە ، هونەرمەندانی ئەم قوتابخانەیە دژایەتیەکی تەواویان لەگەڵ ڕێبازی ( هونەر لە پێناوی هونەردا ) هەیە چونکی ئەمان ناخو گیانو دەروون بەکانی هەڵقولاوی بابەتەکانیان دادەنێن ، جا دەبێت کارێکی ئاسایی بێت کە جێگای ڕقو کینەی کۆنەپەرستان بن . نازیەکان زۆربەی وێنەکێشو نووسەرو پەیکەرتاشەکانی سەر بەم قوتابخانەیان دەربەدەرکردو یاخودکوشتنیان ، بەرهەمەکانیان بە پڕو پووچ ناو دەبرد .

دەربڕین خوازی نوێ لە هونەردا لە ( ڤان گوخ ) ەوە دەست پێ دەکات وە لە بواری نوسینیش‌دا لە (ستراند بێرگ) ەوە وە دەست پێ دەکات . پاش ئەمانیش زۆر هونەرمەندی تر لەو ڕوڵەدا کاریان کردووە لەوانە کۆکۆشکا ، بارلاخ ، جۆرج ڕوو ، ئێدڤار مۆنش ی نەرویجی (1863 — 1944) ، ئەمەی دوایی‌یان زۆر بەگەرمی ڕێبازەکەی خۆی گرتبوو کاری دەکرد ، گەرچی بابەتەکانی هەموو دەربڕینن بەلام لە کارکردن‌دا ڕوخسارو سیمایەکی تایبەتی هەڵدەگرنو خاوەن پسوولەی تایبەتی خۆیانن ، مۆنش بەیەکێک لە باشترینو ڕاستگۆترین قوتابیانی ڤان گوخ دادەنرێت . ئەو وێنانەی بۆی بەجێ هێشتووین چاکترین بەڵگەی قسەکانمانە . لە بەرهەمەکانی مۆش (هاوار) ، (ماڵێك) ، دوو دڵی) ، (چەند دەمو چاوێك لەڕێگەدا) و گەلێکی تریش ...

**پەراوێزەکان :**

1 — الاتجهات الرئیسیة في الفن الحدیث علی ضوء نظریة هربرت رید نووسینی عدنان المبارك لاپەڕە(51) .

2 — مواقف انسانیة رامبو ڤان غوخ بەرگی دووەم لاپەڕە (396) نووسینی صدقي أسماعیل .

3 — نجاح بیکاسو وأخفاقه لاپەڕە (46) منشورات وزارة الثقافة والارشاد القومي ـ نووسیني جون بیرجیز .

● جهاد دڵپاك ●

# نویشكێك ... لەهونەری شانۆی مایزخولد

لەکۆتایی سەدەی نۆزدەو سەرەتای سەدەی بیستەمدا گەلێك ناوی پرشنگدار لەمەیدانی دەرهێنانی شانۆییدا - بەواتا هاوچەرخەکەی - دەرکەوتن وەك کرۆنیك و راینهارت لەئەلمانیا ، ئەنتوان لەفەرەنسا ، گوردن کریج لەئینگلتەرەو لنسکی و ستانسلافسکی و داتشنکو و فاکتانکۆف و مێزخولد لەرووسیا .. هەموو ئەودەرهێنەرە مەزنانە ئەزمونی هونەری و لێکۆڵینەوە بەپیتەکانی خۆیان بۆ هونەری دەرهێنان و نواندن بەتایبەتی و هونەری شانۆ بەگشتی تەرخان کرد ، کەئەمەیان خۆی لەخۆیدا تەقینەوەیەکی فرە گەورە بوو لەهەردوو رووی رۆشنبیری و هونەری شانۆیی لەجیهاندا .

مایزخولد ، یەکێکە لەو هونەرمەندە مەزنانەی چ بەگوفتارو چ بەکردار هونەری شانۆیی دەوڵەمەند کردووەو تاقی کردنەوە بەنرخەکانی کاری کردۆتە سەر شانۆی سۆڤیەت و هەموو جیهان ، هەر ئەم بەهرە گەورەیەشی بوو وای لەفاختانغوف کرد بڵێت .. «هەر دەرهێنانێکی مایزخولد شانۆیەکی نوێیە ، هەر دەرهێنانێکی مایزخولد لەباری دایە رێبازێکی کامل و تەواو بهێنێتە کایەوە ، مایزخولد تۆوی شانۆیی لەخاکی دواڕۆژدا چاندو هەر دوا ڕۆژیش ، دەتوانێت هەقی تەواوی باتێ» .

مایزخولد لە 1874/2/10 لەشاری نینرادا چاوی هەڵهێناوە ، لەساڵی 1895دا خوێندنی ئامادەیی تەواو کردووەو چوەتە کۆلیجی یاسا ناسی لەدانشگای موسکو ، بەڵام هێندەی پێ نەچوو دانیشگای جێ هێشت .. لەساڵی 1896 لەپۆلی دووەمی کۆمەڵی - الدراما الموسیقیة الفیلهارمونیا - لە مۆسکۆدا وەرگیرا ، لە ساڵی 1898دا ئەم قوتابخانەیەی تەواوکرد ، لەهەژدە ساڵیەوە لەنواندنەکانی تازە هەڵچووەکاندا «الهواة» دەوری دەبینی . لەساڵی 1898 چوە ریزی «شانۆی هونەری مۆسکۆ» وەو لە ئاهەنگی کردنەوەیدا دەوری ڤاسیلی شویسکی شانۆگەری یەکەی الکس تۆلستۆی «قەیسەر فیودۆر ایوانو فیتش» بینی . لەماوەی کارکردنا لە - شانۆی هونەری مۆسکۆ - تاساڵی 1902 هەژدە دەوری دیوە ، لەوانە دەوری میر ئاراغۆن لەشانۆگەری بازرگانی ڤینیسیا ، تربیلوف لەشانۆگەری «باڵندەی دەریا» ، ایڤانی سامناك لەشانۆگەری «مەرگی ایڤان» ئەم دەورەیانی لەبری ستانسلافسکی بینیوە .

مایزخولد لەساڵی 1902 واز لە - شانۆی هونەری مۆسکۆ - دێنێ و دەبێتە سەرۆکی «کۆمەڵی درامای نوێ» و دەست بەچالاکی دەرهێنانی سەربەخۆ دەکات ، کە دەست بەدەرهێنان دەکات بەدڵ و بەگیان هەر لەسەر هەمان رێبازو بنەماکانی «شانۆی هونەری مۆسکۆ» بەرهەمەکانی پێشکەش دەکات ئەوجا وورده وورده روو لەجیهان و سەرەتاکانی شانۆی مەرجدار - المسرح الشرطي - دەکات و لەسایەی کار تێکردنی هەردوو رێبازی رەمزی و انطباعي ، کە لە ئەودەبی ئەو سەردەمەدا باویان بووە ، پاشان لە هەنگاوەکانی مایزخولد دوژمنایەتی کردنی دراماو شانۆی سروشتی یە - الدراما و المسرح الطبیعي - هەرئەم هەڵوێستەی دەربارەی شانۆی سروشتی و گەرانی بەدوای رێبازو سیستەم و تەکنیکی نوێ وای لە ستانسلافسکی کرد لەساڵی 1905 دا بۆلای خۆی رای بکێشێ و هاوکاری بکەن لە دامەزراندنی شانۆی «ستودیوی تاقی گەریدا» - الأستدیو التجریبي .

مایزخولد لەساڵی «1908» وە دەستی کردە ووتنەوەی هونەری شانۆیی ، ئەم کارەی تاساڵی 1913 بەرێك و پێکی بەرێوە برد تا «ستودیوی مایزخولد» دامەزرا کەتاساڵی 1918 بەردەوام بوو . بەرنامەی ئەم ستودیویە لەسەر خوێندن و لێکۆڵینەوەی تەکنیکی جوولانی ئەکتەر و کومیدیای ئیطالی و دەنگ و مۆسیقا لە دراما بووە .

مایزخۆڵد بەردەوام شانۆی روسی بەرێبازی تازەو چاك کردنی تەکنیکی ئەکتەرو بەرەوپێش چوونی هونەری دەرهێنان دەوڵەمەند دەکرد ، هەر ئەمە بووە هۆی ئـەوەی کە لەسـاڵی 1923دا ناز ناوی «هونەرمەندی گەل»ی پێ بدرێت لەیـەکیەتی سۆڤیەت . لە ساڵی 1938 – 1939دا بوو بەگەورەی دەرهێنەرانی شانۆی ئۆپرای میری .

لە 1939/6/20 مـایـزخـۆڵد بـەشـێـوەیـەکی نـارەوا چـەوسێزایـەوەو مەخسـەرەی‌پێ‌کـرا ، لە 1940/2/2 داگیـانی سپاردو لە 1955/11/26 دا لەلایەن کۆمیتەی سەربازی دادگـای باڵای سۆڤیەتی‌یەوە پاکانەی بۆکرایەوە .

ئەمە کورتەی ژیانی پڕ لە بەخشش و بەخشینی هونەری مایزخۆڵد بوو کەنەك هەر شانۆی سۆڤیەتی بگرە شانۆی هەموو جیهانیشی دەوڵەمەند کرد .

## شانۆی مەرجدار - المسرح الشرطي

مایزخۆڵد لەکارەکـانی ستودیـۆی ئەزمـوون‌دا دەیەویت پـەردە لەرووی سروشتی شـانۆی مـەرجدار لابـدات و پێ‌ی لەسـەر بنچینـەی - ئـەسلە بـەکـردن‌دا - داگری ، ئـەم تێ‌ڕوانینەش لای مایزخۆڵد بەندە بەبیری مەرجداری و هێماو تەعمیم و لەم بارەیەوە دەڵێ «بۆخستنە رووی سەردەمێك یان دیاردەیەك دەبێ هەموو هۆکانی دەربرین بخەینە کار بۆخستنە رووی چـۆنی پێك هـاتنی ناوەوەی ئـەو سـەردەمـە یـا ئـەو دیاردەیە ، هەروەها خستنە رووی سیما جیاوازەکانی ناوەوەی ئەو سەردەمە یائـەو دیاردەیـە» بەم جـۆرە مایـزخۆڵد تـاقی کردنەوەو داهێنانی خۆی لەشانۆدا دەست‌پێ دەکات ، ئەو بۆ ئەم کارە دەیەوێت شێوازی أنطباعي بەکار بهێنێ ، ئەویش بە بەکارهێنانی ڕەنگ و ئاواز بەچە شتێك کەبەخـۆیان واتـایەکی جیاوازو مانایەکی‌تر ببەخشن ، ئەوکاتی ئەمانە بەکاردەهێنێ واز لەپەردەو ڕووناکی پێش شانۆ دەهێنێ ، کە ئەمەشی کرد ئەو دەمە بینەر بـەشێوەیـەکی نایـارانە سـەیری ڕووداوەکـان و کەرەسەکانی سەر شانۆ دەکات و جیهانی خۆی و جیهانی سەر شانۆ پێکەوە دەبەستێت و توانای ڕەخنەو پرسیار کردنی دەبێ لەمـەڕ ئەو ڕووداوانـەی کە دەیبینێ و ئـەوبیرو بـاوەڕانـەی ئاراستەی ئەم دەکرێ ... بینەر بەلابردنی پەردەو ڕووناکی پێشەوە خۆی بـەنامـۆیی نابینێتـەوەو دەبێت بەبـەشێك لەو جیهانە ، بەپێچەوانەی شانۆی ئاسایی‌یەوە کـە هەمـوو دەم فرمان لەسەر شانۆ ئەنجام ئەدراو ئـەم تەنهـا وەرگری ئـەو فەرمانانە بـووو هیچی تر . بـەمەدا بـۆمان روون دەبێتـەوە کەشانۆی مەرجدار چ گۆڕانێکی لەدونیای بینەران و دونیـای ئەکتەران دا کردووە .

بەپێ‌ی شانۆی مەرجدار ئەکتەر زۆرچاك دەزانێ و دەبێ هەمیشە ئەوەی لەیاد بێت کەچی کەل و پەل و ئێکسسوار لەسەر شانۆ هەیە هەموو هێمان بۆشتەکانی ژیان و ئەمانە بـەفلچەی هونەرمەندێك بەم ئاکامەی ئێستایان گەیشتـون ، هەروەهـا دەبێ ئەوەی لەیادبێ کەروو بە رووی بینەران خۆی دەنوێنێ و ئەم خۆنواندنەش بۆفێربوونی ئەوانە هەرئەم بنچینەیەش بووە بنەما لای بریشت و شانۆی داستانی لەسەربنیات نا شانـۆی مەرجدار بێ پـەروا کۆشش دەکـا دژ بەرێبـازی ایهام «وون بوون و خۆ لەبیر چوونەوەی بینەر لەنـاو ڕووداوەکانی سـەر شانۆدا» ئـەو واز لەدیکۆری ئـاسایی دەهێنێ و لەبـری ئەوە گرنگی بەئێکسسوارو ووردە کەل و پـەلی سەر شـانۆ دەدات بەمەش ئەکتەر جوڵانەوەکانی فراوانتر دەبێت و جوڵانەوەی سێ لایـەنی دەکـات و شێـوەی وێستـەکـانی لەسـەر بنچینـەی پلاستکیانە دەر دەبڕێ و تالەو ڕێگەوە ویستە درامی‌یە جۆراو جۆرەکان پیشان بدات ، بەپێ‌ی ئەم شانۆیە ئەکتەرو هونەری نیگار کێشان لەیەك ڕیزا خۆیان دەبیننەوەو بەرەو پێشـەوەی شانۆ دێن بـەمەبـەستی سوود وەرگـرتن لەقەوارەی لەش ، هەروەها مایزخۆڵد پانتۆمیم بەکار دەهێنێ بۆنزیك کـردنەوەی هونەری شانۆ لەو جۆرەی کە لە سەرەتاوە بێ‌ڕێ شوێن بووە لەسەرەتای پەیدا بوونی دراما . لەگـەڵ بەنـد کردنی ئـەمە بەجۆری نواندن و هونەری نیگارکێشان و مۆسیقاو هەموویـان پێکەوە وەك پارچەیەك لەئۆرکسترا پێشکەش دەکات .

دەرهێنـەر لەشانـۆی مەرجـداردا تـەنهـا ڕێ نمـایی ئەکتەرەکان دەکات و لایەنی بەڕێوەبردنی دەخاتە لاوە ، وەکو چۆن لەشانـۆی سروشتی هـەبووە ، واتـە دەرهێنەر لێرەدا دەبێتە پردێ و گیانی نوسەرو ئەکتەرەکان بەیەك دەگەیەنێ ، ئەکتەریش دوای ئەوەی لەخودی خۆیا لەداهێنـانی دەرهێنەر دڵنیا دەبێ ، ئەوسا ڕوو بەڕووی بینەر دەبێتەوە ئەودەمە دوو هێزی بنچینەیی : داهێنانی ئەکتەرو ئەنـدێشەی بینـەر ڕوو بەرووی یەکتر دەبنەوەو لەنێوانیاندا مەشخەڵی ڕاستی بڵێسە دەستێنێ .

لەم شانۆیەدا دەرهێنەر پابەندی نووسەر نیەو ئەوتێبینیو سیناریۆنەی نووسەر دایدەنێ بۆدەرهێنەر بریتی . لەشتێکی تەکنیکی بۆسەردەمی نووسینەکە خۆی ، نەك بۆئەو سەردەمەی کەدەقە شانۆییەکەی تیادا پێشکەش دەکرێ ، لێرە دەبێ ئەوە رەچاوبکەین کەدەرهێنەر کتومت هەموو ئەو تێبینیو سیناریۆیانە ناخاتە لاوە ، بەڵکو سوود لەهەندێکیان وەردەگرێ وەك ئەوانەی بەندن بەتەکنیکی بنیات نانی شانۆگەرییەکە خۆیو کەناشێ پشت گوێ بخرێن . دەرهێنەر زیاتر سەرنج دەداتە دیوی ناوەوەی دیالۆژەکانو هەوڵ دەدات بن دێرو کاکڵەی سەرەکی ئەو دیالۆژانە بخاتە روو ، بەشێوەیەك لەگەڵ ئەزمی ووشەو شێوەی پلاستیکی لەشدا بگونجێ .

ئاشکرایە شانۆی سروشتی گرنگییەکی تەواو دەداتە مەسەلەی گروپ کردنو پێك هێنانی سەرشانۆ ـ التشكيل الحركي ـ و زوو زوو ئەوگروپانە دەگۆرێ ، بەلام شانۆی مەرجدار گرنگی بەوە زۆر نادات و دەیەوێت مەیدانێکی نەخشە کێشراوی فراوان لەبەردەم ئەکتەردا بەجێ بهێڵێ ، تائەویش بەرێکیو جوانی بتوانێ نمایشی لەسەر بکات ، لێرە گرنگییەکە زیاتر بەهێڵو کۆمەڵە گروپەکان ـ المجموعات ـ ورەنگی جلو بەرگەکان دەدرێت . هەروەها ئەم لەوەستانو خۆ لەجووڵە خستنەوەدا دەیەوێ مەرجدار لەیەك سەرچاو روونـاکی وەردەگرێ بۆئەوەی زیاتر باری بەئەندێشە بکات .

### هونەرێ نواندن لای مایزخۆڵد

**أ ـ لەبواری واژەدا :**

1 ـ پێویستە ئەکتەر بەساردیەوە دان بەووشەکاندا بنێتو خۆی دوور بخاتەوە لەلەرانەوەی دەنگو دڵ پربوون .

2 ـ دەنگ دەبێت هەمیشە جێی خۆی بگرێتو دەنگدانەوەیەکی وابدات بەخۆی کە دوور بکەوێتەوە لەوجۆرە دەنگانەی کەلە بۆشاییدا دەمرن ، دەنگەکان دەبێ سافو بێلەکەبنو کۆتایی ووشەکان نابێ خاو بکرێتەوەو لەنرخی سەرەکی خۆی کەم بکاتەوە .

3 ـ پێش خواردن لەناکاو دەربرینی ئەوپێش خواردنە بەلەرزینی لەشو خۆدوور خستنەوە لەسنگ کوتانو پەل هاویشتن بەم لاو ئەولادا .

کاتێك کەهونەرمەندێ لەناخدا دەکوڵێو ئەوهۆشو کولانە لەچاوو لێوو دەنگو ووشەدا دەردەبرێ ، ئەم دەربرینەی دیاردەی جۆشینێکی گەرمی ناوەوەیە کەدەبێ بێ گژبوونو بەئاسانی بەئەنجام بدرێ .

4 ـ هەرگیز نابێ بەپەلە قسەبکرێ ، بەپەلە قسەکردن زیاتر لەو شانۆگەرییە درامیانەدایە کەسروشتی ـ طابعي ـ نورستییان پێوە دیارە ، بەشی زۆری رستەکانی ئەو شانۆگەریانە بەچە ندخاڵێکی زۆر کۆتایی دێت .

کەوابوو ووچان دان ـ السكينه ـ لەشانۆی داستانا مانای ئەوە نییە کەکارە درامیەکە دوورە لەهەستو نەستی تراژیدییەوە پێوە دیارە .

5 ـ هەستی تراژیدی دەبێ دەست لەملانی زەردەخەنەی سەر لێوبێ .. مایزخۆڵد دەڵێ لەرێگەی سەلیقەوە هەستم بەمە کردووەو کاتێك لێی تێگەیشتم کە ووشەکانی «سافۆناروڵا»[1] م خوێندەوە کەدەڵێ : وامەزانە مریەم کاتێ کەکورەکەی مرد هاواری کردبێو قیژانبێتیو بەقژ رنینەوە رای کردبێتە سەرشەقامو وەکو شێت رەفتاری کردبێ . بەڵکو زۆر بەهێمنیو بزووکییەوە دوای تەرمی کورەکەی کەوت ، بەڵێ راستە فرمێسکی رشتووە . بەلام لە رووکەشا ماتی خۆی پیشان دا ، ئەو خەمو خۆشییەی تێکەلاو ئەکرد لەیەك کاتدا ، ئەو دەمەش لەبەر دەم خاچەکەدا وەستاو سەتپا باڵای سەر نوقمی ناو نهێنیو میهرەبانی خوای گەورە کرد» .

بەلام ئەکتەر لەقوتابخانەی نواندنی کۆندا هاواری دەکردو دەگریاو بەهەردوو دەستی سنگی خۆی دەکوتا تابتوانێ وێنەیەکی بەهێز لای بینەر دروست بکات ، بەلام ئەکتەر لەقوتابخانەکی تازەدا بالە حالەتی دوا لوتکەی تراژیدیاش بێت ، هەر وەکو مریەم خەمەکانی خۆی دەردەبرێ ... لەرووکەشا بێخەمەو هاوارو شینو شەپۆر ناکات ، بەلام بە شێوەیەکی قووڵ هەستەکانی دەردەبرێ .

**ب ـ لەبواری پلاستیکیەتدا :**

هەموو نووسەرێکی دراما دوو جۆرە دیالۆژی هەیە ، یەکێکیان پێویستەو دیارە کە بریتییە لەو ووشانەی کەهاوشانی فرمانە درامییەکان دەوترێنو هەر بۆ شیکردنەوەی ئەو فرمانانەش دانراون .. ئەویتر بەشی ناوەوەیە یانئەو دیالۆژانەی کەنادیارنو بریتین لەبن دێری دیالۆژە دیارەکان ..

ئەم‌جۆرە دیالۆژە نادیارە ئەوەیە بینەر بەبیستن نای بیستێ بەڵکو ... لە ووچان‌و خاڵ بەندەکانی نێوان ئاخاوتنەکەدا هەستی پێ دەکات . بینەر لەقیژە هەستی پێ ناکات ، بەڵکو لەووچان‌و بێ‌دەنگ بووندا ، لەدیالۆژا هەستی پێ‌ناکات ، بەڵکو لەمۆسیقاو جووڵانەوەی پلاستیکی داهەستی پێ‌دەکا .

ریتشارد فاگنەر لای وایە کەدیالۆژی ناوەوە «نادیار» دەبێ بەهاوکاری لەگەڵ ئۆرکسترادا بەئەنجام بگەیەندرێ ، چونکە رستەیەکی مۆسیقاکە گۆرانی بێژەکە دەیلێ ، هێزێکی تێدانی‌یە کەبەتەنیا بتوانێ هەستەکانی ناوەوەی پاڵەوانەکە دەربیرێ بۆیە پەنا دەباتە بەر ئۆرکسترا تابەتەواوی دەربرینەکە بەئەنجام بگەیەنێ‌و تەواوکەری ئەو شتانە بێت کە نەوتراون .

هەروەها مایزخۆڵدیش دەڵێ ، ووشە لە شانۆگەری‌یەکی درامی‌دا ئەو ئامێرە نی‌یە کە بەتەنیا بتوانێ دیالۆژی ناوەوە دەربخات ، لەم بارەیەوە زیاتر روونی دەکاتەوەو دەڵێ : ئەگەر ووشە تاکە هۆیەك بێت بۆ دەبرینی کاکڵەو نەژادی کارێکی تراژیدی ئەگەر وابوایە هەموو کەسێك دەیتوانی لەسەر تەختی شانۆ رۆڵێك یاری بکات ... بەتەنیا ووشە ووتن بابەدەم‌و دوویەکی باشیشەوە بێت ناتوانێ هەموو شت دەربرێ ، کەوابوو لێرەدا پێویستیمان بەرێ‌و شوێنی تازە هەیە بۆ دەربرینی ئەو شتانەی نەمانتوانیوە هەتاکو کۆتایی لەرێگەی ووشەوە دەربیرین بۆ پر کردنەوەی ئەم بۆشایی‌یەش پەنا دەبەینە بەر جووڵانەوەی پلاستیکی چونکە کاتێك ئەکتەرێك جووڵانەوەیەکی پلاستیکی دەکا بینەر ناچار دەکات کەلە دیالۆژە نادیارەکەی ناوەوە بگات .

جووڵانەوە پلاستیکی‌یەکان «دەست جولاندن ، ویستە جۆر بەجۆرەکانی لەش ، سەرنج‌دان ، بێ دەنگی» ئەمانە پێوەندی راستەقینەی نێوان خەڵك پیشان ئەدات ، ووشە ناتوانێ هەموو شتێ بڵێ ، کەوابوو ئێمە پێویستیمان بەوێنە کردنی جووڵانەوەکان هەیە لەسەر شانۆ بەشێوەیەك والەبینەر بکەن کەچاودێر بێت‌و بەسەرنجێکی ووردەوە بروانێتە شانۆ ، ووشە بۆ بیستنە ، پلاستیکا بۆبینینە ، بەم شێوەیە بینەر دەکەوێتە بەر تەووژمی دوو هۆی کاریگەرەوە ، بیستن‌و بینین ... جیاوازی لە نێوان قوتابخانەی کۆن‌و تازە ئا لەمەدا هۆی دەبینێتەوە کەلەقوتابخانەی تازەدا پلاستیکیەت زۆر جار خۆی لەهاوشانی دیالۆژدا نابینێتەوە ، بەلام لەقوتابخانەی کۆندا ، هەمیشە جووڵانەوە هاوشانی دیالۆژ بووە ، لێرەدا پێویستە ئەوە بڵێین کەپلاستیکیەت لەشانۆی مەرجدار هەمیشە دژ بەدیالۆژ نابێت بەڵکو هەندێ جار پلاستیکیەت خۆی لە هاوشانی دیالۆژدا دەبینێتەوە ، ئەمەش بەشتێکی ئاسایی دادەنرێت وەك چۆن لەرینەویەکی دروست لەقورگدا هاوکار لەگەڵ رستەکانی پارچە شیعرێکدا دەروات . پلاستیکیەت لەشانۆی کۆندا هەمیشە هاوشانی ووشە ، بەلام مایزخۆڵد بەچاوێکی ترەوە سەیری ئەوە دەکات‌و پلاستیکیەت زۆر جار هاوشانی ووشە نیە ، بۆسەلماندنیش ئەم نموونەیە دەهێنێتەوە :

دووکەس لەگەڵ یەکتردا لەبابەت ئاووهەواو ، یاهونەر ، یاهەر شتێکی تری رۆژانەوە قسەدەکەن ، کەسێکی تریش لەدوورەوە سەیریان دەکات ، بەبێ ئەوەی دەنگیان ببیستێت ، ئەگەر ئەم کەسی سێ‌یەمە بەسەرنج بێت ئەتوانێ بزانێ ئەو دوو کەسە دوژمنن بەیەك ، یادۆستن یا دوو عاشقن .. چۆن ئەمە ئەزانێ ؟ کاتێ ئەو دووکەسە قسە ئەکەن لەهەمان کاتدا چەند جووڵانەوەیەکی پلاستیکی دەکەن ، دەستیان دەجولێنن‌و ویستی جۆر بەجۆر بەلەشیان دەدەن‌و چاو سەروخواروسەرو ژوور دەکەن ، لەرێگەی ئەو جووڵاندن‌و هەڵس‌و کەوتانەوە پێوەندی نێوان ئەم دوو کەسە دیار دەبێ ، کە دوو دۆستن ، یا دوژمن ، یا دوو عاشقن ئەمەش لەرێگەی ئەو جووڵاندنانەوەیە کە زۆر جار هاوشانی ووشەکان نین‌و بەهۆی چاو دەیبینێ زیاتر لە کارە درامیەکە حاڵی دەبێت ، مایزخۆڵد گرنگی‌یەکی زۆر دەداتە ئەکتەر ، ئەکتەریش بەلایەوە بناغەی هونەری دەرهێنانە ، بۆیە زۆر بایەخ دەداتە لەشی ئەکتەرو بۆ ئەوەی لەشی ئەکتەر بەشێوەیەکی تەخت‌و روون دەرنەکەوێ ، دیکۆری قەوارە دراو لەگەڵ ئەکتەرەکانیا دەهێنێتە پێشەوەی شانۆ تابتوانرێ لەسێ لاوە سەیریان بکرێ‌و قەوارەی لەشی ئەکتەرەکە سوود بەخشتر دەبێت بۆ دەربرینی ئەوەی دەیەوێت . هەر لەبەر ئەمەش بوو مایزخۆڵد رەخنەی لەدیکۆری شێوە ئاسایی‌یەکان دەگرت کە لەو سەر دەمەدا باو بوون ، چونکە بەلای ئەمەوە قەوارەیەکی یەك لایەنی دەدا بەلەشی ئەکتەرو جووڵانەوە پلاستیکی‌یەکانی پەرش‌و بڵاو دەکرد لەبری ئەوەی بیان چەسپێنێ لەسەر شانۆ .

### «مایزخۆڵدچ شتێکی خستە سەر خەرمانەی شانۆ»

بەکورتی دەتوانین بڵێین مایزخۆڵد زۆر شتی خستە سەر خەرمانەی شانۆ وەك ئەمانەی لای خوارەوە :

1 ـ پشت کردنە شێوە ئاساییەکانی شانۆ ، ئەو شێوانەی کەبینەر لەگەڵ رووداوەکانی سەر شانۆدا ئەتوایەوەو وون دەبوون . بۆ ئەم مەبەستەش پشتی بە نەریتەکانی شانۆی میلیو هەندێ نەریتی شانۆی شکسپیر بەست ، بۆیە دەتوانین بلێین مایزخۆڵد زۆر پێشی بریشت کەوتووە لەلابردنی دیواری چوارەمو هەر دوو جیهانی ئەکتەرو بینەری بەیەك گرێ داوە بۆ ئەوەی بینەر هەڵوێستێکی سەلبی نەبێ لەگەڵ رووداوەکانی سەر شانۆو تیایدا بتوێتەوە بەڵکو وای لەبینەر کرد لەو رووداوانە وورد بێتەوەو تێ فکرێو هەرگیز ئەوەی لەیاد نەچێ کە بەرامبەر چەند ئەکتەرێك دانیشتووە .

2 ـ مایزخۆڵد دیکۆری ئاوێتەی بەکارهێناوە ئەرکێکی تری بۆ دیکۆر زیاد کرد هەرگیز بەوە رازی نەئەبوو بەوکاری ئاوێتە کردنەی بووتری دیکۆر ، چونکە دەیوت ئەم ناو بردنە وا لەخەڵك دەکات کە دیکۆر تەنها بە شێوە ئاساییەکەی تێبگەنو هیچ بیرو سەرنجو هێمایەك بەدیکۆرەوە نەبەستێتەوە ، بۆیە دیکۆرەکانی لە جووڵاندا بوونو لەدیکۆری سینەما دەچوون ، نەك وەك شتێکی نەخشە کێشراوو مردوو .

3 ـ ئەکتەری هێنایە پێشەوەی شانۆوەو باوەڕی بەوە هەبوو کەئەکتەر توخمێکی سەرەکییە لەدراما ، هەروەها لەقۆناغێکدا وازی لە ، ئارایشت ـ ماکیاج ـ هێناو دەیووت ئارایشت رووی ئەکتەر دادەپۆشێو دووری دەخاتەوە لەو کەسە ئاسایەکەی ناوژیان .

4 ـ لەمەیدانی پەروەردە کردنی ئەکتەردا شۆڕشێکی بەرپا کرد لەسەر ئەو تیوری «البیومیکانیکا» کەچەند ئامۆژگارێکی زانستیانە بۆ جووڵاندنی لەشی ئەکتەر بەشێوەیەکی تەعبیری تا بتوانێ لای بینەر انطباعێکی عەقلیو عەمەلی دروست بکاتو لەگەڵ هۆشی بینەردا بدوێ ، مایزخۆڵد ئەو جووڵاندنانەی بۆ مەبەستی جوانی رووت بەکار نە دەهێنا وەك ئەوەی کە «تایرۆف» ئەی کرد ، مایزخۆڵد هەرگیز لەگەڵ مەسەلەی جوانی بۆجانی نەبووە لەشانۆ .

5 ـ گرنگییەکی زۆری دا بەرووناکی لەکاتی دەرهێنانیدا . ئەم بەکارهێنانەی مایزخۆڵد پێش سینەما کەوتووە .

6 ـ زۆرگرنگی داوە بەایقاعو مۆسیقا ، شانۆیەکانی وەك سیمفۆنیایەك وابوو ... مۆسیقا لای ئەم شتێك نەبوو باگ راوندی رووداوە درامیەکانی بێت بەتەنیا . بەڵکو دەبووە بەشێك لەکارە درامییەکەی خۆی ... مایزخۆڵدیش یەکەم کەس بووە کەجازی بەکارهێناوە لە شانۆدا .

7 ـ مایزخۆڵد بەر لەبریشتو پەیدا بوونی شانۆی داستان ، ئەکتەر لای کەسێکی خاوەن بیرو رامیاری بووە ، ئەکتەرەکانی لە لایەنی میزیۆلۆجیاوە پێ دەگەیاندو مانای نیشتمان پەروەری بەقوڵی لەدەروونیاندا دەچاندولەباری رامیاریەوە بەباشی دەخەملاندن .

8 ـ مایزخۆڵد سینەمای لەناو شانۆدا بەکار نەهێناوە بەلام لەشانۆگەریەکانیدا دروشمو بانگەوازو گەواهی زانیارانە مانۆسی سیری بەکار ئەهێنا .

لەکۆتاییدا وەك ئەلکسەندەر فیزالسیکی دەڵێت :

«مایزخۆڵد گەنجینەیەکی لەبن نەهاتووی بۆ بەجێ هێشتوونو هەر لەم بارەیەوە دەڵێم ئەو کەلەپوورەی کەمایزخۆڵد بەجێی هێشتووە تیشە بەرەیەکی پێویستە بۆ هونەری هاوچەرخو هونەری دوارۆژ . لێکۆڵینەوەو کەلەپوورەکەی مایزخۆڵدو بەکارهێنانی بەشێوەیەکی داهێنەرانە رەوی بزووتنەوەی شانۆیی بەرەو پێشەوە دەباتو رۆشنبیری شانۆیی دەوڵەمەند دەکات ئەو رۆشنبیرییەی کەلەدڵو هۆشی ئەم هونەرمەندە گەورەیەوە بەجێ ماون شتی زیندوو نەمرن .

بۆ ئەم باسە سوودم لەهەردوو کتێبی مایزخۆڵد

* في الفن المسرحي ... فیسفولود مایزخۆڵد جـ1 ـ 2 ترجمة شریف شاکر وەرگرتووە .

**پەراوێزەکان**

1 ـ جیرولامو سافونارولا «1452 ـ 1498» راهیبێکی دەمینیکانی ئیتالیە .

2 ـ تایرۆف : دەرهێنەرێکی بەناوبانگی سۆفیەتییە .

# کانه و کانزا

● ڕێبوار محمد ●

کانزاکردن کەرەسەی سەرەتایی پێویستە بۆ پیشەسازی کانزا ، بەبێ کانزا هیچ لقێکی ئابوری وولات گەشە ناکات ، کانزای گرنگیش وەکو ئاسن ، مس ، قورقوشم ، توتیاو گەلێکی‌تر ، هەروەها بەرهەم هێنانی هەندێکیان کانزای‌تری دەوێت . وەك ئاسن‌و پۆلا کانزای مەنگەنیز ، کرۆم ، ڤەنادیۆم ، مولیبدنم ، نیکل ، کۆبالت‌و تەنگستنی پێویستە .

هەندێ لەو کانزایانە دەچنە بواری فڕۆکە سازی‌و ڕۆکێت وەك مەگنیسیۆم‌و ئەلەمنیۆم کەرەسەی سەرەتایی بۆکانزا بریتی‌یە لەکانزای خاو وە ئەوزانستەی کەبەندە بەدەرهێنانی کەرەسەی خاوەوە بریتی‌یە لەزانستی (ئەندازەی کانگا) (Mining Enginering) . کەرەسەی خاویش دوو جۆرە کانزایی‌و ناکانزایی ، کەرەسە خاوە ناکانزاییەکە راستەوخۆ بەکاردێت وەکو کەرەسەی خاوی سوتەمەنی .

بەلام‌سنوریان ڕێژەیی‌و گۆڕاوە بۆنموونە بەردی کلس هەندێ جار پێویستی بەهیچ کردارێك ناکات ، وەك ماددەی کیمیاوی بەکاردێت ، لێرەدا بە (کەرەسەی خاوی ناکانزایی) ناودەبرێت . ئەو کانزاو میتالانە لەتوێژی زەوی دەستمان دەکەوێت ، توێژی زەویش ئەستوریی گۆڕاوە ، لەژێر کیشوەرەکان‌دا 30 — 40 کیلۆمەترە ، لەژێر چیاکان‌دا دەکاتە کم ، لەژێر دەریالوش‌و دەریاکان 6 — 15 کم .

هەندێ لەوکانزایانە بەشێوەی توخمی سروشتی کۆبونەتەوە Native Element وەك (ئالتون ، پلاتین ، مس ، کبریت)

وە هەندێکی‌تریان بەشێوەی کانزا Mineral وەك (کوارتز ، کالسیت ، ماگنیتایت ..) . وەهەندێ لەوکانزایانەش کۆبونەتەوە لەسنورێکی تایبەتیدا بۆپێك‌هێنانی بەرد ، بەشێوەی یەك‌کانزا (ماربل Marbel) ، بەردی گرانایت Granite لەکانزای کوارتز ، فلسبار ، مایکا ، ... پێك‌هاتووە .

کەرەسەی خاو (بەردوکانزا)ی توێژی زەوی شێوەی گازات ، شلە (نەوت) و ڕەق (ئاسن ، خەلوز ...) کۆبۆتەوە . لەکاتی پشکنین‌بە شوێن کانزادا ، هەولی دۆزینەوەی شوێنی کۆبونەوەکە دەدرێت‌بە تایبەتی چڕترین خال کەگونجاوترین شوێنی کانگایە Mine ، دەتوانریت بەشێوەیەکی ئابوری بەڕێگای کانزاکردن سودی لێ‌وەربگیرێت .

بڕیاری کردنەوەی کانگاکە لەسەر چەند فاکتورێك وەستاوە ، سەرەتا جۆری کانزا میتالەکە ، قەبارەو شێوەی کۆبونەوەی ، سروشتی چینەبەردەکانی دراوسێی کانزامیتالەکە ، ڕێگای کانگاکردنەکە ئایا کراوەیە یان تونێلە ، دیسانەوە گەلێك مەسەلە هەیە پێویستە لەکاتی کانزاکردنەوە رەچاو بکرێت لەسەرو هەموویانەوە ڕێگای پشکنینەکە ، خەملاندنی قەبارەی کانزاکە لەبارەی ئابوری‌یەوە ، ئنجا



بڕۆگرامی سیستمی کانزاکردنەکە ، دوایش جێبەجێ کردنی پێویستیەکانی کانزاکردن (تعدین) . کانزاکان پۆلێن کراون بۆپۆلی ماگمایی (Magmatic) ، نیشتوویی Sedimentary ، کانزای گۆڕاو Metamarphic . هەرچەندە پێکهاتووی کانزا ئاڵۆزە بەلام لێکۆڵینەوەی پێکهاتنی گرنگە لەبەرهۆی دیاریکردنی گونجاوترین ڕێگای دەرهێنانی بەشێوازێکی ئابوریانە . لەگەڵ کانزاکاندا مادەیتر کۆبونەتەوە بێ ی دەوترێت کانزای بێسوود (Gangue Minerals) وەك (کوارتز ، کالسایت ، بارایت ، فلورایت) ئەمانەش لەگەڵ کانزای مەبەستدا کۆبونەتەوەو بێکەڵکن ، ئەم فاکتۆرەش کاردەکاتە سەرخەملاندنی بەرهەم هێنانی کانزاکە ، بەلام ووشەی ـ Gangue Minerals ڕێژەیی (نسبي)یەو ئەگۆڕێت لەگەڵ ڕادەی پێشکەوتنی تکنولۆجیای ئەو وولاتەو بارو دۆخی ناوخۆ . بۆنموونە ئاسنی خاو بەڕێژەی 16 — 17٪ بەکەڵکە بەلام لەوەوپێش بەکانزای بێسوود (Gangue Minerals) دادەنراو سودی لێوەرنەگیرا .

شوێنی کۆبونەوەی کانزاکان سیماتی تایبەتیان هەیە ، وەك دەمار Vein کەبریتین لەو شکاندنانەی لەناوبەردی توێژی زەویدا دروست دەبێت و بەکانزا پڕدەبێتەوە ، ئەم دەمارانەش دەگۆڕێت لەگەڵ قولایی و لارییەکەی یان شوێنی کانزاکە کیمیاوییە ، ئەندامیە ، نیشتووی خوییە ، هەریەکەشیان جیاوازن لەشێوەو پێکهاتوویاندا .

گۆڕانی کانزاکان نزیك بەڕووی زەوی ڕوودەدات لەدوای قلیش بوونی بەردەکان ئنجا کاری دوەم ئۆکسیدی کاربۆنی تواوەی ئاو کانزا خوییەکانێ گەرما کاریان تێدەکات ، کەناری دەریاچەکان کە پێچراون لەدەریاکان ڕۆژ لەدوای ڕۆژ بەکاری گەرماچینی بەردی خۆی ی نوێ پێك دێنێت . ئەگەر ئەم چینە خوییانەبە چینێکی ئەستور داپۆشران ، ئەوا پەستانی سەریان زیاد دەکات بەگوێرەی ئەرخەمیدس ، ئەم هێزەش کاردەکاتە سەر چینەکانی سەرەوە ، شێوەی گومەزیی خوێی Salt Dome پێكدێنێت ، ئەم پەستانەش چینەکان لولو پێچاوپێچ دەکەن . ڕێگای دەرهێنانی کانزا گەلێك جۆرە ، جۆری ئامێرەکەش دەگۆڕێت بەپێ ی تایبەتیەکانی شوێنی کانزاکە .

کانزا خاوەکە داپۆشراوە بەچینکی ئەستور لەبەردی نەرمی تەلەزمی یان بەردی ڕەق ، یان کانزا کەقولایی



سەدان ، هەزار مەترەدایە یان دەرکەوتووەو تێکەڵ بەلمو چەوە ، یان پاکژوچرە لەدەماری وردەوردی لێدارداکۆبۆتەوە ، هەندێ جار کانزاکە تێکەڵە لەگەڵ مادەی تردا لەناوچەیەکی گەورەدا ، پێویستە میتاڵەکە بگوێزرێتەوە بۆسەرزەوی ئنجاپرۆسیسی جیابونەوەی بۆدەکرێت . پرۆسیسی کانزاکردن ئاڵۆزە سەرەتا دەست پێدەکات بەدەرهێنانی کانزاکە ئنجا بۆبەرهەم هێنانی بەپاکی لە کارگە . وەهەرقۆناغێکیش نرخی تێکچوونی خۆی هەیەو ئەبێت کۆی گشتی ڕەچاوبکرێت تاکو پارەی تێکچوونی هەموو قۆناغەکانی بگونجێت لەگەڵ نرخی بازاڕیان .

کانزای خاو بەم جۆرە قۆناغانەدا دەڕوات پێش گەیشتن بە قۆناغی کۆتایی :ـ

1 ـ دەرهێنانی میتاڵەکە لەکانگاکە .
2 ـ گواستنەوەی بۆکارگە .
3 ـ پرۆسیسی تێکەڵکردنی لەگەڵ هەندێ توخمدا وەك (مەنگەنیزو خەڵوز بۆ ئاسن) .
4 ـ گواستنەوەی بۆدەرهێنانی کانزای داواکراولەکارگە .
5 ـ پرۆسیسی جیاکردنەوەی کانزای داواکراو .
6 ـ پاکژکردنەوەی کانزاکە .

بەم شێوەیە نرخی کانگا نەوەستاوە لەسەر مادەی کانگا بەڵکو لەسەر قەبارەی ، هۆی گواستنەوە ، نزیکی کانگاکە لەشوێنی کانزاخاوەکانیتر . (کەرەسە خاوی نزیك ڕووی زەوی) ڕووبەرێکی فراوان و درێژبوونەوەیەکی قوڵی گەورەی هەبێت ، ڕێگای دەرهێنانی ئاسان دەبێت ، بەم جۆرە کانگایانەش دەوترێت کانگای کراوەیان کانگای دەرکەوتوو (مكشوف) کەلەقولایی یەکی کەمدایە ، جیاوازەلە کانگای ناخی زەوی (مناجم جوفية) کەئامێری ئاڵۆزو زۆری پێویستە ئەو کاتەش تونیل Tunnel لێدەدرێت .

لەکاتی کانگای کراوەدا ئەگەر بەردەکان تەڵەزمی پارچە پارچەبن ئەوا تێ چوونی بەرهەم هێنانی کانزاکە زیاد دەکات ، بوونی هەمان بەردلەکاتی کانگای تونیلدا بەرهەم هێنانەکە نائابوری دەبێت ، چونکە تونێلەکە پێویستی بەراگیرکردن و بەهێزکردن ئەبێت بەچیمەنتۆو تەختە . باشترین بارودۆخ بۆ کانگای تونیلی ئەوەیە کەبەردەکان یەکگرتوو (متماسك) بن وپارچە پارچە نەبن تاکوکاری ناو کانگاکە بێ مەترسی و کەمتر راگیری بوێت بەلام کانگای کراوەی ئامێری تایبەتی خۆی دەوێت بۆچاڵ کردن و گەیاندنی کەرەسەی خاوەکە بۆرووی زەوی . کۆمەڵێ ئامێری وەك چاڵکەر ، پالپشت و ئامێری تایبەتی چاڵکردنی تونیلی ئاسۆیی ، ئامێری گواستنەوەی کەرەسەی خاوی ناو تونێلەکە بۆدەروازەی سەرەکی دوایش بۆسەر رووی زەوی ، ئنجا بۆکارگەی جیاکردنەوەو پاکردنەوە ، باشترین وایە ئەم جۆرە کارگانەنزیك کانگای کانزاکەبن .

کاری ناو تونیلە کانگاکە مەترسی هەیە لەبەر رمانی تونێلەکە ، بەتایبەتی بەهۆی دەرهێنانی کەرەسەی خاوو درێژ بوونەوەی تونێلەکە ، کاری ئاو هەندێك جار تونیلەکە ئاو دای دەپۆشێت ناچار پەمپ بەکاردێنن .

مەترسی هەوای پیسی ناو کانگاکە لەئەنجامی زیاد بوونەی رێژەی نایترۆجین و دوەم ئۆکسیدی کاربۆن و شێ لەگەڵ گازاتی ژەهراوی کەبەهۆی تەقاندنەوەی داینەمیتەوە دروست دەبن وەك یەکەم ئۆکسیدی کاربۆن و نایترۆجین و کبریتیدی هایدرۆجین و تۆزو خۆڵیش ، چالەبەر ئەم هۆیە بەردەوام دەبێت هەواگۆرکێ بکرێت Ventilatian ، ئەبێت گەلێك فاکتوریش بۆئەم مەبەستە تێبینی بکرێت وەك بڕی چونە ژوورەوەی هەواو دەرچوونی ، ژمارەی کرێکارانی ناو کانگاکە ، پلەی رادەی شێ ، بەرهەمی رۆژانەی کانگاکە ، لەگەڵ وەرزی ئیش کردنەکەش .

زۆرجار کانگای کراوەی ئاسن نزیك کارگەی بەرهەم هێنان دەبێت وەکاتێکیش ئاسن پاك نەبێت کارگەکە بینادەکرێت نزیك خەڵوزو سەرچاوەی پێویست بۆپاکردنەوە ، یان نزیك کارگەی ئوتومبیل دروست کردن ، یان لەناو جەرگەی شاردا دەبێت یان لەنزیك بەندەرەکاندا دروست دەکرێت بۆئەوەی کەشتیەکان کەرەسەی کانزای خەڵوزو بەردی کلس بگەیەنن ، بەم شێوەیە کانزاکە دەگاتە قۆناغی پیشەسازی .

# کولێنەر

ئەندازیار - حەمە قادر

قەشەکان بە ماوەیەکی زۆر بەر لەدایك بوونی عیسا هەڵیان بەکار هێناوە بۆ ترساندن و وریاکردنەوە . جادووگەرەکان بۆجادووگەرێتیو تەڵەکەبازی . وەپێش بیست و چوار سەدە لەمەوبەر و لەسەردەمی سوقراتی فەیلەسوفدا زاناکان وایان دادەنا کە جەمسەرو نەژادی جیهان هەڵمی ئاوە . بەلام یەکەم کەسێك کە توانی هێزی هەڵم وەك بزوێنەرێك بەکار بهێنێت هیرو « Hero » بوە . هیرو لە زانکۆی ئەسکەندەریە دەرچوە . لە ساڵی « 130 پ . ز » بیری لەوە کردەوە یارییەك بۆ کات بردنە سەر بۆ یەکێك لە پادشاکانی هاوچەرخی دروست بکات . تۆپێکی خاڵی هانی ، دیوی دەرەوەی بە نەخشو نیگارێکی جوان رازاندەوە ، دوو بۆری بەم سەرو ئەوسەریەوە بەست ، بەشێوەیەك سەری بۆرییەکان بە پێچەوانەی یەکەوە چەمابونەوە . ئەم تۆپەی لەسەر دوو ستون راگرتبو ، وە ستونەکانیش لەسەر کولێنەرێك « Boiler » قایم کرابون . هەڵم لە کولێنەرەکەوە دەچوە ناو تۆپەکەوە ، لەناو تۆپەکەشدا بە هەردوو بۆرییەکاندا دەرۆیشتە دەرەوە . هاتنە دەرەوەی هەڵم بە پێچەوانەی یەکەوە دەبو بە هۆیەك بۆ بزواندن و خولانەوەی

تۆپەکە . ـ بڕوانە وێنەی — ١ — .

لە چەرخی هێرووە تاوەکو سەدەی حەڤدە هەمی دوای زایین تەنیا کەسێکی تر بیری لە بەکار هێنانی هێزی هەڵم نەکردۆتەوە ، تا ساڵی 1606 جیوڤانی باتیستا دیلا بورتا « Giovan- ni Battista Della Porta » توانی هەڵم بەکار بهێنێت بۆ پاڵنان بە ئاوەوە . هەڵمی لە قاپێکدا ئامادەکرد ، ئەم قاپە بە بۆرییەك بەسترابو بە دەفرێکی داخراوی پڕ لە ئاوەوە . هەڵمەکە لە بۆرییەکەوە دەڕۆیشت و پاڵی دەنا بە ئاوەکەوە . ئەم ئاوەش بە زەبری هەڵمەکە لە کونی دەفرەکەوە دەچوە دەرەوەو فوارەیەکی دروست دەکرد . هەروەها لە ساڵی 1615 سالمون دی‌کوز « Salo- mon De caus » فوارەیەکی بەهەڵم دروست کرد وەکو فوارەکەی بورتا ، بەڵام ئەم تەنیا لە قاپێکدا ئاوو هەڵمەکەی کۆکردەوە ، ئەو ئاوەی دەهاتە دەرێ ئاوێکی گەرم بوو . وە لە ساڵی 1663 ئەدوارد سومەرست « Edward Somerset » یەکەم ئامرازێکی بەکەڵکی دروست کرد بۆ بەرزکردنەوەی ئاو بەهۆی هێزی هەڵمەوە . هەندێ زاناو داهێنەری تری وەك تۆماس سیڤری « Thomas Savery » ساڵی 1698 و دینیس پاپن « Denis Papin » وە تۆماس نیوکمن « Thomas Newcomen » ساڵی 1705 خۆیان خەریك کردووەو ئامرازیان دروست کردووە بۆ هەمان مەبەستی ئەدوارد سومەرست بۆ بەرزکردنەوەو هەڵکێشانی ئاو لە کانگاکاندا .

....لە ساڵی 1769 بۆ یەکەم جار جێمس وات « James watt » توانی ئامرازێکی سوود بەخش دروست بکات بۆ بەرزکردنەوەی ئاو بەهۆی هێزی هەڵمەوە کە ترومپایەکی گەورەی دەسووڕاند . هەروەها وات لەگەڵ ماسیو بولتن « Matthew Boulton » توانیان هەڵم بە پەستانەیەکی بەرزتر بەکار بهێنن بۆ سوڕاندنی ئامرازەکان . وە لە ئینگلستان تریفنك « Trevithick » یەکەم کەسێك بوو کە توانی هێزی هەڵم بەکار بهێنێت بۆ پاڵنان بە گالیسکە هەڵمیەکانەوە . وە لە ساڵی 1829 جۆرج ستیفنسن « George Stephenson » توانی لوکوموتیفێك دروست بکات کە لە شێوەی شەمەندەفەری ئیمرۆدا بوو . هەروەها لە هەمان ساڵدا لە فەرەنسا کە جەنوت « Cugnot » ئامرازێکی هەڵمی دروست کرد بۆ پاڵنان بە گالیسکەوە . وە لە ساڵی 1897 ئەندازیاری کارەبایی فەرەنسی کلیمان ئادیر توانی بزوێنەرێکی هەڵمی دروست بکات



وێنەی — ١ —

وەبەکاری بهێنێت لە فڕۆکەیەکدا بۆ فڕین ، وەتوانی بە درێژی 300 مەتر بێ ی بفڕێت . وە ئەم فڕۆکەیە دەژمێررێت بە بناغەیەکی بنچینەیی هونەری فڕین لە جیهاندا . وە هەتا ئیستاش لە مۆزەخانەی ئامۆژگای نیشتمانی هونەرو پیشەسازییەکان لە شەقامی « سانت مارتان » لە پاریس پارێزراوە . بریتیە لە دوو بزوێنەری هەڵم هەریەکەیان بە توانای 20 ئەسپ . بە کورتی لەو کاتەوەی زانرا هەڵمی ئاو توانای راپەراندنی کاری مەزنی هەیە لێکۆڵینەوەو خۆ ماندوکردنو هەوڵو تەقەللای زاناو داهێنەرەکان زیاتر بوو وە سنورێکی فراوانتری گرت ، هەتاوەکو بەرهەمی رەنجو شیلەی مێشکیان گەیشتۆتە ڕۆژانی ئیستا . کە لە هەندێ کارگەدا هەڵم بە شادەماری بەرهەم دەژمێررێت و ئیشی سەرەکی دەکات . بۆ نمونە لە کارگەی شەکردا کوڵێنەر دەوری دڵ دەبینێت و ئەو هەڵمەی دروستی دەکات وەکو خوێن بە سەراپا لەشی کارگەدا بڵاودەبێتەوە . هەروەها لەکارگە کیمیاییەکانی تری وەك کارگەی دروست کردنی کاغەزو پلاستیك و نایلون و دەرمان و کۆکردو پالاوتنی نەوت هەڵم ڕۆڵێکی باڵای هەیە ، ئەمە جگە

لەوەی لە ئیستگەی دروست کردنی هێزی کارەبادا هەموو وەستاندنێکی کوڵێنەرو نەمانی هەڵم کارێکی کاریگەری گەورەیە بۆ کوژاننەوەی کارەباو وەستاندنی هەموو ئەو ئامرازانەی بەهێزی کارەبا دەسوڕێن .
وە سەرەڕای ئەم ڕۆڵە سەرەکیانە . هەڵم هەڵ دەستێت بە هەڵسوڕاندنی هەزاران ئیشوکار لە هەموو لقەکانی تری پیشە سازیدا . بەڵام بۆچی هەڵم بەتایبەتی هەڵبژێرراوە بەم کارانە هەستێت ؟. بۆچی لە هەموو جیهاندا بەکارهێنانی زۆر بڵاوە ؟. ئەمانەش دەگەڕێتەوە بۆ پێویستیەکی زۆر بە وزە . وزەیەك توانای بەرهەم هێنانی ئیش و گەرمایی هەبێت . لە ئەنجامدا زانرا هەڵم ئەو هۆیە ئابورییەیە کە دەتوانێت بڕێکی فرە زۆر لە وزە بگوێزێتەوە لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر . سەرەڕای ئەوەی بەرهەم هێنانی . هەڵم کارێکی ئاڵوز نیە چونکە لەئاو دروست دەکرێت . وە ئاویش لە هەموو شوێنێك دەست دەکەوێت . جگە لەوەی دەست بەسەرا گرتنی هەڵم کارێکی ئاسانە . وە زۆر شوێن هەیە لەم جیهانە پانو بەرینەدا ئەم هۆیە بەکار دەهێنێت و بە کەلوپەلێك دەژمێررێت کە بەکارهێنانی زۆر بڵاوە .

هونەری وزەو توانای هەڵم دەگەڕێتەوە بۆ کوڵێنەر ئەو ئامرازەی کە هەڵمی تیا دروست دەکرێت . بێگومان بە درێژایی مێژووی هەڵم کوڵێنەریش تاقیکردنەوەو لێکوڵینەوەی جۆر بەجۆری لەسەرکراوە .
یەکەم ئامرازێك کە سەرچاوەی هەڵم دروست کردن بووە دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی 18 لە شێوەی قازانێکی خاڵی « shell » دا بووە . پڕ دەکرا لەئاوو لەژێریا یەکسەر ئاگر دەدرا . بەڵام لەکاتی گەرم کردنیا مەترسی زۆری تەقاندنی لێ دەکرا ، لە ئەنجامی زۆر بوونی قەوارەی ئەو ئاوەی تیایا بووە . وە لەکاتی تەقینا کارەساتی گەورە گەورەی تۆمار دەکرد . بۆ نمونە لەپێش ساڵەکانی « 1911 ز » کوڵێنەرێك لە یەکێك لە شارەکانی ئەمەریکادا تەقیوە 58 کەسی کوشتوەو 117 کەسیشی برینـدار کردووە .
لە ساڵی 1766 ولیەم بلەکی « Willam Blakey » یەکەم کوڵێنەری بۆڕی ئاو « water tube boiler » ی دروست کرد . وە لە ساڵی 1788 داهێنەر جێمس ڕەمسی « James Rumsey » توانی چەند چەشنێك



وێنەی — 2 —

کوڵێنەر دابهێنێت کە هەندێکیان کوڵێنەری بۆڕی ئاو بووە . وە لە ساڵی 1803 داهێنەری ئەمەریکایی جۆن ستیفن « John Steven » توانی کوڵێنەرێکی بۆڕی ئاو دروست بکات ، کە بریتی بوو لە چەند بۆڕییەکی بچکۆلە لەسەر یەکیەوە داخرابوون ، وە سەرەکانی تری بەسترابوون بە ئاوگرێکەوە « خزان » . لە ساڵی 1804 تریفنك « Trevithick » یەکەم کوڵێنەری بۆڕی ئاگر « Fire tube boiler » ی دروست کرد . بریتیبوو لە لوولەکیەك لە ناویا بۆڕییەك قایم کرابوو . ناو بۆڕییەکە ئاگر دەدراو دەورو پشتی بۆڕییەکەش ئاو بوو . لە ساڵی 1870 تەنیا بۆڕییەکەی ناو لوولەکیەکە گۆڕابۆ چەند بۆڕییەك ، کە ئەم کارە ڕووبەری گەرمایی زیاتر کردوو لەگەڵیا بەرهەمی هەڵمو پەستانەی بەرزکردەوە . لە ساڵی 1856 دا ستیفان ویلکوکس « Stephen wilcox » گۆڕانێکی گەورەی بەسەر کوڵێنەری بۆڕی ئاودا هانی ، بەوەی کە سوڕان و ڕۆیشتنی ئاوی لەناو کوڵێنەردا ئاسان کردوو ڕووبەری گەرمایی زیاتر کردوو مەترسی تەقینی کەمتر کردەوە . وە دەتوانین بڵێین لە ساڵی یەکەمی داهێنانی کوڵێنەرەوە هەتا ئێستا زۆر داهێنەرانی تریش خۆیان خەریك

کردووە هەتا وەکوو کوڵێنەریان گەیاندۆتە ڕۆژانی ئێمڕۆ ، کە بە شێوەیەکی ڕێکوپێک هەڵم دەهێنێتە بەرهەم وە مەترسی تەقین بە تەواوەتی بنبڕ کراوە .
جا بەر لەوەی ڕووناکی تەواو بخەینە سەر کوڵێنەرو جۆرەکانی بە پێویستی دەزانم کورتە باسێکی سوڕانی ئاو لەکاتی گەرم کردنیاو شێوەکانی هەڵم بکەین بەسەرە تایەکی زۆر کورتی باسەکەمان .

لە کاتێکدا گەرمایی دەدەین بە بڕێک ئاو یەکەم جار چینی خوارەوەی نزیک بە ئاگرەکە گەرم دەبێت ، وردە وردە قەوارەکەی دەکشێو گەورەتر دەبێتو بەرز دەبێتەوە جێگای ئەم چینە گەرمە چینێکی سارد لە سەرەوە دێتە خوارێ ، ئەمیش وەک چینی پێشو گەرم دەبێتو بە هەمان شێوە بەرەو ژوور دەڕوات . لە ئەنجامی ئەم جێگا گۆرکێ‌یەدا سوڕانی ئاو پەیدا دەبێت چونکە ئاوی نزیک بە ئاگرەکە چڕیەکەی کەمتر دەبێت لە چڕی ئاوە ساردەکەی سەرووی بەمانای قورساییەکەی سووکتر دەبێت . ئەم جیاوازی نێوان قورساییانە دەبێتە هۆیەک کە چینە قورسەکەی سەرەوە دابکشێتو پاڵ بە چینە سوکەکەی خوارەوەی بنێتو بەرزی بکاتەوە . هەروەها لە کاتی بەرزبونەوەی پلەی گەرماییدا ئەو هەوایەی لەناو ئاوەکەدایە دەکشێو بەرز دەبێتەوە . لە نزیکترین شوێن بە ئاگرەکە بە تایبەتی بەشی خوارەوەی کە پلەی گەرمی زۆر زۆرە بلق پەیدا دەبێت . ئەم بلقانە لەسەرەتاوە بچوکنو بە دیوی ناوەوەی کانزادەکەوە نووساوە ، وردە وردە قەوارەکەی گەورەتر دەبێت بە جۆرێکی ئەوتۆکە کانزادەکە بەر دەدات ، وە لەبەر ئەوەی چڕیەکەی لە چڕی ئاوەکە سووکترە ئەمیش بەرز دەبێتەوە . وە هەتاوەکوو بەرزتر بێتەوە قەوارەکەی فراوانتر دەبێت وە ئەم فراوانیەش دەگەڕێتەوە بۆ کەم بوونەوەی پەستانەی ستوونی ئاوەکە لەسەر بلقەکە . لەکاتی ڕۆیشتنیا لەگەڵ بلقیکەدا یەک دەگرێتو بەسەر بەرگری ڕووی ئاوەکەدا زاڵ دەبێتو خۆی هەڵدەداتە دەرەوەو دەتەقێ . ئەم تەقانە لەرانەوەو دەنگی گیزە گیزێک پەیدا دەکات . ئەو هەڵەی دەبێتە هۆی دروست کردنی بلق پلەی ماتەگەرمایی بەرز دەبێتەوە ، وە ئەمەش دەبێتە هۆیەک کە هەموو ئاوەکە بگاتە پلەی گەرمایی کوڵاندنو بوون بە هەڵم . ئەمە ئەگەر بێتو لە قاپێکی کراوەدا بێت . خۆ ئەگەر هاتوو لە قاپێکی داخراو یان لە کوڵێنەرێکدا گەرم بکەین تەماشا دەکەین لەگەڵ بەرزبونەوەی پلەی گەرمایی پەستانەش بەرز دەبێتەوە هەتاوەکو لەنگەر لەنێوان پلەی گەرماییو پەستانەدا پەیدا دەبێت ، لەم کاتەدا ئەم پلەی گەرماییە پێی دەوترێت پلەی گەرمایی کوڵاندن « Boiling point » یان دەتوانین بڵێین کوڵاندن لە پلەیەکی دیاری کراوی گەرمایی و پەستانەدا ڕوو دەدات . ئەم پلەیە ناو دەبرێت بە پلەی گەرمی کوڵاندن یان بە پنتی کوڵاندن « دەگۆڕرێت بەپێی گۆڕانی شلەکان » . وە بە نە گۆڕراویی دەمێنێتەوە هەتاوەکو هەموو ئاوەکە دەبێتە هالاو « Vapour » .
هەڵم لەدوو شێوەی سەرەکیدا خۆی دەنوێنێت ، یان هەڵمی تێر « saturated » یان هەڵمی داخ « superheated »[2] . ئەو هەڵەی کە دروست دەبێتو ئاویشی لەگەڵدایە ، یان ئەو هەڵەی لەگەڵ بوونی ئاویشدا دروست دەبێتو لە حاڵەتی لەنگەر دایە پێی دەوترێت هەڵمی تێر . لەم کاتەدا ژمارەی ئەو گەردیلانەی ئاوەکە بەجێ دەهێڵن یەکسانە بەو گەردیلانەی دەگەڕێنەوە ئاوەکە . پەستانەی هەڵمی تێر پابەندی پلەی گەرماییە ، وە هەروەها بە پێچەوانەشەوە پلەی گەرمایی وەستاوە لەسەر پەستانەکەی . پلەیەکی گەرمی دیاری کراو جووت دەبێت لەگەڵ هەریەک لە پەستانەی هەڵەکە . ئەگەر هاتو قەوارەی هەڵە تێرەکە کەم کرایەوە لە پلەیەکی گەرمی نەگۆڕراودا ، هەندێک لە هەڵەکە دەبێتەوە بە ئاو بەمەرجێک پەستانەش بە نەگۆڕاوی بمێنێتەوە . وە ئەگەر هاتو قەوارەکەی زیاتر کرا هەندێک لە شلەکە دەگۆڕێت بە هەڵم بە مەرجێک پەستانە هەر بە نەگۆڕاوی بمێنێتەوە . پلەی گەرمی هەڵە تێرەکە لەگەڵ ئەو ئاوەی لەگەڵیایەتی ناو دەبرێت بە پنتی تێر « saturation point » .
هەڵمی تێریان وشک دەبێت یان تەڕ . ئەو هەڵەی کە بە هیچ جۆرێک گەردی ئاوی لەگەڵدا نیە پێی دەوترێت هەڵمی تێری وشک « Dry saturated steam » . وە ئەگەر هاتوو گەرمایی زیاتر درا بەم هەڵە وشکە بەبێ ئەوەی پەستانەکەی بگۆڕین هەڵەکە دەبێت بە هەڵمی داخ « superheated » وە پلەی گەرماییەکەی زیاتر دەبێت لە پەستانەکەی کە کاتێ هەڵمی تێربوو . قەوارەی تایبەتی « specific volume » هەڵە داخەکە زۆرە ، هەروەها دووری نێوان گەردەکانیشی زۆرە ، بەلام هێزی ڕاکێشان لە نێوان گەردەکانیدا کەمتر دەبێتەوە .

وێنە —3—

بەکورتی دەتوانین کرداری گۆڕانی ئاو بۆ هەڵم بکەین بە سێ قۆناغەوە : —



1 — گەرمکردنی ئاو بۆ زیاتر لە پلەی گەرمایی کوڵاندن .

2 — کردن بە هەڵمی ئەو ئاوەی دەکوڵێت و دروست بوونی هەڵمی تێری وشك .

3 — گۆڕینی هەڵمی تێری وشك بۆ هەڵمی داخ . وەدەتوانین بەم جۆرە پێناسەی هەڵمی داخ بکەین : — هەڵمی داخ ئەو هەڵەیە گەرم دەکرێت بۆ پلەی گەرماییەك زیاتر لە پەستانەکەی .

بەپێی ئەو سروشتانەی هەڵم هەیەتی دەتوانین هەڵمی ئاو بکەین بەم شێوانەی خوارەوە : —

1 — هەڵمی تەر — wet steam — ئەو هەڵەیە کە هێشتا گەردی ئاوی تیایە وە شێی تەری پێوە ماوە .

2 — هەڵمی تێر — ئەو هەڵەیە پلەی گەرماییەکەی دەگۆڕێت بەپێی گۆڕانی پەستانەکەی .

3 — هەڵمی داخ — هەر وەکو لەسەرەوە وتمان ئەو هەڵەیە کە پلەی گەرمایی زیاترە لە پەستانەکەی .

4 — هەڵمی وشك — ئەو هەڵەیە کە بەهیچ جۆرێك شێی تەری پێوە نەماوە . وە ئەمەش یان بەشێوەی هەڵمی تێر دەبێت یان داخ .

5 — هەڵمی زۆر داخ « Extra superheated » ئەمە هەموو سیفەتەکانی وەکو گاز وایە .

هەروەها بەپێی ئەو پەستانەیەی هەڵم هەیەتی دەتوانین بڵێین هەڵم دەکرێت بەم شێوانەی خوارەوە : —

1 — پەستانەی هەوا « جو » — ئەو هەڵەیە کە پەستانەکەی چەند پلەیەك زیاتر یان کەمترە لە پەستانەی هەوا .

2 — پەستانەی کەم — ئەو هەڵەیە کە پەستانەکەی لە نێوان « 5 تا 10 پاوەند / إنج² » ە .

3 — پەستانەی ناوەندی — ئەو هەڵەیە کە پەستانەکەی لە نێوان « 10 تا 150 — پا / إنج² » ە .

4 — پەستانەی زۆر — ئەو هەڵەیە کە پەستانەکەی لە نێوان « 150 تا 300 پا / إنج² » ە .

5 — پەستانەی زۆر زۆر — ئەو هەڵەیە کە پەستانەکەی لە نێوان « 300 تا 2000 — پا / إنج² » ە .

پاش ئەم کورتە باسەی هەڵم ئینجا دێینە سەر باسی کوڵێنەر ، ئەو ئامرازەی هەڵم دروست دەکات . وە دەتوانین بەم جۆرە پێناسەی بکەین : — کوڵێنەر ئامرازێکی داخراوەو دروست کراوە بۆ ئەوەی گەرمایی بگەیەنێت بەو ئاوەی تیایەتی تاوەکوو بیگۆڕێت بەهەڵم .

.... چەند شێوەیەکی جیاواز لە کوڵێنەر هەیە بەهۆی چەند ڕێگایەکەوە لەیەك جیا دەکرێنە وەو دروست و دابەش دەکرێن .

ئەم ڕێگایانەش بریتین لە : ـ

1– بەهۆی ڕۆیشتنو سوڕانی ئاو لە ناویدا . ئەمەش کولێنەر دەکات بەدوو جۆرەوە .

أ ـ کولێنەری ڕۆیشتنی سروشتی Natural flow .

ب ـ کولێنەری ڕۆیشتن بەهێز Forced flow .

**2– بەهۆی پەستانەی هەڵمەوە .**

أ ـ کولێنەری پەستانەی کەم 250 پا / إنج$^2$ .

ب ـ کولێنەری پەستانەی ناوەندی « 250 تا 500 » پا / إنج$^2$ .

جـ ـ کولێنەری پەستانەی زۆر « 500 تا 1000 » پا / إنج$^2$ .

**3– بەهۆی دروستکردنو نەخشە دانانیەوە « BY Design » . یان بەهۆی گەرم کردنو ڕۆیشتنی گازاتەوە .**

أ ـ کولێنەری بۆری ئاگر Fire tube boiler

ب ـ کولێنەری بۆری ئاو water tube boiler

**4– بەهۆی فراوانیو بەرهەمی هەڵمەوە**

أ ـ کولێنەری بەرهەمی کەم .

ب ـ کولێنەری بەرهەمی ناوەندی .

جـ ـ کولێنەری بەرهەمی زۆر .

**5– بەهۆی ڕێکخستنی ڕووبەری گەرماییەوە .**

أ ـ کولێنەری ستونی

ب ـ کولێنەری ئاسۆیی

لەم هەلویستەدا بەکورتی باسی کولێنەری ڕۆیشتنی سروشتیو ڕۆیشتنی هێزو کولێنەری بۆری ئاگر دەکەین ، وە لە دەرفەتێکی کەداو بەدرێژیو بەشێوە یەکی فراوان کولێنەری بۆری ئاو دەدەینە بەر ڕووناکی باسەکەمان .

**1– کولێنەری ڕۆیشتنی سروشتی ـ**

لەم جۆرە کولێنەرانەدا ڕۆیشتنو سوڕانی ئاو تیایا سروشتیە . تەواو کردنی گەڕانی ئاو لە بۆرییەکاندا لەسەر تەزووە هەلگرەکان « Convection current » وەستاوە . هەروەکو تۆزێك لەمەوبەر وتمان چینێك گەرم دەبێتو بەرز دەبێتەوەو چینێکی سارد لەسەرەوە دێتە خوارێو جێگای دەگرێت ، تاوەکو بەم جۆرە هەموو ئاوەکە گەرم دەبێت . لە ئەنجامدا ئەو ئاوەی لە کولێنەرەکەدایە لەچەند سووڕانێکدا لەناو بۆرییەکاندا دەبێت بەهەڵم . بەشێوەیەکی گشتی لەم جۆرە کولێنەرانەدا بە درەنگ هەڵمان دەست دەکەوێت .

**2– کولێنەری ڕۆیشتن بەهێز ـ**

لەم جۆرە کولێنەرانەدا ڕۆیشتنو سوڕانی ئاو تیایا بەهۆی ترومپاوەیە . ئەم ترومپایە دەکەوێتە نێوان لولەیەکی سەرەوەو خوارەوە . ئەم کولێنەرانە لەسەر پلەی گەرمایی ئاوەکە نەوەستاوە بۆ دەستکەوتنی هەڵم ، بەڵکو بەرهەمی هەڵم پەیوەندی بە پەستانەو هێزی ترومپاکەوەیە . قازانجو سوودی ئەم جۆرە کولێنەرانە لەوەدایە کە دەتوانێت بڕێکی زۆر دەربکات لەچاو ئەو کولێنەرانەی جۆرەکانی تر کە چەشنی قەوارەیان هەیە . ئەوەی لەم کولێنەرانەدا مەترسی لێدەکرێت وەستانی ترومپاکەیە .

**3– کولێنەری بۆری ئاگر ـ**

بریتیە لە بۆرییەك یان لە کۆمەڵە بۆرییەکی توندو تۆڵ خراوەتە باوەشی لولەکیەکەوە . گڕو گازاتە گەرمەکان کە لە ئەنجامی سوتاندنا پەیدا دەبێت بەناو بۆرییەکاندا تێپەر دەبێت ، وە لەدەوروبەری بۆرییەکان ئەو ئاوە هەیە کە پێویستە بکرێت بە هەڵم[3] . ڕووکاری ئاوەوەی بۆرییەکان گەرمایی لە گازاتەکان بەهۆی هەڵگرتنو تیشکدانەوەوە وەردەگرێت . بڕوانە وێنەی —2— .

چەند جۆرێك لە کولێنەری بۆری ئاگر هەیە . جۆرێکیان بۆرییەکان بە شێوەی ئاسۆیی دانراوە ، وە جۆرێکی تریان بە شێوەی ستونی دانراوە ، وە کۆکراوەی هەردووکیان جۆرێکی تر دروست دەکات .

لەنێوان کولێنەری بۆری ئاگرو کولێنەری بۆری ئاودا چەند جیاوازییەك هەیە ، ئەم جیاوازیانەش بریتین لە : ـ

1– لە کولێنەری بۆری ئاگردا بۆرییەکان خراونەتە ناو لولەکیەکەوە . بەلام لە کولێنەری بۆری ئاودا هەر هەموو بۆرییەکان لە دەرەوەی لولەکیەکان قایم کراون . چەند

کوڵێنەری بۆری ئاگر گەورەتر بێت پێویستە لەگەڵیا لوولەکیەکەش گەورە بکرێت . وە کە لوولەکیەکەش زیاتر لە سنورێکی دیاریکراو گەورەتر بوو توانای دروست کردنی کەم دەبێتەوە . لەبەر ئەوە ناتوانرێت بەرهەمی زۆری لێ وەربگیرێت لەبەر بچووکی قەوارەکەی . بەڵام لەبەر ئەوەی لە کوڵێنەری بۆری ئاودا بۆرییەکان لەدەرەوەی لوولەکیەکانن بەپێی پێویستی بۆرییەکان دادەنرێت وە قەوارەیان گەورەو بچوك دەکرێت ، وەگەورەترین رووبەری گەرمایی لێ دروست دەکرێت وە توانای ئەوەی هەیە کە گەورەترین بڕ لە هەڵم دروست بکات بە پەستانەیەکی بەرزیش کە لە کوڵێنەری بۆری ئاگردا ئەم توانایە نیە .

2– لە کوڵێنەری بۆری ئاگردا گازاتەکان بەناو بۆرییەکاندا دەڕوات . بەڵام لە کوڵێنەری بۆری ئاودا گازاتەکان بەسەر رووکاری دەرەوەی بۆرییەکاندا تێپەڕ دەبێت .

3– رووبەری گەرمایی بۆرییەکانی کوڵێنەری بۆری ئاگر کەمترە لە رووبەری گەرمایی بۆرییەکانی کوڵێنەری بۆری ئاو . چونکە لە کاتی حساب کردندا ئەو رووبەرە وەردەگیرێت کە یەکسەر بەرامبەر ئاگرەکەیە . لەبەر ئەوەی لەبۆری ئاودا گەرماییەکە لە رووبەری دەرەوەی بۆرییەکان دەدا ، لێرەدا تیرەی دەرەوەی بۆرییەکان حساب دەکرێت بۆ دەرهێنانی رووبەرەکە . بەڵام لەبەر ئەوەی لە کوڵێنەری بۆری ئاگردا ئاگرەکە لەناو بۆرییەکاندایەو رووبەری ناوەوەی بەرامبەر ئاگرەکەیە لێرەدا تیرەی ناوەوە حساب دەکرێت بۆ دەرهێنانی رووبەرەکە . لەبەر ئەوەی تیرەی دەرەوە لە تیرەی ناوەوە گەورەترە ، کەواتە رووبەری دەرەوە لە رووبەری ناوەوە گەورەترەو رووبەری گەرمایی زیاترە . لەگەڵ ئەمەشدا رووبەری گەرمایی بەندە بە هەندێ هۆی تریشەوە وەکو چۆنیەتی دانانی بۆرییەکان . درێژی ڕۆیشتنی گازاتەکان . بەکارهێنانی ئامرازی کاریگەر بۆ سوتاندن ،هەروەها پاکوخاوێنی بۆرییەکان .

## 4– کوڵێنەری بۆری ئاو –

بریتیە لەچەند لوولەکیەك‌و کۆمەڵە بۆرییەك ئاوێتەی هەڵم‌و ئاو لەناویا دەسورێتەوە . گەرمایی لە دیوی دەرەوەی ئەم بۆرییانەوە دەپەڕێتەوە بۆ ئاوەکە . ئەم جۆرە کوڵێنەرانە یەکێکە لەو کوڵێنەرانەی کە ئێستا بەزۆری لە کارگەکان‌و ئیستگەی هێنانە بەرهەمی هێزی کارەبادا بڵاوە . بڕوانە وێنە –3– .

بەکارهێنان‌و بڵاوی‌و چاکی ئەم کوڵێنەرانە دەگەڕێتەوە بۆ : –

1– دەتوانێت بڕێکی زۆر لە هەڵم بهێنێتە بەرهەم‌و رووبەرێکی گەورەی بەرامبەر ئاگرەکەیە بۆ گەرمایی هەڵمژین بە تیشکدانەوەی ئاگرەکە .

2– لەبەر ئەوەی لوولەکی هەیە « بۆ ئاو » هەمیشە ئاوی تیایە . بەهیچ جۆرێك ئاگرەکە بەهۆی تیشکدانەوەوە کاری لێناکات . لەبەر ئەمە لە مەترسی سوتاندن بەدوورە .

3– توانای بەرگە گرتنێکی زۆری پەستانەی هەیە . ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەو پلێتە ئەستورانەی لێی دروستکراوە .

4– زوربەی زۆری پارچەکانی بە ئاسانی دەست دەیگاتێ بۆ پاکردنەوەو گۆڕین‌و پشکنینی .

5– توانایەکی بەرزی هەیە .

6– قەوارەی کوورەکەی بەشێوەیەکی ئەوتۆیە کە دەتوانرێت هەمە چەشن سووتەمەنی بەکار بهێنرێت بەبێ ئەوەی هیچ جۆرە گۆڕانێکی تیا بکرێت . لەبەر ئەمە لەگەڵ گۆڕانی نرخی سووتەمەنی لەبازاردا دەتوانرێت هەرزانترینیان بەکار بهێنرێت .

7– کوڵێنەری بۆری ئاوی گەورە بەخێرایی‌و ماوەیەکی کەم هەڵم دروست دەکات ، لەبەر گەورەیی رووبەری گەرماییەکەی‌و درێژی رێگای ڕۆیشتنی گازاتەکان‌و خێرایی سوڕانی ئاو لەناویدا .

8– توانای هەڵگرتنی بارێکی زۆری هەیە « بەرهەمی هەڵم » . هەست پێکردنێکی خێرای هەیە بەرامبەر هەموو ئەو گۆڕرانەی روو دەدات لەوەرگرتن‌و داواکردنی بار « Load » دا .

9– سەربەستیەکی تەواوەتی هەیە بۆ بەرزکردنەوەو داگرتنی فراوانیو پەستا نەکەی .

بەشێوەیەکی گشتی ئەم کوڵێنەرە لەم بەشانەی خوارەوە دروستبوە : –

1– پاشەکەوت کەرەوە « الموفر – مسخن الماء » – Economizer

2– هیتەری هەوا . « مسخن الهواء – Air Heater »

3– لوولەکی سەروو . « الأسطوانه العليا – Upper drum » .

4 — بۆرییە نزمە ڕۆکان . « الأنابیب النازلە ـ Down Comer » .

5 — لوولەکی خواروو . « الأسطوانە السفلیٰ ـ Lower drum » .

6 — بۆرییە بەرزە ڕۆکان . « الأنابیب الصاعدة Rizer » .

7 — داخدان . « المحمص ـ Superheater »

8 — کورەو ئامرازی هەڵکێشان .

9 — پاشکۆکان ـ کە بریتین لە : ـ

أ ـ دەرچەی پاراستن . « صمام الأمان Saftey valve » ✱ .

ب ـ شوشەی ئاست « المؤشر الزجاجي ـ GLass Level » .

جـ ـ سوتوو لابر . « طاردات الرماد ـ Soot blower » .

د ـ بۆران . « cyclone »[4]

هـ ـ مەشخەڵەکان . « المشاعل ـ Burner »

و ـ ڕێکخەری ڕکێف . « منظومة السیطرة »

## پەراوێزەکان

1 — کولێنەر ـ لە عەرەبیدا ووشەی « المراجل البخاریة وغلایە » بەکار هاتووە بۆ « Boiler » وە لە فەرهەنگە کوردییەکاندا زاراوەی مەنجەڵ ، قازان ، تیان ، بۆ ئەو دەفرانە بەکارهاتووە کە چێشتی تیا لێنراوە . بوێلەر تەنیا دەفرێکی رووت و قووت نیە . بەڵکو بریتیە لەچەند پارچەیەکی گرنگ و چەند پاشکۆیەك کە هەر هەموویان یەکیان گرتوەو کولێنەریان پێك هێناوە بۆ مەبەستی کوڵاندنی ئاو .

2 — هەڵمی داخ ـ ئاوبرێك گەرمایی دەمژێت و دەبێت بە هەڵم . هەڵم خۆی لەخۆیدا گەرمە . وە کە دەڵێین داخ . ووشەی داخ بە مانای زۆر ، Super گەرم دێت . وە ئەو بەشە گرنگەی کولێنەر کە هەڵمی تیا داخ دەکرێت و پلەی گەرمایی تیا بەرز دەبێتەوەو هەڵمی تێری تیا دەگۆڕێت بە هەڵمی وشکی داخ ناو دەبرێت بە داخدان « Superheater » . واتا شوێنی سورکردنەوەی هەڵم . زۆر جار ئەم هەڵمە ناو دەبرێت بە هەڵمی زیندوو « Live steam » چونکە توانای ڕاپەراندنی کاری هەیە .

3 — سەماوەر کولێنەری بۆری ئاگرە . ناو بۆرییەکەی ناوەڕاستی ئاگری تیایە ، وە دەورو بەری ئاوە .

4 — بۆران ـ ئامرازێکە بەکار دەهێنرێت بۆ جیاکردنەوەی هەڵم لەئاو . لە ناو لوولەکی سەرەوەدا دادەنرێت لە کاتێکدا ئاوێتەی هەڵم و ئاو بەم ئامرازەدا تێپەر دەبێت گێژاوێك لە چەشنی بۆراندا دروست دەبێت . هەڵم و ئاوەکە دەست دەکەن بە خولانەوە . بە هۆی هێزی چەقە تاودانەوە « الطرد المرکزي » ئاوەکە لە هەڵمەکە جیا دەبێتەوە . ئاوەکە دەبارێتەوە خواری بۆ ناو لوولەکی سەرو ، هەڵمەکەش دەڕوات بۆ داخدان .

✱ دەرچەی پاراستن ـ ئەو ئامرازە زۆر گرنگەیە کە لەسەر کولێنەر دادەنرێت وە بە دووری دەکات لە تەقین . بەربەستی پەستانەی کولێنەر دەکات کە لە ڕادەی دیاریکراو سەر نەکەوێت . پاراستنی کولێنەرو ئەو کەسانەی نزیك بە کولێنەرن لە ئەستۆی ئەمدایە .

لە گۆڤاری پەروەردەو زانستی ژمارە 14 ساڵی 1978 لە لاپەرە 63 دا بۆ مانای « صمام الأمان » زمانەی دڵنیا هاتووە . بەڕای من ئەگەر تەماشای کاری ئەم دەرچەیە بکەین دەرچەی پاراستن لە زمانەی دڵنیا لەبارترە . چونکە ئەم دەرچانە تەنها بە ڕۆڵی پاراستن و پارێزکاری هەڵدەستن . ئەوەی ئاشکرایە ئەم دەرچانە لەسەر ئەو ئامرازانە قایم دەکرێن کە پەستانەی تیابێت . لە کاتێکدا پەستانە لە ڕادەی دیاریکراو بەرزتر دەبێتەوە ئەم دەرچانە لە خۆیانەوە دەکرێنەوەو پەستانە زیادەکە فڕێ دەدەنە دەرەوەو پارێزکاری ئامرازەکان دەکەن کە تەنها ئەو پەستانە دیاری کراوەی تیابێت کە بۆیان دانراوە . وە بەهیچ جۆرێك ڕێگا نادەن کە پەستانە بەجۆرێکی ئەوتۆ بەرزببێتەوە ئامرازەکان دوچاری زیان و تەقین و خەڵکەکەی دەورو پشتیان تووشی ئازار ببن . واتا کاری ئەم دەرچانە پاراستنی ماددەو مرۆڤە .

....سەرچاوەکان


1 — Steam , its generation and use .
Babcock and wilcox
38 — edition — 1972

2 — Standard Boiler operators
Questions and answers
Elonka and kohan

3 — Fundumentals of heat engineering
and Hydraulics
A .Chernov
N .Bessrebrenikov

4 — القدرة الناتجة عن البخار والهواء والغازات ترجمة ـ الدکتور عبدالمنعم احمد رزق والسید سلیم الملا .

5 — الالات الحراریة
محمود ابراهیم

6 — صناعات
حسن جعفر المرسومي
1966 ـ بیروت

7 — « الأستفادة من البخار » برنامج سبیراکس سارکو ، التعلیمي المبسط
1978 ـ إنکلترا

8 — ئەو پیاوەی ویرای بیرسێ
کورامینسن ـ جەلال تەقی

9 — گۆڤاری پەروەردەو زانست .
ژمارە 14 تایبەتی ساڵی 1978

# باران نەهاتن

ئەمین حەیدەر ـ بۆتانی

ل هەمی دەڤەرێت كوردستانێ هەروەكی ئەم دزانین كو هەر هەلكەڤتنەك دناڤ كوردەواریێدا ڕەنگەكێ خوییێ تایبەتی هەیە . هەروەكی باران نـەهاتنێو ئـان دروینێو ئان سـاڤار لێكـرنێو ساڤـار قوتـانێو دەستاڕو گـەلەكێت دی . بـاران نەهاتنیش ئەونی یە كو ئەم بێژین تشتەكی كەمە . باران نەهاتن گروڤێ گرانییو برسیو نەبینیێ پێڤـە دیارە . بـاران نەهـاتن كارەكێ مەزن كریە سەر بابو بـاپیرێت مـە ل چەنـد سالێت بورین .

كو ئەم دشێن بێژین گەلەك مال توشی دەردێ گران هاتینە ل دویڤ بـاران نـەهـاتنێ . هـەروەكی هـەژاریو ژینـا پـر ئەستەنـگو وێرانیو هـەزار دەردێ تالو نـەخۆشتـر باران نەهاتن كارەكێ مەزن كریە سەر دەغلو دانو درامەتی ژلاییێ ئابورێ كو گەلەك مال ژینا وان ل سەر بو . نەهاتنـا بارانێو نەبینا دەغلو دانیو گروڤەكێ مەزن بوو .

بۆ ئەوان گوندیا كو ژینـا وان دكەڤیتـە هەژاریو ئـاستەنـگ ترسێدا . هەروەكی مە ل پێشییێ دیاركر . دناڤ كوردەواریێدا بەلاڤەو نەخاسمە . د دەڤەرا بەهدینا . بـ تایبەتی دناڤ هەمی گوندێت كوردستانێ . بـ هەلكەڤتنـا باران نـەهاتنێ . لاوێت گوندا . گەلەك جار مرۆڤو ژنیش پشكدار دبون . ڕۆژەكێ خڕ ڤەدبوونو هەندەك لاری دكرنو خۆ مژویل دكرن . بەلكی هیڤیا وانیش بهێتەجێ .

1 ـ **شەڕە گاڕان** : هەكە سالەك باران نەهاتایە . ژنا ئاغای سپێـدەكێ زووی ڕادەبوو دارەكێ مـەزن هەلدگـرتو دچو سەربانیو دەنگ دكرە خەلكێ گوندی .

خۆرتو ژنو مرۆڤ كالێت گوندی خڕ دكرەڤەو دگۆتێ : هەرئێك بۆ خۆ دارەكێ مـەزنو باش پـەیدا كـەن . ئەوانیش رادبون . دچون ئێكو دارێ مەزنوباش بۆخۆپەیدا دەكر . ژنا ئاغای دەنگ دكرە خـەلكێ گونـدیو دگۆتی : هلون دابچینـە گاڕانی فلان گوندەی . خڕ خۆ پـەیت دكرنو دكـەڤتنە ڕێ . دچوونە ئاڤارێ نك گاڤانێو بـ كۆتەكی گاڕانی ویدا دەنە پێش خوە . گاڕان دهاژووتن بۆ گوندێ خۆ . گاڤانیش دچو خەبەر ددا گوندێ خۆ . كو فلان گوندە گاڕانێ وی یێ بری . مرۆڤو خۆرتی گوندێ گاڤانیش خۆ پەیت دكرنو ئێكو داریش دەستی خۆدا دگرتنو زووی دكەڤتنە ڕێ دابچن گاڕانێ ڤەگێڕن . هەكە شیابان بگەهنە وان ... دابێتە شەڕە دار دناڤ بەرا هـەردوو جوینا . گەلەك جارا سەرێ ئێكو دوو دشكـاندنو ئێـكو دوو دئێشاند ... بەلێ ئەڤ جوینا كو گاڕان بری . هندەك گـاڕان دهاژۆتنو هندەك دا شەری كەن گوندێ گاڤانی مژویل دكرن بـ شەڕیڤە . هەتا شـەڕ بدویمـاهی هاتبـا دا گاڕانی كـەهینە گوندێ خوە . پشتی هەنگی گوندیێ گاڤانی دكەڕیانەڤە گوندێ خۆ پشتی كو نەشیایی گاڕانێ خۆ ڤەگێڕیت . دچونە كۆچكێ دادنیشتن . بەلێ چ كو هندەك سەرێ وان شكەستیو هندەك پێچكێ وانو هندەك چاڤی وان خوین ڤێرا تێتن . ژحەژ مەتێت خوە نەدشیان قسەكێ بكەن . بەلێ گوندێ كو گاڕان بری گاڕان دادكرنە حەوشێ مالێ ئاغای بدل خۆشی دچونە كۆچكێ ئاغایو دانیشتنو دبۆ قەرەبالغو قەهوە ڤەخارن . هەر ئەڤ ڕۆژ گاڤان لدویڤ گاڕانێ خۆ دهات . كو گاڤان دگەهشتە گوندی . دابەنە

ماليّ ئاغـاى . هەر ژنـەك ژوان ژنێت كو پشكـدار بووين ژڤێ شەڕێ .

داهەلستێت گاڤانى خەلاتكەت . ژنەك دا دوٚخینـەكێ دەتێ . ئێكادى دا پاكـەتە تـووتینەكێ دەتێ . ژنـەكا دى دا شخاتەكێ دەتێ . ئێكا دى دەفتەرەك و ئێك كیسە مێڤیژو هەمى خڕ ڤەدكرن و پشتیدا دەنە گاڤانى . خارنەكێ بـاشیش چێ دكرن . گاڤان نان دخارو قەهویێ خوٚ ڤەدخار . دا گاڕانێ دەنە پێش گاڤانێ و بـ دل خوٚشى بڕێ دكرنەڤە گوندێ وى ... دەمێ ئێڤارێ بـ ئەمرێ خودێ دبوٚ عەڤر . هەرڤى شـەڤیش بارانێ لێدكرو هێڤیێ وان گوندیا داهێتـە جێ و جارەكـا دى خوٚشى و شادى دكەڤتە گوندى . دگەل هاتنا بارانێ . جارەكادى گرنژین خوٚ دیار دكر ل سەر لێڤێت گوندیاو دابیتەڤە ئەرزانى ....... .

2 ـ **هوٚزەبانە** :ـ هەكە سالەك باران نەهاتایە . ئولڤى سالى ل گوندى مروٚڤەك ژناوى كورەك ببا . خوٚرت و مـروٚڤێت گونـدى دچوونە برایێ ئەو مروٚڤى كو ژنـاوى كورەكێ بێ . دگـوٚتنێ هەنگ هوٚزەبانە نەدایە . چارە نیە پێدڤى یە بدەن . بكوٚ تەكێ خورماو مێڤیژو تشتێ هوٚلڤێ مالێ دستاندو ئەڤ مروٚڤیش دبرنە سەركانیكێ بڤى سەرمایێ دا هاڤێنە كانیكێ پشتى هەنگى عەڤر بەرێ عاسمانێ دگرت و بارانێ لێ دكر ...

3 ـ **نڤێژێ بارانێ** :ـ دیسا بـ هەلكەفتنا نەهاتنـا بارانێ . مروٚڤەكێ خودێ ناس و ئولى پەروەر دێ ل گوندى رابیت و چەند مەلاو سوٚفى و خودێ ناسا دگەل خوٚ دبەت و دچنە سەركانیكێ گوندى ئو ل مێژێ دێ نڤێژى بارانێ كەن و پشتى دگەرێتەڤە گوندى . لدویماهیێ عەڤر بەرێ عاسمانێ دگریت و دیسا باران دێ لێكەت ... .

ئەمەش چەند مـالكە هـوٚزانەك كـو بـڤى هەلكـەفتنێ ڤەهاندیيە ...

**سالەكى قەومى باران نەبارى**<br>
**جوٚگەكیان لێدا بە عامێى شارى**<br>
**لەبەریان چاندبو گەنمێ بوهارى**<br>
**گەنم ڕاوەستا وەكى دیوارى**<br>
**داپێ بژیتن مەخلوقێ شارى .**

# مەزنا گوتیە

—

ورەگرتنا : محمد حسن بناڤى

—

## پێ بكەت دێخوت ، پێ نەكەت ناخوت

دبێژن كوڕە جحێلەك و دەیكا خو هـەبوون ، لگـوندەكى دژین خوجهێد گوندى بوون ، ئەو سێ سالْ بوو باب لێ مرى ، چ خویشك و براو كەس و كارێد خو نەبوون ، بابێ وى هندەك زەڤى و جوتەكێ گا بوٚ هێلابوون ددویڤ خوڕا . گایێد كوڕكى گەلە دلاوو ژێهاتى بوون ، كتا وان هەر نەبوون. كـوڕك هندێ شـولكەرو بەحەرس بوو ڤیابا هەر سالْ بەرى خەلكێ گوندى هەمێ توٚڤێ خو هاڤێتبا ، هەكەر بێهنا وى جها نەدهات. بەوێ كێـزگێزێ و جوتكاریێ ژیارا وان پێدبوو.

زڤستان بوو، دەمێ چ جوت و كێلا نەبوو، لمالْ دڕوینشتى بـوون ، روٚژەكێ دەیكـا وى گـوتێ : داوا دلێ من بێ دچیت گوشتى ، كوڕكى گوتێ : دایێ مادێ ئەز چ لتە كـەم؟ چ پارەو دراڤ د لەپ مەدا نینن گوشتى پێ بكڕین بخوین.

پیره دەیکا وی نەچار بوو، دلێ وێ گەله دچوو گوشتی، هەکەر بدلەکی‌و هەکەر بسەدا، گوتە کورێ خو دێ هلو داوا؛ گایێ جوتی بۆ مە ڤەگوژەو سەرژێبکە، دا بخوین پاشی ئەز دێ بۆ تە گایەکی پەیداکەم، جوتی پێ بکە. ئینا کورکی گوتێ: دایێ دێ مینم مەحتل، چ گا ڤ دەست من ناکەڤن، پارەژی مە نینن ئێکێ دی پێ بکرین. ئینا دەیکا وی گوتێ: داوا حەتا بهارێ وەختێ جوتی خودێ کەریمە کا تۆ سەرژێبکە دا ئەم تێر گوشتی بخوین، تە دل پێڤە نەبیت، خەما دەیکا تە. کورکی گوتێ: باشە دایێ بەلێ ئەگەر تە چ پەیدانەکرن، پاشی سوژا خودێ لمن کەتبیت، ئەز تە لبەر گایێ دی گرێدەم شوینا گای جوتی بتە بکەم، دەیکا وی گوتێ: بلا داوا قەیدی‌نینە.

کورێ پرێ رابوو، گایەکێ خو ڤەکوشت‌و گوشتێ وی ژێك ژێك کرو خار. ئو کورك مال هیڤی‌یا دا خو کا دێ کەنگی گایەکی بو پەیدا کەت. نە رۆژەکێ، نە دوواو نە سێ‌یا هەتا بوی بهار، نەهـ دەهـ رۆژەك ماین بۆ وەختێ جوتی‌و کێلانا، ئینا کورکی گوتە دەیکا خو تە چ گا پەیدانەکرن، دا وی گوتێ: نە وەلا داوا، دێ سوباهی چم سەحکەمێ رۆژا پاشتر دا کورکی رابوو چوو نك ڤی‌و نك وێ هە وەختێ جوتیە کەسێ چ گا نەدانڤێ.

کورکی خو گرت هەتا رۆژا پاشتر دەیکا وی چ گا بۆ پەیدانەکرن، دەمێ کاریەو خەلکێ دچیتە جوتی، ئەوێ لمال روینشتی‌یە چ گا ڤ دەست ناکەڤن جوتی پێ بکەت، ئو هەر سال وی دەهـ رۆژا بەری گوندیا شیڤێد خو توڤ‌دکرن. گەلەك تورەو سل بوو ئو تنگزی، ژ بنێ گوهێ خو ئێڤاری گوتە دەیکا خو؛ تێر شیڤێ‌و تێشتێ بخو سپێدێ زوی دێ تە لبەر گایێ دی گرێدەم‌و جوتی‌کەم. گاڤا گول دەنگێ وی بوی، گەلە ترساو گوت: داوا ئەز نەشێم ئەزا پیرم من ئەو هێزو ڤەژەن نینە، ئەز دێ چاوا نیرکێ گایێ دی کێشم ئو ملێ منێ ب ملێ وی‌ڤە بیت؟! ئینا کورکی گوتێ ئەڤە تە بڤێت نەڤێتە، پا بوچی تو دشیای گای ب من بدەی سەرژێکرن، گوشتێ وی بخوی؟ ئان گوشتێ خوش‌بوو؟ سپێدێ زوی دەیکا خو دا بەری خو، ئو نیرك‌و مژانەو هەڤجار بدویڤ گای‌ڤە گرێدان چوون ناڤ زەڤیا خو ئو دەیکا خو لگەل گای لبەر جوتی گرێداو جوت‌پێ‌کر.

باژێرەکێ ژرەخ گوندی‌ڤە، بوو حاکمێ باژێری‌و خولامێ خو دەرکەڤتبوون سەربانی بەرێخو ددا چان‌و رەخێد باژێری، چاڤێ وی ڤ کورکی‌و دەیکا وی کەڤت، ئینا حاکمی گوتە خولامی: ئەرێ وێ هە نە مروڤە لبەر گایێ هە گرێدای!؟ خولامی گوتێ: بەلێ ئەزبەنی مروڤە، حاکمی گوت خولامی؛ هەرە بێژێ حاکمی تۆ یێ خاستی، کانێ ئەو چ بێ‌بەختە؟.

خولام چوو نك کورکی‌و گوتێ: حاکمی تۆ یێ خاستی. کورکی گوتێ جوتێ م ما برێڤە حاکمی چ ژمنە؟ جوتێ خو هلاو چوونە نك حاکمی‌و گوتی: حاکمێ خوش‌بیت تە چ ژمنە تە ئەز هلام بەتال. ئینا حاکمی گوتێ ئەو چ مروڤە تە لبەر گای گرێدای‌و جوتی‌پێ‌دکەی؟! ئەزبەنی پیرە دەیکا منە. ئینا حاکمی گوتێ: ما تۆژ خودێ ناترسی؟ هەی بێ‌بەختێ بێ‌وژدان. ئینا کورکی گوتێ نە ئەزبەنی نە وە نەبێژە، ئەزێ حەقم، ئو سەرهاتیا خو بۆ حاکمی ڤەگێرا.

حاکمی گوتێ هلۆ هەرە دەیکا خو بەردە ئەزدێ گایەکی بۆ تە پەیدا کەم. کورکی گوتێ حاکمی خوش‌بیت، وەختێ جوتیە کەس گایێ خو نادەت ڤە. کورك بهیڤی‌کرو نەچاربوو چوو دەیکا خو بەرداو ڤەستا کوچکا حاکمی کرو گوتێ: بۆمن گایەکی بینە جوتێ من ما برێڤە، هەر سال ڤی دەمی من جوتێ خودکرو توڤ ژی دکر، دەیکا منژی شتی تە دگوت حەتا جوتێ من هێلای برێڤە.

حاکمی خولام ڤرێکرنە نك جوتیارا گایەکی، کەسێ چ گا نەدانە ڤێ ژبەرکو وەختێ جوتی بوو. حاکم نەچاربوو گوت: پا دێ هەرە فلانە گەلی من جانەگایەکێ هەی ئەوە بگولکینی م بەردای هەتا نوکە، یێ کویڤی بووی وەکی دەهبا لێهاتی، ئەگەر بشێی هەر بۆ خو بینە. دلێ وی گەلە خوش‌بوو ئو سوپاسی‌و منەت بۆ خو ژ حاکمی گرتن.

کورکی ڤەستا گەلی کرو چوو سەر کانیکێ، جهێ خو نەپەنی چێکرو خو لبەر گای ڤەشارت، دەمەکێ رۆژێ بەرێ خو ددەتێ گا هات سەر ئاڤێ‌و خوێ‌رانا حەتا تێرئاڤ بووی، هندی هێزو ڤەژەن د کورکی هەی دارەك د گها ستوێ گای وەراندو دەستێ خو لباڤ پێ وی داو دا بەر دارا هەتا گا ئێخستیە

عەردیو شویتکا خو ڤەکرو کرە ستویو پڕ لبەر گایێ دی گرێدا و جوت پێکر حەتا ئێڤاری گایێ خو وەسا جوت خوشکر ژ گایێ دی چێتر.

رۆژا پاشتر، حاکمو خولام دەرکەڤتنە ڤە سەربانی، بەرێ خو ددەنێ ئەو مروڤێ جوتیدکەت و گایێ بریو باشێ عەلماندی جـوتی، جارەکـا دی خولام ڤـرێکر ددویڤرا، چـاخێ خولام گەهەشتیە نكو گوتیی کوڕکی گوت: وەهـ جامێ حاکمی شولە ژ منە؟ ناهێلیت جوتێ خو بکەم.

خولامو کوڕك چوونڤە نك حاکمی، حاکمی گوتێ: تە گا بـۆ خو ئینـا؟ گوتێ بـەلێ ئەزبـەنی من ئینـاو ئـەڤـە ئـەزێ جوتی پێدکەم. حاکم ژێ ما حێبەتگرتی، د دلێ خودا گوت چاوا ئەڤ جانەگایێ کویڤیو مروڤ نـەدیتین هـو بسانـاهی گرتو کەهیکر؟!

حاکمی هزرکرو بۆ خو گوت: بخودێ هەکەر ئەڤە کچا من نەعەلمینیت کەس نەشێت چ لێ بکەت، ئەو کچا ئەوە هەی هەی هەتا نهە نەدەرکەڤتیو وێ بخو نان نەخاری، هەمی دەما خدام نانو گرارا لبەر دەڤی دگرن دا بخوت، کەس نەشێت چ لێ بکەتو بعەلمینیت. بخودێ هەما بۆ ڤی مروڤی یا باشە. هەکەر هەر کەسێ بیت دێ لێ بیت بەلا:

ئینا حاکمی گوتە کوڕکی: وەرە دەستێ من، م کچا خودا تە. کوڕکی گوتێ: حاکمی خوشبیت، ئەو ژ من زێدەیە، تۆ حاکم ئو ئەز ئەڤ بەلنگازە، من نان نینە بخوم ژ من زێـدەیە. ئینـا حاکمی گوتێ: وەرە دەستێ من، م داتە بخودێ یا ژهەژی تەیەو کەسەکێ دینە. کوڕك چـوو دەستێ ویو کچا وی بخـو ژێ قەبویلکر، حاکمی هەر وێ گاڤی مەلایەكو دوو فەقە ئینانو لێ مارەکرو بۆ ڤەگوهاستو کرە داوەتو شاهی.

هەروەکی د پێشییێدا مە گوتی کوڕك گەلەکێ رێنجبەر بوو، بێهن نەگرت هەڤتیا وی خلاسببیت سپێدی زوی کارێ خوکرو چوو جوتی، لگەل چوونێ سێهلەکا تژی خولی کرە کوشا ژنا خو، ئو گوتە دەیکا خو: لایێ لڤێ مالێ بکەت دێخوت یێ نەکەت ناخوت !!. ئو گوتێ ئـەز هەر یێ بـەری نوکـەمە، تـو تشتەکی بدەیێ بێی ئەو کارەکی بکەن پاشی ئەز دزانم دێ چ کەم.

کوڕك چوو جـوتی، دەیکا وی کـارێد خـو کرنو نـەما راوەستا .. بویکا وێ بخو ژ جهێ خوژی نەلڤیو ئەو خولیژی ژ کوشا خو نەڤالاکر. کچـك دووسێ رۆژا ما بڤی حـالی کەسێ چ نەدایێ ما برسیو هەرۆ مێرێ وێ یێ سێهلەکا خولیێ دکەتـە کوشا وێ، ئو دبێژیت: یێ بکەت دێ خوت یێ نەکەت ناخوت. رۆژا چارێ کچك ما برسیو گوت دا ئەزژی کارەکی بکەم بەلکی خارنێ بدەنە مژی.

سپێدێ زوی ڕابوو خولی ژ کوشا خو ڕێتو گوتە خەسیا خو ئەز چ بکەم؟ خەسیا وێ گوتێ ئامانکا بشو دایێ، ئـامان شویشتن نیڤرۆ هندەك خارن دایێ، بێهنا وێ هات کچکێ گوت هەکەر هۆ بیت ژ ئەڤرۆ وێڤە ئەز دێ هەمی شولا کەم.

هەیامەك پێڤە چوو حاکمی گوت ئەز دێ چم سەحکەمە کچا خو کا مرە مایە؟ بەلێ سەدا سەد نوکە کوشتە چونکی ئەز دزانم چ کچە. حاکم چوو مالا زاڤایێ خو بەرێ خو ددەتێ کچا وی یا کاروبارێ فراڤینێ دکەت، حاکمی کەیفیخوشی لگەل کرو پرسیارا ساخیو سلامەتیا وان کرو رونیشتە خارێ.

کچا وی سەروبەرێ فراڤینێ دکر، دوو پێڤاز د دەستدا بوون، دانەڤ بابێ خو گوتێ ها باب هویرکە، یێ بکـەت دێ خوت، یێ نەکەت ناخوت، بخودێ هەکەر سپی نەکەی دێ مینی برسی. ئینا حاکمی پێڤاز ژێ وەرگرتنو دەست ب هویرکرنا وان کرو دبەررا هزرێد خو دکرنو دگوت چاوا کچا من هوسا بساهی عەلماندو گوهـخوشیکر.

چـاخی حاکمی پێڤـاز سپیدکرن کـوڕك ڤـژوورکەت، بەرێ خو ددەتێ حاکمێ پێڤازا هویردکەت، تنگژیو گوت، کچێ بوچی هەوە پێڤاز دانە ڤێو سپیدکەت؟ کچکێ لجهە بەرسڤا وی داو گوتێ: هەرێ یێ هاتی پێڤازا سپیکەت، پا ما تە ژبیرکر چاخێ تە دگوت: «یێ بکەت خوت، یێ نەکەت ناخوت».

حاکم گەلەك بزاڤایێ خو کەیفخوشبوو، چوو سەرێ ویو گوتێ: تە هزار جارا پیرۆزبیت و خێر ژێ بینی بو تە یاباشەو ژ رەنگێ تەیەو کەسێ دینە، قەسرەك دایێ لباژێریو پـارەو دراڤژی دانێو نەهێلا ئێـدی جوتیبکـەتو لگەل خـو برنـە باژێریو رونیشتە خارێ.

---

(١) ئەڤ سەرهاتیە ژ زاردەڤێ مجیدێ محمد طاهرێ بناڤی نڤێسیە یێ نوکە خوجهێ گوندێ لەزەکا لڤەزا سێمێلێیە.

مولود قادر بێخاڵی

بێ گومان گەلێك نە ئێمە زۆر جار بیر لە شەوانی رابردوو دەکەینەوەوە گەلێ وێنەی نابووتمان دێتەوە بەرچاو یەکێکیان ئەم کۆنە رووداوانە ن کە بابوو باپیرانمان لە شەوانی زستان دەیانگێرایەوە کە لە دەوروبەری گورك « ئاگردان » چوارگۆشەیان دەبەست بۆ گەرم بونەوە لە سرو ساردی زستان ، سینەی خۆیان ئەدایە بەر گڕی پوڵی داری قەلاشکەری لەبەر نەبونی زۆپاو گەلێ شتی تازەداهاتوو بۆ گەرمبونەوە ، بۆ رابواردنی ئەو شەوانەش شەوچەرە پاشەکەوت دەکرا کە بریتی بوو لە کاکلە گوێزو مێوژی سوورو رەش و لەتکە خۆخو لەتکە هەنجیرو باوی و دوشاو ربەهەنارو برمانوو خۆشاوو چەند شتی تر ، چونکە لەو سەردەمەدا چایە زۆر کەم بوو وە ئەگەر چایەش لێبنداربایە ئەوا هەر « دیشلەمە » بەکاردەهات و شەکری قەندیش ئەکرا بە کلۆ لە شەکردانی دار دادەنرا بەم گوێرەیە لە ژێر روناکی گڕی ئاگر یا روناکی قەندیلە کە پێك هاتبو لە قودیلەیەکی تەنەکەی لولە ، کونێکی لە ناوەراستدابو پر دەکرا لە نەووت ، بەلام نەوتێك تا بڵێی بۆنێکی ناخۆشی هەبوو دوکەڵێکی زۆری لێ پەیدا دەبوو لەبەر پیسی ، فتیلەیەکی پەرۆیان دەزووی تێ هەڵ دەکێشراو تا کاتی نووستن پێدەکرا ، ئەو سەردەمەی باسی دەکەم فانۆسیش لە زۆربەی ماڵەکاندا نەبوو نەك سورەیاو کارەباش بە ووتەی خۆش و مەتەڵ گێرانەوە شەویان رادەبواردو چونکە رادیـو لە هیچ ماڵێکدا نەبو نەك تلفیزنیش بەلام جاراجار سەنوقی قەوان لێدەدرا هەر شەوێکیش چیرۆکێکیان دەگێرایەوە ، ئەگەر کەم وکورتی رۆژانەو تەنگوچەڵەمەی گەردوونیان تووش نەبوایە . لەو سەردەمە گەلێك چیرۆکم گوێ لێبووە زۆریانم لەبیرە چونکە بیری مندالی زۆر تیژە زۆر رووداوی رۆژانی مندالی تاپیری لەیاد ناکرێت ، لەو هەموو چیرۆکانەی کە گوێم لێبووەو هەردەم لەبیرم ناچێتەوە چیرۆکێکە کە لە زۆر مالاندا و لە زۆر کۆبونەوەی شەواندا دەگێردرایەوەو لەسەر زمانی پیاوانی بەناوسالاندا چوو دادەهات چیرۆکی « جم جمەسلطان » بوو ئەویش لەم نوسینەدا من نامەوێ باسی شازادە « جمجمەسلطان » و ئازایەتی و خۆش بیری و چالاکی و سەردەمی کاربەدەستایەتی ئەو بکەم تەنانەت ئەمەوێ بۆتانی دەرخەم کە پێشینان لە کوردوستاندا چەند ساکاربوون ، ئەگەر بێ و بە ووردی لەم چیرۆکە بدوێین و بەقووڵی تەماشای بکەین و لێکدانەوەیەکی مرۆڤایەتی بۆ بکەین بۆمان دەر دەکەوێت کە لە کۆنی کۆنەوە بابو باپیرانمان چەندە بیروباوەریان بە ئایین هەبووەو بۆیە برایەتی و خۆشەویستی هەر بە تین بووە لە نێوانیاندا و گەلێ بە خزمایەتی بووین . هەردەم دەستی یارمەتیان بۆ یەکتر درێژکردووە ، زیارەو هەرەوەز هەردەم باوبووە لەنێوان دانیشتوانی دێهات و شارەکانی کوردستان بەتایبەتی لە وەرزی زستان . هیچ کاتێك نەیان هێشتووە باری ژیانی رۆژانەی جیران و خزمیان لاربێت . نانێکی رۆژیان

هەبوایە ئاواتیان ئەوەبووە کە نیوەی بدەن بە پێویستێ با سەرتان نەیەشینمو لەمە زیاتر درێژەی پێ نەدەم ، وا دێمە سەر باسی « جمجمە سلطان » . ناوەرۆکی ئەم چیرۆکەش ئەوەیە خوای گەورەو میهرەبان دەسەلاتی هەیە بەسەر هەموو چۆلو بیابانو هەموو گیانلەبەرێکدا . گەوران گچکە دەکا گچکان گەورە دەکا بلندان نەوی دەکا ، نەویان بلند دەکا ، هەژاران دەولەمەند دەکا ، دەولەمەندان هەژار دەکا هیچ هێزو توانایەك نی‌یە بەرامبەر بەهێزی خوای مەزنو میهرەبان رابووەستێ ...

شەوێك لەو شەوانە کە لەسەرەوە باسمکرد کاتێ کە چیرۆك ئەگێردرایەوە لەژێر لیفە شرەیەك سەرم لەسەر بالیفێکی کولکین بووو لەجیاتی دۆشەگ لەسەر بەرەیەکی رەق لێ‌ی راکشابووم . خۆم مات دابوو خەوم نەدەهات لەبەر دەنگە دەنگی ئەو زەلامانەی کە کۆببونەوە . ژنان « ئافرەتان » ئەو کاتە رێگای وتووێژیان لەگەل پیاوانا پێ نەدەدرا ، ئەبوایە هەر گوێ لە ووتوویژی پیاوان بگرن ئەگەر زیاتر لە دە ئافرەتیش لەوێ بووانایە وات بۆ دەردەکەوت کە گیانیان تێدا نی‌یە ، لەبەر سامی پیاوان زۆر بەهێمنی گوێیان لەمە تەلو چیرۆکەکان دەگرت .

لەپرێکدا چیرۆك گێرەوەیەك کە چاوی لەبەر دووکەلی ئاگرو قەندیلە بوو بوو بە گۆلە ئاو وەك لوولە مەسینە ئاو بە لووتیا دەهاتە خوارەوەو جار جار ئاوی لووتی هەلدەکێشایەوە وەك فر لە لەنگەری ماشی بەیانیان بدات وابوو ، گووتی : « برایان جارێك گوێم لە مەلایەك بوو باسێکی بۆ کۆمەلە پیاوێك دەگێرایەوە کە مەبەستی لە گەورەیی‌و دەسەلاتی خوای گەورەو میهرەبان بوو ، گوتی رۆژی حەشر لە ئاخرزەماندا خوای گەورە بە عیزرائیلی مبارەك دەلێت ئەی عیزرائیلی خۆشەویست ئەمەوێ بزانم لە سەردەمی کارتا کە گیان کێشانی هەموو ئادەمزادو گیانلەبەرەکانی تربوو بەزەییت بە کێ هاتووتەوە کە گیانت کێشایە ، وە مەترسیت لە کێ کردووە . عیزرائیلی پیرۆز وەلامی دایەوە گووتی : ئەی خوای گەورەو میهرەبان بەزاتی پاکت سوێند دەخۆم کە بەزەییم بە هیچ کەسێك نەهاتۆتەوە لەکاتی گیان کێشانی‌دا چونکە فەرمانی ئێوەم بەدی‌هێناوەو لە هیچ ئادەمزادو گیانلەبەرو زیندەوارێك نەترساووم لەبەر هەمان هۆ ... تەنها جارێکیان نەبێت نەختێك بەزەییم بە ئافرەتێك داهات کە لەسەر رۆژو سعاتی خۆی بوکە منداڵێ ببێت ، لە چۆلو بیابانێکا دوور لە هەموو ئاوەدانی‌یەك ، خۆر بەرەو ئاوابوون دەچوو شەو باڵی تاریکی کەم کەم بەسەر زەویدا ئەکێشا جانەوەرو درندە دەستیان بە جموجۆل کردبوو ، ئەو ئافرەتە کلۆلە کەوتە ژانو منداڵێکی کوڕی لێ جیاوازبووەوە ، بەبێ هیچ یارمەتی‌یەك لەژێر باڵی ئەم تاریکیەدا ئەم بچوکە کەوتە مژینی شیر لە مەمکی تەرمی دایکی‌یەوە کە بە ئەمری خوا پڕ ببوون لە شیری پاك .. هەروەها بۆ هێنانەدی فرمانی ئێوە بۆ کێشانی گیانی « جمجمە سلطان » نەختێك سەنگرامەوە کە دیتم مرۆڤێکی زۆر بەهەیبەتە کاژێری سەری لە گومبەتی حەمام دەچوو ، بالولی باسکی لە کاریتە دەچوو ، هەر چوار دەوری ئەو جێگایەی لێ‌ی راکشابوو دەستە دەستە پادشاو خاوەن شکۆو میران زۆر بە کزی‌و مەلولی وەستابوون . زۆربەی زۆریان فرمێسکی چاویان هیچ وەستانێکی نەبوو بە یەك دەنگ دەپاڕانەوەو هاواریان دەکرد ئەی خوای گەورەو میهرەبان باشیو تەمەن درێژی ببەخشە بە پادشای پادشایان « جمەمە سلطان » بەلام دیسان فەرمانی ئێوە لەهەموو ترسێك بەترس ترە بۆیە بەدی‌هێنانی پێویستە بێ‌ووچان ئەنجام بدرێ بەلام بە سپاردنی گیانی ئەم پادشایە گری ئاگری دەسەلاتداری ئەو کۆتایی پێ‌هات .... چونکە یەکێکی کە نەبو وەك ئەو بەزەبرو زەنگ بێت‌و ، خوای گەورەو میهرەبان دەلێت ئەی عیزرائیلی خۆشەویست ئەو منداڵەی کە باستکرد کە چۆن لەنێو چۆلو بیابان لەنێو درندە دور لە هەموو ئاوەدانی‌یەك‌و خزم‌و کەسێك بەبێ دایك‌و باوك لەسەر تەرمی دایکی کە مابووەوە بەزەییت پێداهاتەوە هەر ئەو کەسەیە کە بۆ گیان وەرگرتنی سەنگرایەوەو لەنێوان کۆشك‌و تەلارا لەژێر رووناکی گەوهەرو زەڕو زبەرو شۆرەسوارانداا . لێرەداو لەم چیرۆکەدا مەبەست دەردەکەوێ خوای گەورەو میهرەبان ئادەمیزاد بەزۆر جۆر تاقی‌دەکاتەوە ، بەهەژاری‌و دەربەدەربوونی‌و ، بە سامان زۆری‌و زۆرداریش ، بە هەر دوو لا ئەبێ مرۆڤ زۆر ئاگادار بێت بۆئەوەی هەژاری‌و ساماندار‌ی‌و دەسەلاتداری فریوی نەدات‌و لە رێگای راست لای نەدات بۆ ئەوەی هەردەم بیرو باوەری بە یەزدانی پاك بەتین بێت ...

ئەم باسە نەخشەیەکی تایبەتی‌یە لە نەخشە بلیمەتەکانی خوای گەورەو میهرەبان ...

پەخشانە شیعر

# لە پەنجەرەی ژیانی کچێکی عاشقەوە

دلٚژان زەندی
شۆریجە ـ کەرکووک

کەسەکەم ..
ئەو ژان و موچڕکانەی ،
لە ناخی دلٚی پڕووکاویما .. پەلٚەی داوە ..
عەشقە بالاٚی حەزەکانی تۆیە ،
ئەیەوێ گیانی ڕۆحم گڕ تێ بەرداو ..
بەرەو ووڵاتی بەفرو بارانم بەرێت .

* * *

گەر بەژنی کەلٚەگەتی تۆ ...
لە هەواری ئەڤین و دلداریدا ،
شۆرە سواری ڕێی نوالەو بنار نەبووایە ..
بۆ من پەیکەری خەمی پیرۆزتم ،
لە ڕۆخی زامەکانی دلی ناسکما .. هەلٚنەکۆلٚی و ،

لە بتخانەی سینەکەما .. ئەمپەرستی .. ؟ !
ئەی فریشتە نادیارەکەی ،
ناو تۆڕی ئاسمانی دلٚە شێتەکەم ..
ئەو کاتەی قۆلٚم کرد بە قۆلٚی تۆوەو ،
تۆم ناسی ..
نەمزانی عەشقت ئەبێتە لاولاوو
بە بەرزی شانمەوە دە ئالٚێ .. !

* * *

ئەوەتا ئێستاش .. سەردەمێکی دوورو درێژە ،
لەناو چرپەی بێ دەنگیت ..
شەپۆلی خۆشەویستی دووریت ،
لە باوەشی گرتووم ...

# بە ئاواتم !...

ئاخۆ کەی دێ
هەناسەی ساردی دەروونم
گەلاٚی داری باخەکەتان
باوەشێن کات !
لافاوی فرمێسکی چاوم
وەکو خوناو
گوڵ و خونچەی مالٚەکەتان
ئاو ڕشێن کات !

ئاخۆ کەی دێ
گڕی بە تینی دلٚداریم
بەرگی ڕەش و پڕ مەترسیت
بسووتێنێ
ڕەشە بای ڕەنگی تۆزاویم
سەرەو خوار بێ
کۆشکی زاوای دلٚ بە قینت
بروخێنێ !

سەروین عبدالکریم

# شەوەزەنگ

شەوەزەنگ بوو
لە تاریکایی کاتێکی پڕ سامناکا
من و بیرەوەریی یە ژاکاوەکان
لە ساتێکی خەیاڵیدا
دوو هاوڕێ بووین
گەردەلوولی ژانەکانی دڵی من و
ووشە تاساوەکانی نێو،
دەروونی ئەو بیرەوەریی یە خەمناکە
لێك ئاڵابوون
من ئەپرسم
بۆچی جارێ
بە مۆسیقای کەمانچە ژەن
لەیەك نابین!
یا بە دەنگی لاوانەوەی
سۆزی دایکێك
بۆ کۆرپەلەی بێ باوانێ
لەیەك نابین
ئەی شازادە!
لە ناخی دەروونی تۆوە
لەگەڵ منی دڵ سووتاوا
لە دوا ماچی چاوی ژینا
لەیەك ئەبین.

**رووناك محمد إبراهیم**
**سلێمانی 1983/5/7**

# ئاوازی ڕێبوارێکی شێت

کات ئەڕوات و..
حەزەکانم لەگەڵ کاتا، گەورەئەبن
پێیان ئەنێن بە هەزاران کارەساتا..
منیش لەگەڵ حەزەکانما
بەرەو خۆزگەی دیاری نەکراو..
هەنگاو ئەنێم،
ڕێگەی نەهات
ڕێگەی دووری پڕ کارەسات
هەنگاوەکانم قووت ئەدات
بە خەیاڵیش ئەڕوانمە هەتاوێکی دووری ئاسۆ
تا تۆو نیشتمان بەدی کەم
چونکە هەتاو ئاوێنەیەو
وێنەی ئێوەی لە ناخایە
دەبڕوانە،
ئەوە ئاوێنەی هەتاوە،
ئەوە تۆیت و، ئەوەش چیایە..

× . × . ×

نابم بە سوارچاکی خەیاڵ
بە باڵی ڕاستیم هەڵئەفڕم
هەر ئەگەڕێم
لە هەر کوێیەك کانیم بینی
لە هەر کوێیەك دەریاو چیاو جوانیم بینی
لەنگەر ئەگرم
تێر هەڵئەمژم بۆنی کوێستان
تێر ئەڕوانمە خۆرو چیاو
دارو بەردو گەردی وولات
ئەوسا یان ئەگەڕێمەوە
یان ئەگەمە بەرزترین لووتکەی ئاوات

**مەهاباد قەرەداغی ـ کفری**

# بۆ گڵکۆی یارم

عبدالله حسين رسول
رواندوز / 1982

هۆ گیانەکەم ،
جیابوونەوەت گڕی‌یەکەوە ، لە کوڵی دڵ خۆی هەڵداوە ،
لیستەی دەستی خوای مردنەو ،
ناوی منی تیا نووسراوە .
دۆزەخێکی نێو دەروونەو ،
نامەی بەختی تیا سووتاوە .
ماڵ ئاوابێت .. دوورگەیەکە ،
کۆشکی هیوای تیا رووخاوە .
دوورگەیەکی بێ بارانە ، خونچەکانی چارەنووسی
تێدا ووشك هەڵگەڕاوە ..

* * *

هۆ گیانەکەم ..
وێنەکانت نەشتەرێکن ،
کێڵگەی چاوم وورد دەکێڵن .
یادەکانت وەك ژاندرمە ،
ناخی مێشکم هەڵدە شێلن ..
هەوارگەکان وەکو هەیتەن ،
پەردەی دڵم دەخارێنن .
نامەکانت هەوری ڕەشن ،
خەم‌و ناسۆر دەبارێنن ..

* * *

هۆ گیانەکەم ،
نەمدەزانی ئەمساڵ ساڵی نەگبەتی‌یەوە ،
پەراوێزی ژین دەدڕێنێ ..
نەمدەزانی بەهار ئەمساڵ بێ‌تەمەنەو ،
گوپکەی تازەم ناتروکێنێ ..
نەمدەزانی ئەم هاوینە هێندەگەرمە ،
ئەشکی ساردم دەهەلمێنێ ..
نەمدەزانی پایزێکە بێ کۆتایی ،
گوڵی هیوام دەوەرێنێ ..
نەمدەزانی زستان ساردو سایەقەیە ،
کەنار دەریای چارەنووسم ڕەق هەڵدێنێ ..

* * *

هۆ گیانەکەم ..
گەر ئەمجارە هاتی بۆ لام ،
هیچ مەپرسە لە خەڵکی شار ..
سەرم بۆتە کێوێکی ڕەق ،
چاوم کانی‌و ، ئەشکیش ڕووبار ..
هەناسەم سارد وەك بای خەزان ،
قژم هەروەك پووشی تەلار ..
ناخی دڵم ئەشکەوتێکە ،
پڕ لە ناڵە ناڵ‌و ئازار ..
گەر نەشهاتی ڕۆژانێك دێت ..
من دێم بۆ لات ، بە زەندوڵی مەرگ‌و مردن ،
پەیتا .. پەیتا .. بۆت دێمە خوار ،
بۆت دێمە خوار ..

# سکاڵای نامە

● عبدالله طاهر عمر ●
1982

ئازیزەکەم چی بنووسم بۆت ، کەمن جەرگم هەموو زامە مەرامی دڵ تەواونابێ ، بە نووسینی هەزار نامە لەدڵ بۆ گوڵ ، لە گوڵ بۆ دڵ ، ووشەی ڕازاوە .. هۆنراوە بەپامی بەرزی «ڤێنۆسە» نهێنی سەوزی هێناوە بەلام سەد نامەیی ناسك کە نووسرابێ لە پەڕەی گوڵ بەیەك چرپەی ئەوین نابێ بۆ دەربڕینی هەستی دڵ سەرەنجی هێمنی چاوێ کەوا پڕبێ لە سۆزی پاك بە هەڵبەست تەرجەمەی ووردی بەیان‌نادا ئەدیبی چاك



ایوب احمد امین
ئاداری / 1983

[خەمت نەبێ ، هەموو شتێـك زۆر بەچـاکی دەبێو بە ئاسانی دێتەوە دەست .. هەرچۆن موویێك لە ماست دەرکەیت رزگارت دەبێو ئاسوودە دەبی ، هەوری چلکن لەبـەر چاوت ئـەرەوێتـەوەو . سپـی دەبێـت .. سپـی ، بـرۆ ئـاوریش مەدەرەوە ، تێگەیشتی .. ؟]

ئەم چەند ووشەو رستەیەی بە دڵنیاییەکەوەو لەخۆ رازی بوونەوە پێی ووت ، ئینجـا دەرگای لەسـەر داخستو چووە کۆشکەوە ، ئەویش قۆپچەی چاکەتەکەی داخستو ملی ڕێگای گرتەبەر ، تارمایی‌یەکەی لەبەر تاریکی سێبەری نەبوو .

«زۆر چاکە .. وا دیارە باوەڕی پێم پەیا کردووە .. ؟ ! کەواتە تێکۆشان‌و خـزمەتم بـەفیڕۆ نـەچووە .. هـا .. منێك شایستەی ئەم کارە نەبم ، بێگومان ئەرك ناخاتە سەرشانم .. کەواتە سەریشمی تیا چێ .. ها .. ئەبێ جێبەجێی .. بـ ... نە .. بکەم .»

شەوێ بوو لە شەوانی بەهاری شارەکە ، کاتژمـێر لە دوانـزەی شەو هـەندێـك لایدابـوو . پاش ئـەوەی کۆڵانێکی سەرانسەر بڕی ، گەیشتە سەر شـەقامـەکە ، ڕوانی چـەند ئـۆتۆمـۆبیلێـك بەقـورسی دیواری شـەوی شەقـامەکـەیان دەبڕی ، ئەستێرەکان دەیانجریواندو بەخەستیش دیـاربوون بێ دەنگی‌یێکی سامناك شارەکەی داگرتبوو ، وەڕینی چـەند سەگێك لەیەك دوو شوێنەوە دەهات «وەکوو بڵێی لەتـرسانا یەکدی بانگ بکەن‌و دڵی یەکدی بدەنـەوە سامنـاکی‌یەکـەی پەخشندەتـر دەکردو هێـزێکی تری دەخستـە بەر جـەستەی سـرووشتەوە ، لەلایـەکی ترەوە دەنگی بـۆقەکـە ئـاوازێکی ئەمربوو دەهاتەوە گوێ‌و بە کپی لەناخیدا دەنگی دەدایەوە .

- هەموو کەسێ نرخی سەربەستی نازانێ ، هەر لەم جۆرە شەوانەش دەتوانێ زۆر شت دەست نیشان بکا .

وەکو ئەوەی یەکەمجارە خۆی بەم شێوەیـە ببینێ .. ؟ هەستی دەکرد کە هەنگاوێك دەنێ چەند ساڵێکی پێ دەچێ .. بەم حاڵە شەقامەکەی بڕی‌و چەنـد ماڵ‌و کـۆڵانێکیشی بەجێ هێشت . لەپڕ نزیـك شوێنێ مـەبـەست زریکـەی منـداڵێـك رایچلەکاندو لەجێی خـۆی ووشك بـووەوە ، گڕی دڵی بـووە بارانە گریان لە قووڵایی دەریای چاوەکانیـەوە یاقـووت ئاسـا نیشتەوە .

«کـۆچـەر ، ئـەی کچی شیـرینم .. تـۆ ئـومێـدی پێ نەگرتووی ، گیانی منی .. جێت ناهێڵم .. جێت ناهێڵم .» .

کە هەنگـاوی نا : هـەنگاوەکـانی ئامـێر ئاسـا شێوەی ڕەقی‌ی وەرگرت : وەکو بڵێی دەقی لەسەر ئاوازێکی تایبەتی گرتبێ تا دەهات خێراترو ڕەقتر دەبوو .. !

گەیشتە بـەر دەرگای مـاڵەکەوە ، سـەیرێکی ئـەم لاو ئەولای کرد هەر بە هەمان ئاوازەوە دەستی بۆ گیرفانی درێژ کرد کلیلێکی لە گیرفـانی دەرهێناو خستیـە ناو کیلۆنـەکەوەو چـرك .. چـرك .. بـەلای ڕاستـدا بـایـدا ، پـاڵی پێـوەنـا ، کردی‌یەوە ، ئینجا بە هێمنی دایخستەوە .

لەناو هۆڵەکـە لە ڕاستی لای دەرگای ژووری چـەپەوە راوەستا .. دەرگاکـەی کردەوە بینی ، ڕووناکی‌یـەکی کـز ژوورەکەی پڕ کردۆتەوە ناوبراویش لەسەر قەرەوێلەیێك لەسەر لای چەپی بەرانبـەر دەرگاکـەوە نووستـووە ، بە هـوشیاری قیچێك لێی نزیك بووەوە ، تۆزێکی‌تر چووە پێشەوە بینی :

«زەردەخەنەیێك» .. کە ئازارێکی قوول .. قـوول .. بە ئارەزووی خۆی نەخشەیێکی بریقەداری لە دووتوێ لێوەکانی کێشاوەومیهری عشقێکی یەکجار گەورەیە .. لە سوارێك ئەچێ ئەسپەکەی لە مەیدانا بەزیبێ .. ڕەنجی ساڵەهای ساڵی بەفیڕۆ چووبێ ، دڵنیاشە لەوەی ئەسپێکی‌تر وەکو هی خۆی هەرگیز نابینێتەوە ، تازە دادیشی نادا ، بۆیە سەرگەردان بووەو گاڵتەی بە خۆشیا دێتەوە ، هاتەوە خۆی‌و هەموو مێژووی ژیـانی لەو ساتەدا لەسەر لێوە بزرکاوەکانی کۆبووەوە بەدەست نـووسی پەنجەکـانی ماچ بـارانی کردوو بـە شلی‌یـەوە گەڕانـەوە ناو باخەڵی ..

● چیرۆك ●

ئەورەحمان عەلی

زانکۆی صلاح الدین ـ کولێژی ئەدەبیات

# کە گوڵی خۆزگەکان دەپلیشێنەوە

شەوێ کات درەنگانێ ناڵەی شاعیر لەسەر جێگا ساردو سڕەکەی دەستی لەژێر چەناگەی نابوو ، بیرکردنەوەی لەبازنەیەکی فراوان دەسوڕایەوە ، جگەرە لەسەر جگەرەی لێ دادەگیرساندو دەکوژاندەوەو لەناو ئەو قودیلە شووشە شێوە ماسییەی کۆمەڵێکی جگەرەی دی لەخۆ گرتبوو دادەنرا ، دووکەڵەکەی تێکەڵ بەهەوای قەتیس ماوی ژوورەکە دەبوو ..

ژوورەکە نووزەی هەوای دەرێی لێبڕابوو ، لەوساتەشدا فتیلەی فانۆسە هەڵواسراوەکەی تەنیشت وێنەی خەجێی خێزانی جوانەمەرگەکەی نەوتی لێبڕاو ژوورەکە بوو بەشەوە زەنگێکی تەواو .

چلەی ماتەمینی خەجێ هێشتا تێنەپەڕیبوو بیری لە نوێکردنەوەی گۆڕەکەی دەکرد ، دەیویست هەتا هەتایە گۆڕەکەی لەگەڵ زەویدا نەبێ بەتۆپەڵێك گڵ ، دەیویست هەروەك ئەستێرەیەکی درەوشەدار بێت بەئاسمانی گۆڕستانەوەو دەم نادەم بەسەری بکاتەوەو سەبوری حاڵی خۆی پێبداتەوە «چواردەوری بەگوڵی زەردو سوورو گژوگیای کەسك ڕازاندبۆوە ، ئەو گژوگیا کەسکانەی ساڵێکی پێکەوە بوون سەرگەردانی بوو بوون ، بەتایبەتی خەجێ لەکوێ چڵە گیایەکی بەرچاو کەوتایە باڵای بەرزو نەرمو نیانی بەسەردا شۆڕ دەکردەوەو لەناو هەردوو لەپی دەستی دەناو ماچی دەکرد ، دەوراو دەوری گۆڕەکەی بەو شعیرانە پڕ کردبۆوە کە کاتی خۆی بۆخەجێی ووتبوو ، ئیلهامی لەچاوە گەشو ژێر پیاڵە بیەکانی وەرگرتبوو ، بەهۆی ئەم شیعرانەیەوە بوو هەرچی خزمو ناسیاوی هەبوو گازاندەیان لێدەکردو دەیانووت :

– چیە کەس ژنی نەمردووە ناڵە نەبێ ؟

ئەوەتا سەر لەبەری ماڵەکەی لێ هاتوتەیەك ، دڵ پەرۆش غەمگینە ڕۆژانی بەشینو گریان بەسەر دەبات ، چەپۆکانیوا بەبان ڕووە شینەوە بووەکانیەتی ..

ڕۆژانی تەنیایی دێتو دەڕوا ، دەڕواو دەبڕێتەوە ناڵەش کەس نیە بەدەم دەردو فوغانیەوە بێت ، کەس نیە لەناو دەریای قوڵی خەمە گەورەکەی پیلی ڕابکێشێ ، کاتژمێری شادی شکاوە بەندوڵ کەوتۆتە دەست مرۆڤی پیسو چەپەڵ دڵیان لەگەڵ لەرە لەری ئەم بەندوڵانە دەترپێنێ ، زۆر کەسیان لەوێنەی ناڵە ماتو مەلوول کرد ، دەستەوستان ، دەس لەئەژنۆ ، دانیشتن بێ گفتوگۆ ، دڵ پڕ لەسۆ ، ... هاوار بۆخەجێ دەکا :

– ئەی هاوار لەم کۆچە بێگەڕانەوەیەت ، بۆ ، بۆ لێم دوور کەوتیەوە کێ وایپێ باشو خۆشە ؟ ! داخ لەدەست ئەم کەشتیە بێ ئەمانە «جوانو ناشرین ، لاوو پیر ، زاناو نەزان ، شەلو کوێر» ناپرسێ هێزی خۆی دەگێڕێو ڕێگاڵە بەرە ، خۆزگە سەد خۆزگە ئێستا لە ژیاندا بوویتایەو نەمردیتایە ئەگەر بۆچەند ساتێکیش دەبوو بۆئەوەی چاوت بەخزمو کەسانم دەکەوت کەچۆن دوورە پەرێزن لێمو خۆم تێناگەیەنن و ئاشنایەتییان لەگەڵمدا پچڕاندووە ، بەڵام ئاخ ئەوا ئەوان بەم شێوە مردە بۆخیانە ئەی ڕۆژگار بۆ ؟ بۆبەم

ڕۆژە گەرمایە سێبەری لەخۆ بڕیوەو بێ پەنایە بێ پەنا ؟ ...
ئەلقەرێزی دەرگای بیرەوەری ڕۆژانی قۆناغی خوێندنی سەرەتایی شکاندو بەبیریاهات کەچۆن زۆربەی قوتابیەکان ئارەزووی وانەی هونەریان دەکردو سەروەری وانەکەیان بەوێنەی جۆوراو جۆر نەخشاندن بەسەر دەبردو مامۆستاش بۆ هەریەکەیان بەخامەکەی سەرو دەنمرەی بۆ دادەنان ، بەلام ئەی نادری داماو ؟ زۆری لەگەڵ دەکرا تاوێنەی ڕوخساری مرۆڤێك نیگار بکا ئەنجام ڕووپەڕەکەی بەسپیایی دەمایەوە ، خامەکەی لەناو زاری وەر دەداو دۆش دادەما ،ناچار دەبوو بەمل شۆڕ کردن‌و سێ سفری پانەو بانی‌یەك ..

بەلام ئەی ئێستا ؟ بۆبێ ئەوەی کەس داوای وێنەیەکی لێ بکا بووە بە وێنەکێشێکی دەست ڕەنگینی وا کە زۆربەی وێنەکێشەکانی دی دەبەزێنێ‌و ناتوانن خۆیان لەقەرەی بدەن ؟ بەهەموو شێوەیەك ، بە هەموو ڕێگەیەك ، وێنەی خەجێی کێشاوەو ژوورەکەی کردووە بەپێشانگایەکی تایبەتی .

* * *

پرسەدارەکان هەموو پێنج شەمموانێ نزیك نوێژی عەسر خۆیان لە جلوبەرگی ڕەش هەڵدەکێشن‌و ڕێگەی گۆڕستان دەگرنەبەر ، پاش ئەوەی لەخوێندنی فاتیحەکەیان دەبنەوەو نابنەوە هەر ئافرەتەو تۆزێك بەرەو دوا خۆی دەجولێنێت‌و چوار مشقی ماوەیەکی کورتی کپ‌و بێ‌دەنگی بەدەور گۆڕی مردووەکەیان دادەنیشن‌و دەست دەکەن بەباس‌و خواسی هەموو ئەوشتانەی لەو حەوتووەدا ڕوویداوە . بەلام ئەو نالەیەی بە ناوبردنی خێزانەکەی دەناسرایەوە «نالەی خەجێ» باس‌و خواسی نەبوو ، لەگەڵ ئەو وێنەیەی لە ژوور سەریەوە هەڵیواسیبوو دەکەوتە دوان :

- ئەی فریشتەکەم ، ئەی ئەوکەسەی تاکوئێستا لەهەست‌و نەستی منداڵی :

دەلایەکم لێ بکەرەوە بائەو گوڵەی لەباخچەی ژینم بۆم هەڵبژاردبووی لەیەخەتی گیرکەم ،داخەکەم لەودەستەی هەروا زوو هاویشتیە ناو وەرزی خەزان‌و پەردەی شانۆی دەرونتی بەبێ ماڵئاوایی لێکردن لەسەرم لێکنا ، کوپلەی دووەمی شانۆ پڕ لەدەردو مەینەتی‌و ناسۆرییەکەی ئەم ژینەی بۆ جێهێشتم لەگۆشەی تەنیاییدا لا تی کردم ..

پاش ئەوەی گۆڕستانەکە چۆڵ بوو جانەوەری خوای تێدا نەما لە نالەی بەچۆکا هاتوو نەبێ دەنگێکی ناسك لەناو دەروونی نالە دەنگی‌دایەوە :

- نا نادر نا ، بۆ وات لەخۆت کردووە ؟ هات‌و هاوارو گریان داوی چی‌دەدا ؟ من مردووم بەلام ئەوە ڕۆژانی پێکەوە بوونمان ، ئەوە نوسین‌و پەرتووکەکانمان ، ئەوە شێوەی دانیشتنەکانمان هەموو ماون‌و لەبەر دەمتان ، ئەوکاتە دەگەینە پۆپەی خۆشەویستی خۆت بەرامبەر بە من کەوا ڕەفتارەکانت تێکەڵ بەڕەفتارەکانم بکەیت تاقە شێوازێکی ڕەفتاری نەپچراوی لێ‌پێك بهێنیت‌و بیکەی بەڕێ پیشاندەر بەدەم ئەو مەبەستەی بۆی تێ‌دەکۆشاین ، ئەوکاتەی هەموو خەڵکی چاویان بەوڕۆژە دەکەوێ کەتێیدا مرۆڤێکی لێهاتوو بالانگژی ئەو جانەوەرانە بوتەوە کەدەیانەوێ سەر نوختەی هەرمێرگەو زارێکی ئەم وولاتە شرینە بەتابلۆی شین‌و شەپۆروگریان بنەخشێنن ، گۆزەی بیر لەناوی سازگاری دەستی پڕبازنگی کچانی ئێسك سووکی ئەم وولاتە دەشکێنن ، دەست بەقژی خاویانەوە بەمەمکۆڵەی زیتەلانیانەوە بۆ گۆڕستانەکان ڕاکێشیان دەکەن‌و ڕیسوایان دەکەن ، پاشان دەبینی چۆن‌خەڵکی هەر چاوێکیان دەکەن بەچوار چاوو لێت نزیك دەبنەوەو هەموو لەڕاستت سەریان سوور دەمێنی‌و بەیەك دەنگ دەڵێن :

- ئەوە نالەی خەجێ‌یە ، نالەی خەجێ .

من ئەو ڕۆژەم دەوێ نەك ڕۆژانی پڕ لە گریان‌و شین‌و ڕۆڕۆی بێ سوودو بەرهەم»

لەگەڵ ساف‌و ڕەوانی سەدای دەنگەکە هێدی هێدی کز دەبووەوە تابەیەکجاری نەما .

ترسێکی زۆر دەروونی نالەی تەنی ، چۆکی بەپەلەو بەبەردەوامی دەلەرزی نە یزانی ئەوڕۆژە چۆن خۆی لەژوورە خامۆشەکەیدا بینیەوە ، ئێوارە هەرزوو خۆی لەبن جێگانا ، تاسبەینێ جوولەی لەخۆی بڕی ..

* * *

# ساڵێکی تریش لەگەڵ چالاکی یەکانی ئەمینداریێتیی گشتیی ڕۆشنبیری و لاوانی ناوچەی کوردستاندا

● عزیز رەشید حەریری ●

● « 50553/354 » دینار بۆ یارمەتی دانی نووسەرانی کوردو بەچاپ گەیاندنی بەرهەمەکانیان ..

● چاپکردنی « شەش » کتێبو یارمەتی دانی « 22 » بەرهەمی تازەی نووسەرانی کورد لە ساڵێکدا ...

ئەمساڵیش ئەمینداریێتی گشتی ی ڕۆشنبیری و لاوانی ناوچەی کوردستان ، وەك ساڵی پار ، هەمدیسان دەورێکی بالای بینی لە بواری ئەنجامدانی نەخشەیەکی بەرفراوانی خزمەتگوزاری ئەدەبیو ڕۆشنبیری لە ناوچەی کوردستاندا ، ئەم ئەمینداریێتی یە سەرەرای گرینگی دانی بە کاروباری لاوانو گورجو گوڵی وەرزشکاری و یارمەتی دانی دەزگا رۆشنبیری یەکانی هەرسێ پارێزگەی هەولێرو سلێمانی و دهۆك .. ئەمساڵیش توانی کۆمەڵێکی چاك کتێبو چاپکراوی کوردی هەمەجۆر بخاتە بەردەست خوێنەرانی کوردو وەکوو دیاری یەکی بەنرخ پێشکەشیانی بکات ..

لە کاتێکدا کە سەرجەمی چاپکراوەکانی ئەم ئەمینداریێتی یە ساڵی پار گەیشتە « 22 » چاپکراو ، بە یارمەتی دراوی چاپکراوەوە ، دەبینین لە ساڵی « 1983 » دا ئەو ژمارەیە قەبارەکەی گەورەتر دەبێتو ئەو سنوورە دەشکێنێتو هەنگاوێکی فراوانتر بەرەو پێشەوە دەهاوێژێتو دەورێکی




دیارتری دەبێت لە بوژاندنەوەی ڕەوتی ڕوشنبیری کوردیو بارێکی لەبارتر بۆ خوێنەرو نووسەری کورد دەرەخسێ ؛ جا چ ئەوانەی کە بەرهەمەکانیان چاپکراوەو یارمەتی دراوە ، وەچ ئەوانەی خوێنەرنو چاوەڕوانی بەرهەمی تازەی نووسەران دەکەنو بە پەرۆشەوە بەرەوپیری هەموو بڵاوکراوەیەکی تازەی کوردی دەچنو دەیانەوێ جۆشو خرۆشی دڵی خۆیانیانی پێ بشکێنن ..

ئەمینداریێتی گشتی ڕۆشنبیریو لاوان وەك دەزگایەکی ڕۆشنبیری ناوچەی کوردستانی خاوەنی خود موختاری ، لەگەڵ ئەوەشدا کە بارێکی نائاسایی لەووڵاتدا هەبووە ، بەڵام لەڕێگەی هەوڵو تەقەلای لێپرسراوانی توانیوویەتی چاکی مەردایەتی لێبکا بەلاداو بەگەرمی ڕووبکاتە مەیدانی خزمەتگوزاریو ، نووسەرو خوێنەرانی کورد لەبیر نەکاو ، ئەوەبوو لە ماوەی ساڵێکدا واتە ساڵی « 1983 » توانی یارمەتی « 22 » نووسەرو ڕۆشنبیری کورد بداو « 6 » کتێبیش لەسەر کیسەی خۆی بەچاپ بگەیەنێو بیانخاتە بەردەستی خوێنەران ، لەوانە سێ دیوانی شیعرو دوو کۆمەڵە چیرۆكو نامیلکەیەکی فۆلکلۆری .... بەهەقیقەت ئەم کۆششو ئەرکە پیرۆزەی ئەمینداریێتی ڕۆشنبیریو لاوان مایەی دڵخۆشییەو ئاواتێکی مەزنی لێچاوەڕوان دەکرێ بۆ زیاتر گەشەپێدانی ئەدەبو ڕۆشنبیری کوردیمان ..

**ئەو بەرهەمانەی یارمەتی دراون :**

ئەو بەرهەمانەی کە ئەمینداریێتی گشتیی ڕۆشنبیریو لاوان لە ماوەی ساڵی 1983 دا یارمەتی نووسەرەکانیانی داوەو هەر لەو ساڵەدا کەوتوونەتە نێو کتێبخانەی کوردییەوە ئەمانەن :

**● شیعر ●**

1 — گۆرانی کۆچەری کوێستان          شیعری عبدالله عباس .
2 — لە ئەلبومی یادگارا          = جەمال شارباژێڕی .
3 — سلافەك بۆ دەلالێ          = خالد حسین .
4 — جوانی          = کامیل ژیر .
5 — ڕۆژان ئەڕواو تۆ هەر خۆشەویستی منی          = فەرەیدوون عەبدول بەرزنجی .
6 — ئازارو ئەوین          شیعری ڕازی .
7 — دیوانی ڕەنجووری          شیعری مەلا عومەری زەنگنە لێکۆڵینەوەی : محمد علی قەرەداغی .
8 — ڕەهێڵە          شیعری کمال فرج تۆفیق .
9 — فەرهەنگی هەڵبەست          شیعری ئەحمەد ڕەشوانیو کۆکردنەوەی لطیف برزنجی
10 — بەهەشتی منداڵ          شیعری صبریة نوری قادر « دایکی سۆلاف »
11 — باخچەی مندالان          = ڕۆستەم باجەلان

**● سروودو گۆرانی :**

12 — ئەڤین : ئامادەکردنی ـ صباح محمد امین .

**● بەرهەمی هەمەجۆر :**

13 — پەندی بەراوردکاری          کەریم شارەزا .
14 — سورمەخان          طارق محمد سعید جامباز .
15 — کاریتە یا ئەودیوی چیا          شکور مصطفی عبدالله .
16 — مێژوو          د . کەمال مەزهەر .
17 — دەنگی دەروون          شیخ محمد بالیسانی .
18 — فەرهەنگی زانیاری          کەمال جەلال غەریب .
19 — منداڵ          جەلال خەلەف

**● چیرۆك ●**

20 — ئەڤ چیرۆکە بدویماهی نەهات          ئەنوەر محەمەد طاهر .
21 — تەنیایی          شیزراد حسن .

**بەرهەمی عەرەبی : ـ**

22 — ما أسداه الاكراد الى المكتبة الكردية          مصطفى نريمان

**بەرهەمی چاپکراو : ـ**

لەتەك ئەو بەرهەمە یارمەتی دراوانەی کە لە پێشەوە پەنجەمان بۆیان کێشا ، ئەمینداریێتی گشتیی ڕۆشنبیریو

لاوان هەر لە ساڵی 1983 دا چەند چاپەمەنی‌یەکی تری کوردی خستە سەر خەرمانەی کتێبی کوردی ئەویش بە لەچاپدانی شەش بەرهەمی هەمەجۆر وەکو شیعرو گۆرانی‌و چیرۆك‌و کەلەپوری کوردی ، ئەوەی شایانی باسە ئەم شەش کتێبە ئەمینداریتی لە کیسەی خۆی چاپی کردوون ، کە ئەمەیش ناوەکانیانن :

● گوڵی سەربەستی — طاهر توفیق
● چەپکێك لە شیعرەکانی سامی عەوداڵ — شیعری سامی عەوداڵ
● بەیتی ئایشە گوڵ — ئامادەکردنی ئەسعەد عەدۆ
● دیوانی نووری — ئامادەکردنی‌و پێشەکی سەردار میران .
● گەلەگورگ — حسین عارف .
● مزگێنی — محمد سلیم سواری ..

ئەو بەرهەمانەی کە لە پێشەوە دەستنیشانمان کردن تەواوی ڕەنجی ساڵێکی ئەمینداریتی گشتی‌ی ڕۆشنبیری‌و لاوانی ناوچەی کوردستانە ، هەوڵی پڕ کۆشش‌و تەقەلای ئەو لێپرسراوانەیە کە بەردەوام بەتەنگ خزمەت کردنی ئەدەب‌و ڕۆشنبیری‌ی کوردی‌یەوە بوون‌و هەوڵی بەرەوپێش چوونی زیاتری بۆ دەدەن‌و لە ساڵانی رابردوو سورترن بۆ ئەنجامدانی چەپکێکی تری بەسوودو بە کەڵك لە کتێب‌و چاپەمەنی کوردی لەهەموو بوارەکانی ئەدەب‌و ڕۆشنبیری کوردی‌و ، دەوڵەمەند کردنی کتێبخانەی نەتەوەکەمان بە نووسین‌و بەرهەمی نووسەرە خامە ڕەنگینەکانمان ، وە بۆ ئەوەی زیاتر لەبارەی ئەو کتێبانە بزانین کە ناوەکانیانمان خستنە ڕوو ، وا پوختەیەکی زۆر کورتی هەریەکێ لەو کتێبانە دەنووسینەوەو دەیخەینە بەرچاوی ئێوەی خوێنەرە ئازیزەکانمان ، بۆ ئەوەی وەکوو تۆمارێکی زیندوو بکەوێتە نێو کتێبخانەی کوردی‌یەوەو ئەویش لەبواری تایبەتی خۆیدا خزمەتێك بنوێنی‌و ، نووسەرو ئەدیب‌و ڕۆشنبیرانیشمان سوودێکی لێ وەربگرن ..

● بەشی یەکەم : بەرهەمە یارمەتی دراوەکان ●

● گۆرانی کۆچەری کوێستان ●

ئەم بەرهەمە کۆمەڵە شیعرێکی برای ڕۆژنامەنووس‌و شاعیر کاکە ( عبدالله عباس ) ە ، کتێبەکە بریتی‌یە لە « 54 » لاپەڕەو بە قەبارەی [ 20 × 14,5 سم ] ە‌و لە چاپخانەی « علاء » لە بەغدا چاپکراوەو نرخی « 300 » فلسەو پازدە شیعری جۆراو جۆری گرتۆتە خۆ‌و لەگەڵ شیعرەکانیشدا چەند تابلۆیەکی بڵاوکردۆتەوە ، ئەوەی شایانی باسە پێشەکی دیوانەکە بە پێنووسی مامۆستای دوکتور « عزالدین مصطفی رسول » ە‌و تابلۆکانیش هونەرمەندان وسام مرقس‌و فیصل عثمان کێشاویانەو شیعرەکانی پێ‌ڕازێندراونەتەوە ، برای هونەرمەندیش عبدالقادر علی مەردان سەرپەرشتی هونەری‌ی کردووەو لە کتێبخانەی نیشتمانی بەغداش ژمارە « 504 » ی ساڵی 1983 ی دراوەتێ ..

● لە ئەلبومی یادگارا ●

دیوانێکی شیعری‌ی شاعیری ناسراو کاکە جەمال شارباژێری‌یە ، دیوانەکە بریتی‌یە لە 176 لاپەڕەوە بە قەبارەی [ 19,5 × 14,5 سم ] ە لە چاپخانەی سەرکەوتن لە سلێمانی چاپکراوەو نرخی « 850 » فلسەو بریتی‌یە لە « 51 » پارچە شیعری هەمەجۆرو لە جیاتی پێشەکی ئەم پێشکەشیەی نووسیوەتەوە کە دەڵێ :

**« پێشکەشە بە ئەدیبان‌و هونەرمەندان‌و ڕوناکبیرانی وڵاتەکەم .. بە شاعیرە لاوەکان ، کە هەمیشە ڕێزم گرتوون . بە خۆشەویستی ڕاستگۆیی جگەرسۆزی وەفاداری بێ‌وەیی بەزەیی لە هەرمرۆڤێکابێ . بە شیعر دۆستە خۆشەویستەکانم کە دەمێکە لە بێ‌دەنگیم پرسیار ئەکەن‌و چاوەڕوانن . »**

لە ئەلبومی یادگارا ، بەشی پێنجەمی هۆنراوەی کاك جەمال شارباژێری‌یەو هونەرمەندی ناسراو کاك « اسماعیل خیاط » نیگاری بەرگەکەی کێشاوەو لە کتێبخانەی نیشتمانی ژمارە « 657 » ی ساڵی 1983 ی دراوەتێ‌و دوا لاپەڕەکەیشی تەرخان کردووە بۆ ناوبردنی بەرهەمە چاپکراوەکانی‌و ئەوانەی ئامادەن بۆ چاپ ..

● سلاڤەك بۆ دەلالێ ●



بەرهەمێکی تازەی شیعرەکانی کاک « خالد حسین » ی شاعیرە ، ئەم دیوانەی شاعیر « 184 » لاپەڕەیەو قەبارەکەی [ 19,5 × 13,5 سم ] ە « 37 » شیعری تیادا کۆکردۆتەوەو بە شێوەی کرمانجی ژووروو نووسراونەتەوەو لە چاپخانەی « اشبيلية الحديثة » لە بەغدا چاپکراوەو نرخەکەیشی « 500 » فلسەو لە کتێبخانەی نیشتمانی بەغدا ژمارە « 546 » ی ساڵی 1983 ی دراوەتێ ..

**● جوانی ●**

جوانی ؛ یا جوانیی ئافرەت کۆمەڵە شیعرێکی مامۆستای نووسەرو شاعیر « کامیل ژیر » ەو لە بەرگێکی قەشەنگدا خۆی دەنوێنێ و بریتی یە لە پێناسەیەکی شاعیرو پێشەکی یەکی کورت کە لە چەند دێڕێکیدا دەڵێ :

« ئەم هۆنراوانە خەیاڵ پڵاو نیە ، وشەی داتاشراو نیە ، وێنەو تابلۆو نیگارە . هەستی ڕاستی هەستیارە . دیارییەکی بە پارسەنگ گرانە . بەنرخ هەرزانە . ئەم هۆنراوانە فێنکایی و گڕن . پێشکەشە بە ئێوە : ئەی کوڕوکاڵان ، پەری ڕوخساران ، ڕێزی لێ بگرن . . »

ئەم دیوانەی شاعیر « 96 » لاپەڕەیە کە قەبارەکەی [ 16,5 × 11,5 سم ] ەو ، « 36 » شیعری تیادا بڵاوکراوەتەوە سێ هەزار دانەی لێ چاپکراوەو نرخەکەیشی « 600 » فلسە ، شاعیر دوا لاپەڕەی دیوانەکەی تەرخان کردووە بۆ ئەو بەرهەمانەی کە تا ئێستا بڵاوی کردوونەتەوەو ئەوانەی کە چاوەڕوانی لە چاپدانیان دەکرێ ، کاک کامیل لە لاپەرە سێ ی دیوانەکەیدا دەڵێ :

**نیگای چاوو زەردەخەنەو هەناسەی دەمی دولبەرێ**
**بەسە بۆ دڵی دڵخوازێ هەزار دەردو خەم لابەرێ**

ئەوەی شایانی باسە « جوانی » ؛ هونەرمەند یاسین عبدالرحمن نیگاری بەرگەکەی کێشاوەو لە چاپخانەی سەرکەوتن لە سلێمانی چاپکراوەو لە نامەخانەی نیشتمانی بەغدادا ژمارە « 859 » ی ساڵی « 1983 » ی دراوەتێ ..

**● ڕۆژان ئەڕواو تۆ هەر خۆشەویستی منی ●**

فەرەیدوون عەبدول بەرزنجی ، دەنگێکی تازەی شیعری کوردی یە ، شیعرەکانی پڕن لە تام و چێژی خۆشەویستی و پاکی و دڵسۆزی و وەفاداری ، ئەم بەرهەمەی کاکە فەرەیدوون بریتی یە لە کۆمەڵە شیعرێکی نێوان ساڵانی [ 1977 — 1982 ] ئەگەرچی هەموو شیعرەکانی ئەو پێنج ساڵە ناگرنە خۆ ـ هەروەك شاعیر خۆی لە پێشەکی یەکەیدا پەنجەی بۆ ڕاکێشاوە ـ .

ڕۆژان ئەڕواو تۆ هەر خۆشەویستی منی ؛ دیوانێکی قەبارە بچووکی « 64 » لاپەڕەیی [ 16,5 × 12 سم ] ەو بیست پارچە شیعری تیا کۆکراوەتەوەو لە چاپخانەی نەورەس لە سلێمانی چاپکراوەو نرخەکەیشی [ 400 ] فلسە ، بە ژمارە [ 852 ] ی ساڵی 1983 سپێردراوە بە نامەخانەی گشتی لە بەغدا ، ئەوەی شایانی باسە کاکی هونەرمەند « حیکمت هیندی » نەخشەی بەرگەکەی بۆ کێشاوەو برای شاعیرو نووسەریش « جەمال غەمبار » بە دەستنووسی خۆی و بە خەتێکی جوان بەرگەکەی نووسیوەتەوە .. ئەم بەرهەمەی شاعیر دووەمین بەرهەمە ، دوای نیگای حەزێکی ئاوارە کە لە ساڵی 1977 دا بە چاپی گەیاندووە ..

**● ئازارو ئەوین ●**

بەشێکە لە دیوانی ڕازی و بریتی یە لە کۆمەڵە شیعرێك ، دیوانەکە « 196 » لاپەڕەی بەتاڵەو لە چاپخانەی نەورەس لە سلێمانی چاپکراوە .. قەبارەکەی [ 23,5 × 16,5 سم ] ەو نرخەکەی « 1,250 » فلسە ..

شاعیر لە بەشێکی پێشەکی یەکەیدا دەڵێ :

« حەزم لە هاوڕێ یەتی هۆنراوە هەیە ، لەگەڵیان ئەژیم ، بەڵام هۆنراوەیەك زیندوبێت و ئاسۆی داهێنانی پێوە دیار بێ .... زۆربەی زۆری کۆمەڵ لێی تێ بگا ، خۆی ببەستێتەوە بە ئاواتە پرشنگ دارەکانیەوە ، دەنگ دانەوەو ڕەنگ دانەوەیەك بێ بۆ پێشکەوتن »

هەروەها دان بەوەدا دەنێ کە لە شیعرەکانی دا هەردوو ڕێبازی « کلاسیکی » و « ڕۆمانتیکی » پەیڕەو کردووە .. شاعیر جگە لەم بەرهەمەی ، بەرهەمی چاپکراوی تریشی هەیە کە ئەمانەن ..

- ● دیوانی « وەڵی دیوانە » کە لە شێوەی هەورامی یەوە گۆڕیوی یە تیە سەر شێوەی سۆرانی .
- ● چوارینەکانی « بابا طاهر » یش لە شێوەی لوڕی یەوە گۆڕیوە بۆ شێوەی سۆرانی ..

بەڵێنی ئەوەش دەدا کە لە خزمەتکردنی ئەدەب و کەلەپووری کوردیدا بەردەوام بێت

ئازارو ئەوینی ، ڕازی شاعیر بە ژمارەی « 1065 » ی ساڵی 1983 بە نامەخانەی نیشتمانی بەغدا سپێردراوە ..

**● دیوانی ڕەنجووری ●**

ماوەیەکی دوورو درێژە مامۆستای ئازیزمان محەمەد عەلی قەرەداغی ڕووی کردوتە مەیدانی خزمەتکردنی ئەدەبو ڕۆشنبیری کوردی ، پەیتا پەیتا خامە ڕەنگینەکەی بەرهەمو نووسینی تازەو نایاب ئەنجام دەداو کتێبخانەی کوردی دەوڵەمەندتر دەکاتو تامەزرۆی خوێنەرانی کوردیش دەشکێنێ ، بۆ سەلماندنی ئەو قسانەی دەیڵێین دیوانی ڕەنجووری نموونەیەکی تری بەڵگە نەویستە بۆ کۆششو خزمەتگوزاری مامۆستا قەرەداغی ..

دیوانی ڕەنجووری کۆمەڵە شیعرێکی هێجگار جوانو بەپێزی « مەلا عومەری زەنگەنە » یەو مامۆستای قەرەداغی لێی کۆلیوەتەوەو پێشەکییەکی ووردو دوورو درێژی لەبارەی ڕەنجووریو ساڵی لەدایک بوونیو کۆچکردنیو بابەتی شیعرەکانیو پەیوەندی لەگەڵ شاعیرە هاوچەرخەکانی خۆیداو پلەی شاعیرییەتی شاعیر نووسیوەتەوەو لە زوربەی ڕاکانی نێو لێکۆڵینەوەکەیشیدا پشتی بە ڕای نووسەرو شارەزایان بەستووە .

ئەم دیوانە بریتییە لە « 260 » لاپەرەی قەبارە بەتاڵی [ 23,5 × 16,5 سم ] دەوە لە چاپخانەی « آفاق عربية » لە بەغدا چاپکراوەو لە نامەخانەی نیشتمانی بەغدا ژمارەی « 1074 » ی ساڵی 1983 ی دراوەتێ ..

**ڕەهێڵە ●**

ڕەهێڵەش دیوانێکی تازەی شیعری کوردییە بەرهەمی ئەوبەرەی کاک « كمال فرج توفيق » ەو لە « 128 » لاپەرەدا خۆی دەنوێنێو « 18 » پارچە شیعری هەمەجۆری تیادا کۆکراوەتەوە لە چاپخانەی زانکۆی سەلاحەددیندا چاپکراوەو لە نامەخانەی نیشتمانی بەغدادا ژمارە [ 1020 ] ی ساڵی 1983 ی دراوەتێ ؛ ئەوەی شایانی باسە وێنەی بەرگی ڕەهێڵە هونەرمەند اسماعيل خياط کێشاویەتی :

لە لاپەرە « 125 » دا شاعیر بەم جۆرە خۆی بە خوێنەران دەناسێنێ :

« لە 23 ی نیسانی ساڵی 1949 دا لە گەرەکی سابونکەران لە شاری سلێمانی پێی ناوەتە دنیای ژانو خەمو ئەشکەنجەوە ، لە ساڵی 1954 — 1955 خراوەتە قوتابخانەی « فەیسەلیە » ی سەرەتایی کوڕان لە سلێمانیو تا پۆلی سێ هەمی ناوەندی خوێندووەو پاشان لە ساڵی 1968 دا دەستی لە خوێندن هەڵگرتووەو کەوتوتە سۆراخی تاڵیو کوێرەوەری ژیانەوە ..

● لە ساڵی 1973 وە خولیای ژانی شیعر چوتە جەستەی خەمو زامەکانییەوە » .

دیوانی ڕەهێڵە کۆمەڵێ شیعری ناسکو جوانو بەپێزی گرتوتەخۆو لە دوو تویی بەرگێکی خنجیلانەدا کەوتوتە نێو کتێبخانەی کوردییەوە ..

**● فەرهەنگی هەڵبەست ●**

ڕەنجی چەند ساڵەی شاعیری جوانەمەرگ « ئەحمەد ڕەشوانی » یە ، کەشکۆڵێکی هەمە ڕەنگی دیرو کۆپلە شیعری شاعیرانی کوردە ، بەرهەمی کۆکراوەی پەنجەو خامە ڕەنگینەکەی کاکی ڕەشوانییەو لەپاش مەرگیدا بەچاپ گەیەنراوە ..

ئەم ئەرکو ماندووبوونەی ڕەشوانی هەر زوو خۆی لەدەست هەڵگرتنو پێچانەوەی نێو کتێبخانەو دەلاقەی کوردەوارییەوە رزگار کردووەو دیدەی خوێنەرانو دۆستانی ئەدەبو ڕۆشنبیری کوردی پێ ڕوون بوتەوە ؛ چاپی یەکەمی فەرهەنگی هەڵبەست لە ساڵی 1968 دا لە چاپخانەی ئەسعەد لە بەغدا چاپکراوەو کەوتوتە نێو کتێبخانەی کوردییەوە ..

لە ساڵی 1983 دا دووبارە فەرهەنگی هەڵبەست هاتوتەوە پێشەوەو ئەمجارەیان بە بەرگێکی قەشەنگو بە کاغەزو دەرهێنانێکی هونەری نایابەوە چاپکراوەتەوە .. ئەوەی زیاتر سەرنجی خوێنەر ڕادەکێشێ ئەوەیە کە ئەمجارەیان زۆربەی تابلۆکانی نێو دیوانەکە تازە کراونەتەوەو زیاتر مەبەستەکە دەپێکن ، هەروەها پێشەکییەکی خنجیلانەی لە لایەن لطیف بەرزنجی شاعیرو هاوڕێی جوانەمەرگ بۆ نووسراوەتەوە جگە لەو چەند لاپەرەیەی کە خراونەتە سەری لە چاپی دووەمدا .

ئەوەی شایانی باسە چاپی یەکەمو دووەمی فەرهەنگی هەڵبەست لەتیف بەرزنجی ئامادەی کردووەو مشوورو ئەرکی لەچاپدانی گرتوتە ئەستۆی خۆیەوەو بە پێشەکیو وردە سەرنجەکانی خۆی دیوانەکەی ڕازاندوتەوە .. ئەوەتا لە سەرەتای چاپی دووەمدا دەڵێ « لەسەر داواو داخوازی




کۆمەڵێك لە شاعیرانی ژیرو جگەرسۆزو نووسەرانی رۆشنبیرو شیعر دۆستان و زۆر لاوانی نیشتمان پەروەر وا بۆ جاری دووەم ـ فەرهەنگی هەڵبەست ـ چاپکرایەوە ، کە بەرهەمێکی بەنرخی شاعیری جوانەمەرگ و کوردپەروەر کاك ـ ئەحمەد رەشوانی ـ یە » .

فەرهەنگی هەڵبەست بریتی یە لە « 200 » لاپەرەی قەبارە بەتاڵی « 23,5 × 16 سم »و لە چاپخانەی « دار آفاق عربية » لەبەغدا چاپکراوەو نرخی دینارو نیوێکە ، لە نامەخانەی نیشتمانی بەغداش ژمارەی 1279 ی ساڵی 1983 ی دراوەتێ ..

● **بەهەشتی منداڵ** ●

نامیلکەیەکی بەهاداری شیعری منداڵانە ، خوشکی شاعیر صبرية نوری قادر ـ دایکی سوڵاف ـ وەکو دیاری یەکی خنجیلانە پێشکەشی منداڵانی کوردی کردووە ، دایکی سوڵاف لە سەرەتای پێشەکی یەکەیدا دەڵێ :

« جگەر گۆشەکانم : ئەو چەند شیعرەی لەبەر دەستتاندایە بە سووکە ئاوڕدانەوەیەکی دڵسۆزانەی دادەنێم لە جیهانە پاك و بەفرین و وەنەوشەییەکەی ئێوە ، کە بریتی یە لە بەرهەمی هەشت ـ نۆ ساڵەی خەریکبوونم لەگەڵ ئەدەبیاتی منداڵاندا . » .

بەهەشتی منداڵان ، بریتی یە لە کۆمەڵە شیعرێکی بەپێزی منداڵان و بە تابلۆی پڕمانا رازێنراونەتەوە ، 56 لاپەرەی قەبارە بەتاڵی « 23,5 × 17 سم » و نرخی 400 فلسەو لە چاپخانەی زانکۆی سەلاحەددین چاپکراوە ، لە کتێبخانەی نیشتمانی لە بەغدا ژمارەی 1231 ی ساڵی 1983 ی دراوەتێ ، بەهەشتی منداڵان بەری رەنجی خوشکی شاعیر دایکی سوڵافەو دەچێتە سەر خەرمانەی شیعرو ئەدەبیاتی کوردیمان و جیهانە بەرین و بەربڵاوەکەی پڕ لە خۆشەویستی و پاکی و دڵسۆزی منداڵانی کوردی پێ دەرازێتەوەو دەوڵەمەند دەبێ ..

● **باخچەی منداڵان** ●

نامیلکەی یەکی تری شیعری منداڵانە ! بەرهەمێکی تری کاك رۆستەم باجەلانی شاعیرە ، ئەم نامیکەیە بریتی یە لە کۆمەڵە شیعرێك و لە « 84 » لاپەرەدا کۆکراوەتەوە ، قەبارەکەی « 16 × 11 سم » و لە چاپخانەی « الحوادث » لە بەغدا چاپکراوە ..

وێنەی بەرگی باخچەی منداڵان کاکی هونەرمەند « کەریم دیار » کردوویەتی .. ئەم بەرهەمەی باجەلان نرخەکەی « 300 » فلسەو لە کتێبخانەی نیشتمانی لە بەغدا ژمارە « 1299 » ی ساڵی 1983 ی دراوەتێ ..

ئەوەی شایانی باسە شاعیر بەر لەم بەرهەمەی تاکو ئێستا حەوت بەرهەمی تریشی بەچاپ گەیاندووە کە ئەمانەن :

- ● ژان و دڵداری ـ ساڵی 1977
- ● شاعیرێکی تینوو لە پەراوی بیرەوەریدا ـ ساڵی 1978
- ● سوڵین ـ ساڵی 1980 .
- ● دڵدارەکەم لە شارێکی ترە ـ ساڵی 1980 .
- ● دەریا ـ ساڵی 1981 .
- ● لە پێناوی تۆدا دەژیم ـ ساڵی 1982 .
- ● نیشتمانی منال و رەشەبا ـ ساڵی 1982 .

● **هونەرو مۆسیقا** :

لە بواری هونەرو مۆسیقاشدا ئەم ئەمینداریتی یە توانی یارمەتی برایەکی هونەرمەندی کورد بدا بۆ ئەوەی نامیلکەیەکی رازاوەی سروودو نۆتەی مۆسیقا بکاتە دیاری و پێشکەش بە نەوەی تازەی بکات ، ئەم هەوڵەی برای هونەرمەند کاك صباح محمد امین مایەی خۆشحاڵی و رێز لێنانە ئەمەیش پوختەیەکی بەرهەمەکەیەتی ..

● **ئەڤین** ●

نامیلکەیەکی هونەری جوان و خنجیلانەیە ، « 28 » لاپەرەی نیو بەتاڵەو قەبارەکەی [ 19,5 × 16 سم ] ەو « 11 » سروودو گۆرانی ی منداڵانی تێدا نووسراوەتەوە لەگەڵ نۆتەکانیاندا ، زۆربەی ئەو سروودانە شیعری مامۆستای ئازیز « ع . ع . شەنم » ن ، هەروەها چەند شیعرێکی مامۆستا فائق بێکەس و عمر عبدالرحیم و فریدون علی امین و کاکەی فەللاحیشی تیا کۆکراوەتەوە ، کاکە « صباح » لە پێشەکی نامیلکەکەیدا دەڵێ :

**« منالانی خۆشەویست :**

**خۆم بە بەختەوەر ئەزانم ئەم گۆرانی و سروودانە بکەمە چەپکە گوڵێك و پێشکەشی نەوەی منداڵانی کوردی بکەم .. ئەم ئاوازانە هونراوەی چەند شاعیرێکی دڵسۆزن کەوا پڕن لە پەندو ئامۆژگاری و بابەتی پەروەردە ، وام بە باش زانی کە ئاوازیان بۆ دابنێم وەبیان رازێنمەوەو پێشکەشی نەوەی ئازیزی بکەم .**

**هیوادارم بە پێی توانا خزمەتێکی بچکۆلانەی منداڵانی**

کوردم کردبێ کەوا زۆربەیان پەرۆشی ئاوازو گۆرانیو مۆسیقان . » .

لاپەڕەی پێنجەمی « ئەڤین » بریتی‌یە لە کورتەیەکی ژیانی دانەرو لاپەڕەی کۆتایش دوو سوپاسنامەی تیادا بلاوکراوەتەوە بۆ مامۆستایان » ولیم یوحنا » و « اسماعیل خیاط » لەبری پێداچوونەوەو نەخشاندنی بەرگی نامیلکەکە ..

ئەم بەرهەمەی کاك « صباح » ی هونەرمەند لە چاپخانەی سەرکەوتن لە سلێمانی چاپکراوەو نرخی 250 فلسە ، لە کتێبخانەی نیشتمانی بەغداش ژمارە 643 سالی 1983 ی دراوەتێ ..

ئەوەی شایانی باسە « ئەڤین » جوانترین دیاریی ئەڤینداری‌یە لە سالی 1983 دا پێشکەش بە مندالانی کورد کراوەو هیوادارین بەرهەمی داهاتووی کاکە « صباح » دەولەمەندترو ڕازاوەتر بێتو زووتر بکەوێتە کتێبخانەی کوردی‌یەوە ∴

● بەرهەمی هەمەجۆر ●

● پەندی بەراوردکاری ●

وەکو ئاشکرایە خامە ڕەنگینەکەی مامۆستای خۆشەویستمان « کەریم شارەزا » بەردەوام نووسینو لێکۆڵینەوەو بەرهەمی بەپێزو تێرو تەسەل پێشکەش بە کتێبخانەی کوردی دەکات ، ئەمە جگە لەو نووسینو لێکۆڵینەوانەی کە لە گۆڤارو ڕۆژنامەکاندا بلاویان دەکاتەوەو تیشکی لێهاتوویی‌و شارەزایی خۆی‌یانی دەخاتە سەر ئەو لایەنە بزرو شاراوانەی کە ئیمڕۆ خوێنەری کورد بە پەرۆشەوە حەز بە زانینیان دەکەن ... بۆ سەلماندنی ئەم قسەیەیشمان دەلێین ئەوەتا وا مامۆستا شارەزا ئەمسالیش بەرهەمێکی تری خستە سەر خەرمانەی ئەدەبو ڕۆشنبیری‌ی کوردی کە ئەویش کتێبی : « پەندی بەراوردکاری » یە لەنێوان ئینگلیزی‌و عارەبی‌و کوردی‌دا .. ئەم کتێبە کە مامۆستا شارەزا ئامادەی کردووەو لێی کۆلیوەتەوە « 148 » لاپەڕەی قەبارە بەتالی « 24 × 17 سم » ەو کۆمەلێکی چاکی لە پەندی کوردی‌و ئینیگلیزی‌و عارەبی تێدایە کە مامۆستا لە ئەنجامی هەولو کۆششێکی زۆرەوە توانیویەتی لە ڕووی لێکچوونو یەك مەعنایی‌دا لێیان بکۆلێتەوەو لەگەل یەکتری بەراوردیان بکا ، لەم کارەیشیدا سوودی لە شارەزایی مامۆستا « مەجید ئاسنگەر » وەرگرتووە لەبارەی پەندە ئینگلیزی‌یەکانو بەراوردکردنیان لەگەل بەشە کوردی‌و عەرەبی‌یەکەیدا ، مامۆستا کەریم لەچەند دێرێکی پێشەکی کتێبەکەدا دەلێ :

« خوێندەواری بەڕێز .. ئەدەبی فۆلکلۆری لەناو گەلاندا دەریاییێکی تا بلێی قوولو فراوانە ، تا پتر بە ناخیدا بچینە خوارەوە مرواری‌و گەوهەری زۆرترو بەهادارترمان دێتە دەستو گەنجینەی ئەو ئەدەبە فۆلکلۆری‌یەی پێ دەولەمەندتر دەکەین » .

هەر دوا بە دوای ئەم پێشەکی‌یە مامۆستا شارەزا بە دوورو درێژی لە هەندێ لایەنی پەند دەکۆلێتەوە ، وەك : « پەندی پێشینانو خاسیەتەکانی ، پەندی بەراوردکاری ، پەندی بەراوردکاری لە نێوانی ئینگلیزی‌و عارەبی‌و کوردی‌دا » ؛ ئینجا فەرهەنگی پەندەکان دەخاتە ڕووو لە دارشتنیاندا پەیرەوی تیپی لاتینی کردووەو لە تیپی « A » دەست پێ‌دەکاو بە تیپی « Z » کۆتایی پێ‌دێنێت ، لە کۆتایی کتێبەکەشدا چەند لاپەڕەیەکی بۆدوا ووتەو نووسینەوەی ناوی سەرچاوەکان تەرخان کردووە .

ئەوەی شایانی باسە بۆ ئامادەکردنی ئەم کتێبە سوود لە « 18 » سەرچاوەی کوردی‌و سێ سەرچاوەی بێگانە بە زمانی عارەبی‌و « 11 » سەرچاوە بە زمانی عارەبی‌و سێ سەرچاوەی ئینگلیزی وەرگیراوە ، کە ئەمەیش ئەرکێکی گرانو قورسە کەوتۆتە سەر شانی مامۆستا شارەزا ، ئەم کتێبە لە چاپخانەی « سمیر امیس » لە بەغدا چاپکراوەو نرخی 600 فلسەو بە ژمارە « 626 » ی سالی 1983 سپێردراوە بە کتێبخانەی نیشتمانی لە بەغدا ، مامۆستا « سامی عزیز رسول » یش سەرپەرشتی لەچاپدانی کردووە .. تەمەنێکی درێژ بۆ مامۆستا شارەزا دەخوازین لە پێناوی خزمەتکردنی ئەدەبو ڕۆشنبیری‌ی میللەتەکەمانو!

● محەمەدو سیوێو سورمێخانو قورشیدێ چلو بەخار ●

گومان لەوەدا نی‌یە کە مێژووی نەتەوەکەمان سەدەها چیرۆکی فۆلکلۆری‌و داستانی عیشقو خۆشەویستی تۆمار کردووە ، زۆر لەو چیرۆكو داستانانە گەردی زەمانەیانە لێنیشتووەو کەوتوونەتە ژێر باری قورسی لەبیرچوونەوە ، لە ڕۆژگاری ڕابردوودا بەدەگمەن کەسانێکی وا هەلکەوتوون ڕوو



لەو مەیدانە بکەن و چاکی مەردایەتی لێبکەن بەلاداو ئەو کەلەپوورە مەزن و پیرۆزە لەمردن رزگار بکەن ، ئەگەر بەشێکی ئەم سامانەیش بۆ ئیمرۆ مابێتەوە ئەوە هەر دیسان زەمانە کاری تێکردووەو جۆرەها گۆڕانی بەسەردا هاتووە ، لەبەر ئەوەی چاکترین ئەرشیف و تۆماری ئەم جۆرە بابەتانەی باسمان کردن لاوك و حەیران و گێڕانەوەی دەم ئاگردانی زستانەی کوردەواری بووە ، ئیتر هەر کەسەو شتێکی خستوتە سەرو هەر زەلامەو بەشێکی لێ کەم کردوتەوەو لێی لابردووە ، جا بۆ ئەوەی ئەو بەرهەمە پیرۆزەی میللەت و نەتەوەکەمان هەر بە زیندوویی بمێنێتەوە کاکی نووسەر « طارق جمباز » زیرەکانە رووی لەو مەیدانە بەربلاوە کردووەو دوو تراژیدیای فۆلکلۆری کوردی هەلبژاردووەو لە دووتوێی بەرگی کتێبێکی قەشەنگدا پێشکەشی خوێنەرانی کردووە .. « کتێبی محەمەدو سیوێ و سورمێ خان و قورشیدێ چاو بەخار » دیاری یەکی بە نرخی ئەو برا ئازیزەمانە .

ئەم کتێبە « 114 » لاپەرەی قەبارە نیو بەتالی « 17 × 12 سم » ەو لە چاپخانەی « أسعد » لە بەغدا چاپکراوە ، کاك « طارق » بۆ ئامادە کردنی ئەم کتێبەی سوودی لە کاسێتە تۆمارکراوەکانی « حسن سیساوەیی » وەرگرتووەو دەقاو دەق خستوویەتی یە سەر کاغەزو لە لاپەرەکانی دواییشدا فەرهەنگۆکێکی بۆ ووشە گرانەکان کردووە .

ئەم بەرهەمەی کاك طارق کە مامۆستا « سامی عەزیز رسول » سەرپەرشتی لە چاپدانی کردووە ، لە کتێبخانەی نیشتمانی لە بەغا ژمارەی « 734 » ی سالی 1983 ی دراوەتێ و ئێستا لە کتێبخانەکانی کوردستاندا شوێنێکی دیاری دراوەتێ و خەرمانەی کەلەپووری کوردیمانی دەولەمەندتر کردووە .

**● میژوو ●**

کتێبی میژوو بەرهەمێکی نایابی دیکەی مامۆستاو دوکتۆری شارەزاو پسپۆری میژوو ، دوکتۆر کەمال مەزهەر ئەحمەدە ، ئەم کتێبەی ئەمجارەی دوکتۆر بابەتێکی تابلێی بەنرخە لە بواری زانستی میژوو لە لایەك ، وە میژووی کورد لە لایەکی دیکەوە ، رەنجی چەند سالەی پر لە ئەرك و ماندووبوونی مامۆستایەکە کە هەرگیز لە مەیدانی خزمەتکردنی گەل و نەتەوەکەیدا سلی نەکردوتەوە بەلکو بە گیانێکی لەخۆ بوردووانە کەوتوتە پشکنینی دونیای فراوانی میژووو لێکۆلینەوەی بابەخدارو پر لە سوودی لەم بارەیەوە ئەنجام داوە ، کتێبی میژوویش نموونەیەکی تری نووسینە بابەخدارەکانی مامۆستا کەمال مەزهەرە ، بۆزیدە شارەزابوون لە بارەی میژووەوە وا قسەکانی دوکتۆر خۆی لێرەدا دەنووسینەوە کە دەلێ :

« دەمێکە پێوەم بەرهەمێکی سەربەخۆ دەربارەی میژوو پێشکەش بە خوێندەواری کورد بکەم ، لەبەر ئەوە چەند سالێکە هەر زانیاری یەکی بەکەلکم بەردەست کەوتبێ ، یا هەر تاقی کردنەوەیەکی تایبەتیی خۆمم لا پەسند بووبێ یەکسەر تۆمارم کردوون و وا لێرەدا پوختەیان پێشکەش ئەکەم . » .

کتێبی میژوو بریتی یە لە « 384 » لاپەرەی قەبارە بەتالی « 23,5 × 16,5 سم » ەو ، بۆ سێ بەشی سەرەکی دابەش کراوە ، بەشی یەکەم : « چەند تێبینی یەك دەربارەی میژوو » ، بەشی دووەم : « میژووی میژوو » ، بەشی سێیەم : « کوردو میژوو » .. وە هەر بەشێك لەم بەشانە چەند لقێکی لێ جیا بوتەوەو بە وردی لێی کۆلراوەتەوە ، ئەمە جگە لە سەرئەنجام و کورتەی بیبلیۆگرافیای میژوو نووسیی کوردی و پێرستی ناوەکان ..

میژوو پێشکەشکراوە بە « یادی پیرۆزی شەرەفخانی بیدلیسی و مەلا مەحموودی بایەزیدی و موحەممەد ئەمین زەکی » . ئەم بەرهەمەی دوکتۆر لە چاپخانەی « دار آفاق عربیة » لە بەغدا چاپکراوەو نرخەکەی دینارو نیوێکە ، لە کتێبخانەی نیشتمانی بەغداش ژمارە « 843 » ی سالی 1983 ی دراوەتێ .. ئێمە لەکاتێکدا پیرۆزبایی لە دوکتۆر کەمال دەکەین بۆ ئەو بەرهەمە نایاب و بە پێزەی هیوادارین خامە رەنگینەکەی هەمیشە لە برەودابێ بۆ خزمەتکردنی گەل و نەتەوەکەمان ..

**● کاریتە یا ئەو دیوی چیا ●**

**مامۆستای ئازیزو خۆشەویست « شکور مستەفا » هەر لە زووەوە وای راهێناوین کە پەیتا پەیتا کەشتێك بەنێو ئەدەب و رۆشنبیری و کەلەپووری هەندەراندا بکات و لە ئەنجامدا بە زمانە کوردی یە پاك و پاراوەکەی خۆی دیاری یەکی وەرگێردراوی بەتام و چێژو بەکەلکی ئەوتۆمان پێشکەش بکات . کە کارە پیرۆزەکەی هەمیشە مایەی شانازی و لەبیر نەچوونەوە بێت ، وا ئەمجارەیش بەختەوەرانە لەگەل چاپکراوێکی تری مامۆستا شکور مستەفادا ئاشنا دەبین و دەچینەوە دونیای**

نووسەرێکی پایەبەرزو بەتوانا کە زەمانەو گەلێ کێشەو دەردی سەری وایان لێکردووە نەتوانێ بەزمانە شیرینەکەی خۆی بنووسێ‌و بدوێ ، ئەو نووسەرەیش ڕۆمان نووسی ناسراو « یەشار کەمال » ی کوردە ..

کاریتە .. یا ئەو دیوی چیا بەشی یەکەمی سێینەی ڕۆمان نووسی ناوبراوەو ساڵی 1960 بە زمانی تورکی بڵاوبۆتەوە ، ئەوەتا نووسەر خۆی لە بەرایی ئەو سێینەیەدا دەڵێ :

« سێینەی : کاریتە ، زەوی‌و ئاسن‌و ئاسمان‌و مس ، گیای نەمرانم ، خوارو ژوور ، بە پازدە ساڵان پێ تەواو کرا ، کاریتە ، کە یەکەم کتێبی ئەم زنجیرەیەیە ، بۆ یەکەم جار بە کتێبی لە 1960 دا بڵاوکرایەوە ، هەرچی زەوی‌و ئاسن‌و ئاسمان‌و مسە ، دووەم کتێبی ئەم زنجیرەیە ، لە 1967 دا دەرچوو . سێیەمیشیان کە گیای نەمرانە ، لە 1968 دا بڵاوکرایەوە .

ئەم سێینەیە چیرۆکی مرۆگەلێکە ، لەبارو دۆخێکی زۆر نالەبارو سەختدا ، لە ژیاندا بە هەزار کولەمەرگی‌و مەینەتی بەرێوە دەچن‌و ژیانی مرۆ لەوەی ، کە لەم چیرۆکەدا باس کراوە ، گەلێ نالەبارترو پڕ کوێرەوەری تر بووە . » .

مامۆستا شکور دوای ئەوەی ، بەرایی کاریتە دەخاتە ڕوو ، ئینجا دەقی ڕۆمانەکەمان بۆ دەگوێزێتە سەر زمانی کوردی‌و لە لاپەرە « 419 » ی کتێبەکەدا کۆتایی پێ دەهێنێت . پاشان قامووسچەیەکی بۆ ئەو ووشە گرانانە داناوە کە لەنێو وەرگێڕانەکەدا بەرچاو دەکەون‌و کورتەیەکی ژیانی « یەشار کەمال » ی لە لاپەرە « 429 » دا نووسیوەتەوە ، وە لە بەرگی دواوەی کاریتەیشدا دەقی چەند قسەیەکی ئەو ڕۆمان نووسە ناسراوەی بڵاوکردۆتەوە لەگەڵ ڕەسمێکی‌دا ، بەرگی یەکەمیشی لەیەکێ لە چاپەکانی تێکستە تورکی‌یەکە وەرگرتووە « هەروەك وەرگێڕ خۆی لەدوا لاپەرەدا پەنجەی بۆ کێشاوە » ، برای هونەرمەند « عبدالقادر علي مردان » یش ڕەنگی هەردوو بەرگەکەی ڕشتووە ..

کاریتە « 432 » لاپەرەی قەبارە بەتاڵی « 24 17 سم » ەو لە چاپخانەی « علاء » لە بەغدادا چاپکراوەو نرخەکەیشی دوو دینارو ڕوبعێکە لە کتێبخانەی نیشتمانی‌ی بەغدادا ژمارە « 1118 » ی ساڵی 1983 ی دراوەتێ ، ئەوەی شایانی باسە ، کاریتە بەشی یەکەمی ئەو زنجیرەیەیە کە یەشار کەمال نووسیویەتی ، هیوادارین مامۆستا شکور مستەفا لە بەشەکانی تریدا بێ‌بەشمان نەکات‌و لە دەرفەتێکی نزیکدا ئەوانەی تریش بەچاپ بگەیەنێ‌و بڵاویان بکاتەوە ..

● **دەنگی دەروون** ●

کتێبێکی ئایینی بەنرخەو ، مامۆستا « محمد شیخ طه بالیسانی دایناوە ، ئەم کتێبە بریتی‌یە لە « چەند دەرسێك لە تەفسیری سورەتی نون ، کە بە سورەتی قەڵەم ناو ئەبرێت » .

دەنگی دەروون « 176 » لاپەرەی قەبارە بەتاڵی « 23,5 × 16,5 سم » ەو ، لە چاپخانەی « آفاق عربية » لە بەغدادا چاپکراوەو نرخەکەیشی دینارو ڕوبعێکە ، لە کتێبخانەی نیشتمانی ژمارە « 918 » ی ساڵی 1983 ی دراوەتێ ..

ئەوەی شایانی باسە مامۆستا محمد بالیسانی دوو بەرهەمی تری کوردی هەیە کە ئەمانەن :

● **ڕۆڵە پەروەری .**

● **چرای ڕووناکی .**

هەروەها « 5 » بەرهەمی تری کوردی ئامادەکراوی هەیە کە هێشتا چاپ نەکراوون ، وە بە زمانی عەرەبیش بەرهەمێکی چاپکراوی هەیە کە بەم ناونیشانەیە :

● **كيف تحج وكيف تعتمر .**

هەروەها نۆ بەرهەمی تریشی هەیە کە ئامادەن بۆ چاپ‌و هەر بە زمانی عەرەبی ..

گومان لەوەدا نی‌یە کە مامۆستا محمد شیخ طه بالیسانی دەورێکی باڵای هەیە لە بواری خزمەتگوزاری‌ی ئایینی‌داو ، دەیەوێ لەم ڕێگەیەوە سوودێکی چاك بە گەل‌و نەتەوەکەی بگەیەنێت ..

● **فەرهەنگی زانیاری** ●

وەکو ئاشکرایە مامۆستا کەمال جەلال غەریب دەمێکە ئەرکێکی مەزنی گرتۆتە ئەستۆ لە پێناوی خزمەتکردن‌و دەوڵەمەندکردنی ڕۆشنبیری‌ی کوردی ، لە ڕێگەی دانانی فەرهەنگی زانیاری‌یەوە ، کە تائێستا سێ بەرگی لێ بەچاپ گەیاندووە ، بەرگی یەکەمی لە ساڵی 1974 دا لە چاپخانەی کامەرانی لە سلەیمانی‌و بە 438 لاپەرەی قەبارە بەتاڵ چاپی کردووە ، وە بەرگی دووەمی ساڵی 1979 لە لایەن کۆڕی زانیاری کوردەوە بە 400 لاپەرە چاپکراوە ، هەروەها بەرگی یەکەمی فەرهەنگی زانیاری وێنەدار ، کە عەرەبی‌و ئینگلیزی‌و کوردی‌یە




لە ساڵی 1975 دا بە یارمەتی دەزگای هاوکاری چاپ و بڵاوکردنەوەی کوردی لە چاپخانەی « الاجیال » لە بەغدادا لەچاپدراوە ..

هەروەها مامۆستا کەمال پێنج بەرهەمی تری بڵاوکراوەی بە زمانی کوردی و عەرەبی یەوە هەیە کە لە نێوان ساڵانی 1968 ەوە تا 1974 بەچاپ گەیەنراون ، ئەمە جگە لە بەشەکانی تری فەرهەنگی زانیاری کە لە بەرگی چوارەمەوە تاوەکو بەرگی دوانزەهەم ئامادەی کردوون بۆ چاپ ، وە کتێبێکی تری بەناوی « زانیاری زەوی ـ جیۆلۆجی » یەوە گەڵاڵە کردووە بۆ چاپ ، لەتەک ئەم بەرهەمە چاپکراوو چاپ نەکراوانەیشیدا ، مامۆستا کەمال پەیتا پەیتا لە گۆڤارو ڕۆژنامەکاندا بەرهەمی پڕ تام و چێژی زانیاری پێشکەش بە خوێنەری کورد دەکات ..

فەرهەنگی زانیاری ـ بەرگی سێیەم « 384 » لاپەڕەی قەبارە بەتاڵی « 23,5 × 17 سم » ەو ، لە چاپخانەی « المیناء » لە بەغدادا چاپکراوە ، کاکە سامی عزیز رسول سەرپەرشتی لەچاپدانی کردووەو لە کتێبخانەی نیشتمانی بەغداش ژمارە « 1014 » ی ساڵی 1983 ی دراوەتێ و نرخی دوو دینارو نیوەو بەرگی فەرهەنگی زانیاری بە پێنووسە ڕەنگینەکەی هونەرمەند جەمال عەبدوول محەمەد کێشراوە ..

هیوادارین مامۆستای ئازیزمان لە دەرفەتێکی تردا بەرگی چوارەم و بەرگەکانی تریشمان وەکو دیاری یەکی بەکەڵک و نایاب پێشکەش بکات و نموونەی ئەو بەرهەمە زانیاری یانەیشی هەر زۆر بێت ..

● منداڵ لە قۆناغی دوا منداڵی و هەرزەکاریدا ●

ئەم کتێبەیش لەو کۆمەڵە کتێبەیە کە ئەمیندارێتی گشتی ی ڕۆشنبیری و لاوان یارمەتی داوەو ئێستا وا لەبەر دەست خوێنەرانی کوردەو کەوتۆتە کتێبخانەکانی کوردستان ، ئەم کتێبەی مامۆستا « جەلال خەلەف ژالەیی » بابەتێکی بەنرخی دەروون زانی یە باسی ناسکترین و گرنگترین تەمەنی منداڵ دەکات کە ئەویش لە تەمەنی نێوان »» 6 — 20 « ساڵی یە ، هەروەك دانەر خۆی لە پێشەکی یەکەیدا پەنجەی بۆ ڕاکێشاوە .

ئەم کتێبە 144 لاپەڕەی قەبارە بەتاڵی « 23,5 × 16,5 سم » ەو نزیکەی 34 بابەتی جۆراو جۆری لە بارەی دەروون زانی ی منداڵەوە تیایدا شیکراوەتەوەو لەسەری نووسراوەو ، لە چاپخانەی « حسام » لەبەغدا بەچاپ گەیەنراوەو نرخەکەیشی یەك دینارە ، لە کتێبخانەی نیشتمانی بەغداش ژمارە « 1218 » ی ساڵی 1983 ی دراوەتێ .

ئەوەی شایانی باسە مامۆستا جەلال بۆ دانانی ئەم کتێبەی سوودی لە « 37 » سەرچاوەی هەمەجۆر وەرگرتووەو ، وەکو دیاری یەکی بە نرخ پێشکەشی منداڵانی کوردی کردووە ..

وێنەی بەرگی ئەم کتێبە بە خامە ڕەنگینەکەی هونەرمەند جەمال عەبدوول کێشراوەو ، مامۆستای ئازیز کاکە « سامی عزیز ڕەسول » سەرپەرشتی لەچاپدانی کردووە ..

## ● چیرۆك

لە بواری چیرۆك نووسیشدا ساڵی ڕابردوو دوو برای چیرۆك نووس دوو بەرهەمی خۆیان بە یارمەتی ئەم ئەمیندارێتی یە بەچاپ گەیاندو دوو چەپکە گوڵی تریان خستە سەر خەرمانەی چیرۆکی کوردیمان ، ئەو دوو برایەش سەیدا « أنور محمد طاهر » و کاك « شیرزاد حسن » ی چیرۆکنووس بوون .. ئەمەی خوارەوەیش کورتەیەکی هەر یەکێ لەم دوو بەرهەمەیە ..

● ئەڤ چیرۆکە بدویماهی نەهات ●

ئەم بەرهەمەی سەیدا « أنور محمد طاهر » بریتی یە لە حەوت چیرۆك ، کە لە ساڵانی « 1977 » ەوە تاوەکو 1981 نووسراونەتەوە ، درێژترین و بەپێزترینیان ئەو چیرۆکەیە کە ناونیشانەکەی هەڵبژاردووەو کردوویە تی یە سەر قافڵەچی ئەم کۆمەڵە چیرۆکەی ، کە ئێمڕۆ وا لەبەر دەستی خوێنەرانی کوردایەو ، بەرگی یەکەمی ئەم بەرهەمەی خۆی پێ ڕازاندوتەوە .

ئەو حەوت چیرۆکەی کاك انور کە لەنێو دوو بەرگی کتێبێکدا یەکیان گرتۆتەوە ، لە « 58 » لاپەڕەی قەبارە ناوەنجی « 21 × 14 سم » خۆیان دەنوێنن ، کە لە چاپخانەی « الحوادث » ی بەغدا چاپکراوەو نرخەکەیشی « 400 » فلسە ..

سەیدا أنور محمد طاهر لە لاپەڕە « 54 و 55 » ی کۆمەڵە چیرۆکەیدا فەرهەنگۆکێکی خنجیلانەی بۆ ئەو ووشە گرانانە کردووە کە لەنێو دەقی چیرۆکەکانیدا دەری بڕیوون .

مامۆستای هێژاو خۆشەویستیش « صبري بوتاني » سەرپەرشتی لەچاپدانی کردووەو لە کتێبخانەی نیشتمانی لە

بەغدا ژمارە « 658 » ی سالی 1983 ی دراوەتێ ..

● تەنیایی ●

ئەم کۆمەلە چیرۆکەیش بەرهەمێکی تری نایاب و بەپێزی کاکی چیرۆکنووس و برای ئازیزمان « شیرزاد حسن » ەو هەر لە سالی 1983 دا کەوتۆتە نێو کتێبخانەی کوردی یەوەو دیدەی ئەدیب و رۆشنبیرو ئەدەب دۆستانی کوردی پێ گەشاوەتەوە .

تەنیایی بریتی یە لە « نۆ » چیرۆکی جیا جیا کە لە نێوان سالانی « 1976 و 1980 » دا نووسراونەتەوەو بەشێکیشیان لە رۆژنامەو گۆڤارە کوردی یەکاندا بلاوبوونەتەوە هەروەك چیرۆکنووس لە پەراوێزی چیرۆکەکاندا پەنجەی بۆ کێشاوە .. چیرۆکەکان لە « 128 » لاپەرەی قەبارە بەتالی « 24 × 16,5 سم » دا کۆکراونەتەوەو ، لە چاپخانەی « المؤسسة العراقية للدعاية والطباعة » لە بەغدادا چاپکراوەو نرخەکەیشی « 500 » فلسە ..

تەنیایی لە کتێبخانەی نیشتمانی بەغدا ژمارە « 1073 » ی سالی « 1983 » ی دراوەتێ ..

## بەرهەمی چاپکراو بە زمانی عەرەبی

● مأاسداه الاكراد الى المكتبة العربية ●

ئەم چاپکراوەیش بەرهەمێکی بەنرخی مامۆستا نەریمانەو بە زمانی عەرەبی نووسیویەتی یەوە ، مامۆستا نەریمان لەم بەرهەمەیدا باسی ئەو کتێب و نووسینانە دەکات کە نووسەرە کوردەکان بە زمانی عەرەبی لەبارەی ئایین و ئەدەب و زانیاری و رۆشنبیریی گشتی ی و جوگرافیاوە نووسیویانەتەوەو دایاننا وەو کتێبخانەی عەرەبی و ئیسلامی یان پێ دەولەمەند کردووە ..

ئەم بیلیۆگرافیایەی مامۆستا نەریمان « 112 » لاپەرەی قەبارە بەتالی « 23,5 × 17 سم » ەو ، لە چاپخانەی « حسام » لە بەغدادا چاپکراوەو نرخی « 650 » فلسە ؛ مامۆستا « سامی عزیز رسول » سەرپەرشتی لەچاپدانی کردووەو لە کتێبخانەی نیشتمانی بەغداش ژمارە « 1311 » ی سالی « 1983 » ی دراوەتێ ..

مامۆستا نەریمان بیلیۆگرافیاکەی کردۆتە شەش بەش کە ئەمانەن :

بەشی یەکەم : زانیاری یە گشتی یەکان و فەلسەفە .
بەشی دووەم : ئایینەکان .
بەشی سێیەم : زانستی یە کۆمەلایەتیەکان .
بەشی چوارەم : زمان و زانستی یەکان .
بەشی پێنجەم : ئەدەب .
بەشی شەشەم : جوگرافیاو مێژووو ناوداران .

جگە لەم شەش بەشەی سەرەوەیش ، مامۆستا نەریمان پێشەکی یەکی چوار لاپەرەیی و پێرستێکی بۆ دانەرەکان و پەراوێزی خستۆتە نێو بیلیۆگرافیاکە .

هیواداریین مامۆستا نەریمان بەردەوام بێت لەسەر ئەو رێبازەی پەیرەوی دەکات لە بواری نووسینەوەی بیلیۆگرافیا وە بەتایبەتی ئەو بەرهەم و نووسینانەی لە گۆڤارو رۆژنامە کوردی یەکاندا بلاو دەکرێنەوەو ئەو کتێب و بەرهەمە کوردی یانەی رۆژ لە دوای رۆژ دەکەونە کتێبخانەی کوردی یەوە ، تاوەکو نووسەرو ئەدیب و رۆشنبیرانی کورد لێی بێبەش نەبن و سوودی لێ وەربگرن و ببنە سەرچاوەیەکی هەمیشە زیندوو بۆ باس و نووسینەکانیان ..

**برای خوێنەری ئازیز :**

ئەو کتێب و بەرهەمانەی لەپێشەوە باسمان کردن و هەریەکەی پوختەیەکی زۆر کورتیمان خستە روو ، ئەو چاپکراوانەن کە لە سالی رابردوودا ، واتە سالی 1983 لە لایەن ئەمینداریتی گشتی ی رۆشنبیری و لاوانی ناوچەی کوردستانەوە کەوتنە بازارو بریتی بوون لە « 22 » کتێبی هەمەجۆری ئەدەبی و رۆشنبیری ی کە ئەرشیفی کتێبخانەی کوردییان دەولەمەندتر کردوو پێ ی رازێندرایەوە ..

ئێستایش دێینە سەر باسکردنی ئەو کتێب و چاپکراوانەی کە هەر لە هەمان سالدا ئەمینداریتی لەسەر کیسەی خۆی چاپی کردوون کە ئەمانەن :

## ● بەرهەمی چاپکراو ●

● گولی سەربەستی ●

مەگەر بەدەگمەن کورد زوبانێ لە کوردستاندا هەبێ گوێ ی لە دەنگە خۆش و پر جۆش و خرۆشەکەی مامۆستای هونەرمەند تایەر تۆفیق نەبوو بێت ، ئەو دەنگە زولالەی لەسەر لوتکەو لە بناری شاخ و لەنێو دۆل و لە پێدەشتدا تا هەتایە کپ نابێ و هەر بەزیندویی دەمێنێتەوە ، ئەو دەنگە دل تەزێنەی کە جوانترین مۆسیقا دەخاتە بەر گیانی مەقامی بەیات و صەباو



حیجازو سێگاو چوارگاو ئۆرفەو هەمایون ودەیەها ئاوازیتر کە تا رۆژگار ماوە لەبیر ناچنەوەو ، لە گۆیچکەی پیرو گەنجو کچو کورانی کوردا دەزرنگێنەوە .. بەڵێ مامۆستا (تایەر تۆفیق) ی هونەرمەند ئیمرۆ لەدڵو گیانی هەموو هونەر دۆستانی کوردا دەژی ، شیرین بەهارەو جیهانم پشکنیوەو وەی لێ زاڵمو سەدان گۆرانیتر ، ئەمجارەیش وا خۆیان لە (کەشکوڵی گوڵی سەربەستیدا) دۆزیەوە ..

« گوڵی سەربەستی » ، بەری رەنجی هونەریی چڵو پێنج ساڵی گۆرانی بێژیکی کوردە ، بەشی یەکەمی ئەو گۆرانیو بەستەو مەقامە بەسۆزانەیە کە مامۆستا تایەر توفیق « 45 » ساڵی لە تەمەنی خۆی بە تاڵیو سوێریو ترشیو شیرینی لەگەڵیاندا بەسەر بردووە ..

**گوڵی سەربەستی بریتی‌یە لە 232 لاپەڕەی قەبارە بەتاڵی (23,5 × 16 سم ) هو ، زیاتر لە « 150 » گۆرانیو مەقامو بەستەی کوردی هەمە جۆری گرتۆتە خۆ ، ئەم بەرهەمە بەپێزەی مامۆستا تایەر لە چاپخانەی « دار آفاق عربیة » لە بەغدا چاپکراوەو نرخەکەی دینارو روبعێکەو ، لە کتێبخانەی نیشتمانی بەغداش ژمارە « 1146 » ی ساڵی « 1983 » ی دراوەتێ ..**

ئەوەی شایانی باسە مامۆستا کەریم شارەزا پێشەکی‌یەکی تێرو تەسەلی بۆ کتێبەکە نووسیوەتەوەو بە شیعرەکانیشدا چۆتەوە ،لە پێشەکی‌یەکەشدا لە زۆر لایەنی پڕ بایەخی ژیانو دەوری هونەریی ئەم هونەرمەندەی کۆڵیوەتەوە . برایان « نجاة خطاط » و « جعفر بەرزنجیش » بەشداریان کردووە لە دەرهێنانە هونەرییەکەی گوڵی سەربەستی‌دا یەکەمیان نەخشەی بەرگەکەی کێشاوەو ، دووەمیشیان سەرپەرشتی چاپو دەرهێنانی هونەریی کتێبەکەی کردووە ..

هونەرمەند تایەر تۆفیق لە پێشکەش کردنی گوڵی سەربەستیدا دەڵێ :

« پێشکێش بێ : بە هەموو کوردێکی حەز بە هونەری کوردی دەکاتو دەیەوێ ئاوازو گۆرانیی کوردی هەمیشە لە پێشکەوتنو گەشەکردندا بێ » .

ئێمە لە کاتێکدا پڕ بەدڵ پیرۆزبایی لە مامۆستای خۆشەویستمان دەکەین بە بۆنەی چاپکردنی گوڵی سەربەستی ، بە ئاواتەوەین بەشی دووەمیشی بەزووترین کات چاو هەڵ بهێنێو دیدەی خوێنەرانو هونەر دۆستانی پێ بگەشێنێتەوە ..

**● چەپکێك لە شیعرەکانی « سامی عەودال » ●**

« سامی عەودال » یا مەلا حوسەینی بابە رەسووڵی شاعیری کلاسیکی کورد . ئەم شاعیرەمان لە ساڵی 1910 دا لە شارە خنجیلانەکەی کۆیە هاتۆتە دونیاوەو خوێندنی حوجرەی هەر لە مزگەوتەکانی ئەو شارەدا بووەو لە تەمەنی حەڤدە ساڵی‌یەوە شیعری داناوەو سوودی لە زۆر شاعیری بەتوانای کورد وەرگرتووە ، وەکو ناڵیو حاجیو ئەدەبو قانیع ، چەند شاعیرێکیش سوودیان لەو وەرگرتووە وەك دڵدارو وردیو مسکین .. سامی شاعیر لە ساڵانی سی‌ویەكو بەرەو سەرەوە بە دەنگە زوڵاڵەکەی لە زۆر کۆڕو کۆبوونەوەی نیشتمانیدا بەشداری کردووەو شیعری کوردی پڕماناو بەجۆشی خوێندۆتەوە بۆ نموونە « سامی » 52 ساڵ پێش ئیمرۆ شیعری « قەلبی من » ی هۆنیوەتەوە کە هەر ئەم شیعرەیش بووە وای کردووە شاعیر زیاتر بچێتە نێو دڵو دەروونی هەژارانی کوردەوە ، وا ئەم کۆپلەیەی لێرەدا دەخەینە روو :

قەلبی من گەر چەشنی لالە ، بێتو نەوتی تێ‌بکەن
ئاگری دوژمن بێتە گیانم ، وەك چرا من پێ‌بکەن
شەق شەقی‌کەن گۆشتو ئێسقان ، یەك بە یەك خۆی‌ی تێ‌بکەن
بێ‌ترس من دێمە مەیدان ، حوکمە ئازادیم دەوێ
گەر نەسووتیمو نەخنکێم ، چۆن هەژارم سەرکەوێ

چەپکێك لە شیعرەکانی سامی « 96 » لاپەڕەی قەبارە بەتاڵی « 23,5 × 16,5 سم » هو ، کۆمەڵە شیعرێکی تێدا کۆکراوەتەوە کە چوار لایەنی شیعری سامی عەودال دەنوێنن وەك (شیعری ئایینی ، شیعری نیشتمانی ، شیعری کۆمەلایەتیو پەندو ئامۆژگاری ، شیعری دڵداری » . هەروەها پێشەکی‌یەکی کورت بۆ دیوانەکە نووسراوەتەوە کە تیایدا ژیانو دەوری شاعیرو باری ژیانو گوزەرانی روون دەکاتەوە ، ئەم پێشەکی‌یەش لە لایەن کاك « رفیق مجید عبدالله » نووسراوەتەوە ، مامۆستا « کەریم شارەزا » ش دیوانەکەی ئامادە کردووەو پێیدا چۆتەوە ..

ئەم دیوانەی سامی عەودال لە چاپخانەی « آفاق عربیة » لە بەغدادا چاپکراوەو ، نرخی 750 فلسەو ، کاك

« جعفر برزنجي » سەرپەرشتی چاپو دەرهێنانی هونەریی کردووە ، لە کتێبخانەی نیشتمانی بەغداش ژمارە « 1147 » ی سالی « 1983 » ی دراوەتێ . ئەوەی شایانی باسە ئەم دیوانەی سامی بەشێکی هەلبژاردەی شیعرەکانی یەتیو نزیکەی هەشتا پارچە شیعری تیادا بلاوکراوەتەوە .. هیوادارین ماموستای شاعیر هەر تەمەن درێژ بێ و بەرهەمی بەپێزو تێرو تەسەلمان پێشکەش بکاتو کتێبخانەی کوردیش بە شیعرەکانی خوی دەولەمەندتر بکات ..

**بەیتی ئایشە گول : ـ**

لەم چەند سالانەی دواییدا بەشێك لە نووسەرانی کورد زیرەکانە رووبان لە مەیدانی کوکردنەوەی فولکلورو کەلەپووری کوردی کردووتوانییان بەهەرچی چونێك بێت ئەو گومە مەنگەی فولکلور بجوولێنن و شتێکی لێ وەبەرهەم بهێنن ، زور لە برا نووسەرەکانمان نەك هەر تەنها فولکلوریان کوکردەوەو بەس ، بەلکو زور بابەتی ناسكو بەسوودو بەپێزی ئەم لایەنە ئەدەبییەیان کوکردەوەو ساغیشیان کردەوەو لێکولینەوەیشیان لەبارەیەوە کرد ، بو ئەوەی سوودێکی زیاتری هەبێتو خوێنەر چاکتر بچێتە بنجو بناوانیو بزانێت ئەدەبی کوردی لەرووی کەلەپوورو فولکلورەوە چەند دەولەمەندەو چەند گەنجینەی بزرو شاراوەی لەم مەیدانەدا تا ئێستا شی نەکراوەتەوە ، جا هەروەکو لە پێشەوە گوتمان هەندێ برای نووسەر بەگیانێکی لە خوبووردووانە ئەم رێبازەی نووسینیان گرتووو ماندووبوونەکەیشیان ئەنجامێکی چاکی دا بەدەستەوە ، بو نموونەش وا کاك « ئەسعەد عەدو » لە بەیتی « ئایشە گول » دا لایەنێکی ئەم ئاواتە مەزنەی هەموو لایەکمان بەدی دەهێنێ ..

« بەیتی ئایشە گول » نامیلکەیەکی « 48 » لاپەرەیی قەبارە بچووکی « 16,5 × 11,5 سم » ەو ، دوو بەیتی فولکلوری بەپێزی تیادا نووسراوەتەوە کە بەناوی « ئایشە گولو لەشکری » و « سولەیمان بەگی سوران » ە ، ئەم دوو بەیتە وەکو نووسەر خوی دەیلێ لە روژی 28 / 11 / 1980 دا لە زاری « عەزیزی شیخ محەمەد عەزیز » ی وەرگرتووەو تومـاری کردووە .. بەهەرحال ئەم بەرهەمە نایابەی کاك « ئەسعەد » کەلەبەرێکی چاك لە کتێبخانەی کوردیدا پر دەکاتەوەو بەکارێکی پیروز لە قەلەم دەدرێ ..

نامیلکەی بەیتی ئایشە گول لە چاپخانەی « آفاق عربية » لە بەغدادا چاپکراوەو نرخی لەسەر تومار نەکراوە ، بەلام بە روبعە دینارێك دەفروشرێو .. لە کتێبخانەی نیشتمانی بەغدادا ژمارە « 1148 » ی سالی « 1983 » ی دراوەتێ ، نەخشەی بەرگەکەی کاکە محمد زادەی هونەرمەند بوی کێشاوەو کاك جەعفەر بەرزنجیش سەرپەرشتی چاپو دەرهێنانی هونەریی کردووە ..

هیوای سەرکەوتن بو کاکە « ئەسعەد » دەخوازینو بەدلێکی پر لە ئاواتەوە دەلێین ، خوزگە ئەو برا نووسەرانەی خوویان داوەتە ئەم بوارە زیاتر کوششیان دەکردو هەولێکی چاکتریان دەدا بو پاراستنی کەلەپووری نەتەوایەتیمانو فراوانتر دەکەوتنە لێکولینەوەو ساغ کردنەوەی ئەو بەرهەمانەی وەچنگیان دەکەوێ ..

**دیوانی نووری : ـ**

گەلێ جاری وا هەلدەکەوێ شاعیرێك یا نووسەرێك لە گوشەیەکدا دەگیرسێتەوە کە بەلای بەشێکی زوری نووسەرانو خوێنەرانەوە بە بزرو نەناسراوو دوورە پەرێز دەدرێتە قەلەم ، لەگەل ئەوەشدا وەنەبێ ئەو شاعیرە یا ئەو نووسەرە خاوەنی بەرهەمو دەنگێکی تایبەتی خوی نەبێت ، بەلکو بە پێچەوانەوە دەبینین ئەو جورە نووسەرانە وەك هەر نووسەرێکی دیکە دەجوولێنو بە درێژایی روژگار لەبەرهەم ناکەونو ، خامە رەنگینەکەیان لە برەودا دەبێ .. ئەگەرچی بزرو دوورە پەرێزیش ناسراوین ؛ بەدووریشی مەزانە گەر زور هوی نادیار بووبنەتە بەلگەی نە ناسراوی فلانە یا فیسارە شاعیر یا نووسەر .. نووری شاعیریش دەتوانم بلێم یەکێکە لەو برا نووسەرانەی کە لەلای زوربەی خوێنەرانی کوردەوە نەناسراوە ئەگەرچی لە بواری خزمەتکردنی شیعرو ئەدەبیاتی کوردیدا وەك هەر روشنبیرێکی تری کورد دەستە وەستان نەوەستاوەو کەمتەرخەمی نەکردووەو ئەوەی بوی کرابێ کردوویەتیو سلی لێ نەکردوتەوە ..

ئیمروش چەپکێ لە دیوانی شیعرەکانی نووری ناسنامەیەکی بەلگە نەویستەو وا لەبەر دەستی خوێنەرانی کورد دایەو ئەوە دەسەلمێنێ کە ماموستا « شیخ جەلالی شیخ جەمیلی نەقشبەندی » ، شاعیرێکی ترەو خوێنەرانی کورد شانازی بە بەرهەمە شیعرییەکانییەوە دەکەنو لەگەلیدا

ئاشنا دەبن و دەیناسن ..

مایەی خۆشحاڵی‌یە کە برای ئازیز سەردار میران ئەرکێکی پیرۆزی گرتۆتە ئەستۆو ئەم دیوانەی نووری ئامادەکردووە بۆ چاپ و پێشەکی‌یەکی خنجیلانەی بۆ نووسیوەتەوە ، هەرچۆنێك بێ هەولی هەردوو لا لە بۆتەیەکدا یەکیان گرتۆتەوەو ئەنجامێکی چاکیان بووە ، ئەویش « دیوانی نووری » یە کە ئیمرۆ وا لە ئەرشیفی کتێبخانەی کوردیدا شوێنێکی دیاری بۆخۆی دەستنیشان کردووە .

« دیوانی نووری » بریتی‌یە لە « 72 » لاپەرەی قەبارە بەتاڵی « 24,5 × 17 سم » و ، بە چاپێکی چاك و رێك و پێك لە چاپخانەی « دار آفاق عربية » لە بەغدادا چاپکراوەو ، نرخەکەیشی 250 فلسەو لە کتێبخانەی نیشتمانی بەغداش ژمارە « 1354 » ی سالی « 1983 » ی دراوەتێ ..

ئەوەی شایانی باسە دیوانی نووری لە رووی دابەشکردنی بابەتەکانی‌یەوە کراوەتە هەشت بەش کە ئەمانەن :

- **نووری‌و شیعری ئایینی .**
- **سروودو شیعری کۆمەلایەتی .**
- **شیعری دلداری .**
- **وەصفی کوردستان .**
- **شیعری لاواندنەوە « رثاء » .**
- **شیعری هەجوو .**
- **پێنج خشتەکی شاعیرانی کورد لەسەر شیعری نووری .**
- **شیعری تاك تاکە .**

هەروەها کاك « جعفر برزنجی » سەرپەرشتی چاپ و دەرهێنانی هونەریی کردووە .. لەگەڵ پیرۆزباییمان بۆ مامۆستای شاعیر « شیخ جلال شیخ جمیل نەقشبەندی » ، ئاواتە خوازین بەزوترین کات ئەو دیوانەی کە ئامادەی کردووە بۆ چاپ بکەوێتە بازاڕو کەلەبەرێکی تر لە کتێبخانەی کوردیماندا پڕ بکاتەوە ..

- **گەلە گورگ : ـ**

بێ گومان چیرۆکی کوردیش وەکو هەموو بەشەکانی تری ئەدەب خاوەنی مێژوویەکی پڕ لە تاقی‌کردنەوەی دووروو درێژی چیرۆك نووسە ناودارەکانی کوردە ، هەموو لایەکیشمان ئەوە دەزانین کە سەرهەڵدانی یەکەم چیرۆکی هونەری‌ی کوردی سالی 1925 ی زایینی بۆ دانراوە ، واتە بە لەدایك بوونی چیرۆکی لە خەومای « جمیل صائب » مێژووی لەدایك بوونی چیرۆکی کوردی دەست پێ‌دەکات ، من بەش بەحالی خۆم دەلێم چیرۆکی کوردی زۆر پێش ئەم مێژووەیش لە ئارادا بووە . جا گەر لە قالبێکی هونەریشدا خۆی نەدیبێتەوە وەك لە خەومای « جمیل صائب » ئەوە زۆریشی لەبەر ئەودا نەبووە ، بەلکو بناغەیەکی پتەوی داناوە بۆ چەکەرەکردن و سەرهەلدانی ئەم هونەرە تازەیەی چیرۆکی کوردی‌و ئەو زەمینە لەبارەی بۆ رەخساندووە کە ئیمرۆ شانازی پێوە بکەین و بلێین شوکر وا چیرۆکی هونەریی کوردی لە نیوە سەدەیەکی رەت کردووەو لەو ماوە درێژەی ژیانی‌دا چیرۆك نووسەکانمان توانیویانە سوود لەو ئێش و ئازارەی نێو چینەکانی کۆمەلی کوردەواری وەربگرن و دەیەها بەرهەمی نایاب و بەکەلك و نەمر بخەنە روو کە تێکرا رەنگدانەوەیەکی راستەقینەی باری ئەو ژیانەی نێو کۆمەلەکەیان بێت و هەر ئەو دەربرینە راستەقینەیش بۆتە هۆی ئەوەی کە دەیەها چیرۆك نووسی هەلکەوتووی وا بێنە کایەوەو لە ریزی پێشەوەی چیرۆك نووسە کوردەکاندا جێگەی شیاوی خۆیانیان بگرن .. ئێمە لێرەدا نامانەوێ یەکە یەکە ئەو برا چیرۆك نووسانە دەستنیشان بکەین و بییان ژمێرین ، بەلکو دەمانەوێ پێناسەیەکی ئەو بەرهەمە بە پێزەی کاك « حسین عارف » بکەین کە لە سالی رابردوودا بەچاپ گەیەنراوەو ئەویش وەکو نووسینەکانی تری نووسەر لە ئەرشیفی کتێبخانەی کوردیماندا شوێنێکی دیاری بۆخۆی هەلبژاردووە ..

هەلبەتە دەبێ ئەوەیش بلێین کە مامۆستا « حسین عارف » ی چیرۆك نووس تاقی‌کردنەوەیەکی دووروو درێژی لەگەل نووسین و چیرۆکی کوردیدا هەیەو ، نزیکەی چارەکە سەدەیەکە لەگەل ووشەی کوردی‌و چیرۆکی پڕ چێژو تام و بۆی کوردەواری‌دا مامڵەت دەکا ، چای شیرین و چالی جەرگی پیرێژن و کانی رەحمان و دەیەها چیرۆکی‌تر بەلگەی هەمیشە زیندوون بۆ ئەو دەورە دیارەی کە نووسەر لەم بوارەدا بوویەتی و تا ئیمرۆش بێ سلەمینەوە ئەو هەقیقەتە دەسەلمێنێ ، راستی‌ی ئەم رایەیشمان کۆمەلە چیرۆکێکی تازەی نووسەرە کە بە ناوی « گەلە گورگ » بە چاپی گەیاندووە ..

« **گەلە گورگ** » بریتی‌یە لە چوار چیرۆکی سالانی

« 1957 , 1980 , 1982 » کە ئەم ناونیشانانەیان هەڵگرتووە « سەفەرێکی ئەفسووناوی ساڵی 1980 ، تەتەر ساڵی 1980 ، گەلە گورگ ساڵی 1982 ، شالاوی دڵ ساڵی 1957 » . ئەم کۆمەڵە چیرۆکە « 176 » لاپەرەی قەبارە بەتاڵی « 23,5 × 17 سم » ەو ، لە چاپخانەی « الادیب البغدادی » لە بەغدادا چاپکراوەو نرخی نیو دینارە .. هونەرمەند کاکە « سعید یحیی خطاط » نەخشەی بەرگو تابلۆی چیرۆکەکانی کێشاوەو خەتەکانیشی نووسیوە ، هەروەها کاک « جعفر برزنجي » سەرپەرشتی چاپکردنی کتێبەکەی کردووە ..

کۆمەڵە چیرۆکی « گەلە گورگ » سێ هەزار دانەی لێ چاپکراوەو بە ژمارەی « 1364 » ی ساڵی 1983 بە کتێبخانەی نیشتمانی بەغدا سپێرراوە ..

ئەوەی شایانی باسە چیرۆک نووس لە لاپەرەی « 173 » دا دووبارە ئەو بەرهەمە چاپکراوانەی خۆی خستۆتەوە بیری خوێنەرانی کوردو ، وەکو ببلیوگرافیایەکی خنجیلانە لەگەڵ کۆمەڵە چیرۆکەکەیدا بلاوی کردوونەتەوە کە ئەم لایەنانەی ئەدەبی کوردی گرتۆتەوە :

- چوار کۆمەڵە چیرۆک لە نێوان ساڵانی 1959 تا 1983 .
- دوو بابەتی لێکۆڵینەوە لە ساڵی 1958 و 1977 .
- سێ بابەتی وەرگێڕان بۆ زمانی کوردی لە ساڵانی 1959 و 1982 ..
- « فتاة نغدة ـ قصائد لکامران » وەرگێڕان لە زمانی کوردییەوە بۆ زمانی عەرەبی ساڵی 1960 ..

لە ڕاستیدا جگە لەمانەیش کاک حسێن بەردەوام نووسینی هەمە جۆری لە ڕۆژنامەو گۆڤارە کوردییەکاندا بلاوکردۆتەوە .. پیرۆزباییمان بۆ کاکە حسێنو هیوادارین لە داهاتوویەکی نزیکدا چاومان بە بەرهەمێکی تری ڕووناک بێتەوەو لەگەڵ نووسینێکی دیکەیدا بەیەک بگەینەوە ..

- **مزگێنی :** ـ

هەر لە بواری چیرۆکی کوردیدا ، برای چیرۆک نووس کاکە « محمد سلیم سواری » کۆمەڵە چیرۆکی « مزگێنی » بە زمانی کوردیو بە شێوەی کرمانجی ژووروو پێشکەش کتێبخانەی کوردی کردووە ، ئەم کۆمەڵە چیرۆکەی کاکە « محمد سلیم سواری » لە دوو توێی بەرگێکی قەشەنگدا دە چیرۆکی هەمە جۆری کۆکردۆتەوە ، کە ئەم چیرۆکانەن :

« مریبایێ ئاغای ، رەزڤان ، شلخەکا مێشا ، مزگینی ، شەڤەرۆک ، کولی ، شڤان ، خوینو خەنا ، گاڤان ، کەوێ رکێ » .

« **مزگینی** » 80 لاپەرەی قەبارە بەتاڵی « 23,5 × 16,5 سم » ەو لە چاپخانەی « دار آفاق عربیة » لە بەغدادا چاپکراوەو نرخی 250 فلسە .. کاکە « جعفر برزنجي » یش ، سەرپەرشتی لەچاپدانو دەرهێناری هونەری کردووەو لە کتێبخانەی نیشتیمانی بەغدا ژمارە « 1353 » ی ساڵی « 1983 » ی دراوەتێ .

نووسەر لە پێشەکی کۆمەڵە چیرۆکەکەیدا ئەم چەند ووتەیەی کردۆتە دیاریو دەڵێ :

« **دیاری** : بۆ .. هەمی کوڕو کچێت مللەتێ من .. ئەوێت من کرینە مێرخاسو قەهرەمانێت چیرۆکێت خو .
**بۆ** ...
هەمی وارێت وەلاتێ من .. ئەوێت من کرینە مەیدانکێت مێرخاسو قەهرەمانێت چیرۆکێت خو . » .

سەرکەوتن بۆ کاکە « محمد سلیم سواری » و بەهیوای بەرهەمی تری ئەم برا ئازیزەمانین ..

- ئەوەی ڕاستی بێت شتێکی تر ماوە بیڵێین لە بارەی ئەو کتێبانەی کە لەسەر ئەرکی ئەمینداریتی چاپکراون ، ئەویش ئەوەیە کە لە کاتی چاپکردنیاندا ژمارەی زنجیرە بۆ ئەم کتێبانەی خوارەوە نەنووسراوەو لەبیر چووە ، جا بۆ ئەوەی کاری ئەو برا نووسەرانە هاسان بێت کە لە چاپکراوو بەرهەمی کوردی دەکۆڵنەوە وا لە خوارەوە بە ڕێکوپێکی ژمارەی زنجیرەی کتێبەکانو ناوەکانیان دووبارە دەکەینەوە ..

- **گوڵی سەربەستی** ـ زنجیرە « 1 »
- **چەپکێک لە شیعرەکانی سامی عەودال** ـ زنجیرە « 2 »
- **بەیتی ئایشە گوڵ** ـ زنجیرە « 3 »
- **مزگینی** زنجیرە « 4 »
- **دیوانی نووری** ـ زنجیرە « 5 »
- **گەلە گورگ** ـ زنجیرە « 6 »
- **چەند سەرنجێکی تایبەتی :** ـ

دوا بە دوای ئەو پێناسە کورتەی دەربارەی کتێبە بارمەتیدراوو چاپکراوەکانی ئەمینداریتی گشتیی ڕۆشنبیریو لاوانی ناوچەی کوردستانی خاوەنی خودموختاری

منیش دەمەوێ لەلای خۆمەوە چەند وردە سەرنجێ دەربڕم و
دوو قسەی لێ بکەم ..

بێگومان ئەو هەنگاوە پیرۆزەی ئەمینداریێتی لەم دوو ساڵەی دوایی‌یەدا ، مایەی شانازی پێوەکردن و خۆش بەختی خوێنەرانی کوردەو هەوڵدانێکی مەزن و پیرۆزە لە بواری بەسەرکردنەوەی باری ڕۆشنبیریی کوردی و دەست خستنە سەر ئەو گیروگرفتانەیە کە بەرەو ڕووی چاپکراوی کوردی و ئەدیب و ڕۆشنبیر انی کورد دەبنەوە بە مەبەستی چارەسەرکردن و نەخشە بۆ دانانێکی سەرکەوتووانەی پڕ لە سوودو قازانج و گوێزانەوەی ئەو کڕی و کپی‌یەی کەوا بۆ ماوەیەک باڵی بەسەر جموجوڵی چاپ و یارمەتی چاپکردندا گرتبوو ، بۆ قۆناغێکی تازەی پڕشنگدار کە ئەو بەرهەم و چاپکراوە کوردی‌یانەی دوو ساڵی ڕابردوو چاکترین ڕەنگدانەوەی ئەم دەست بەباڵ وەگرتنەی لێپرسراوو کارگەرانی ئەم ئەمینداریێتی‌یەن .. تا ئێرە گلەییمان لەو دەورە پیرۆزەی ئەم ئەمینداریێتی‌یە نی‌یە ، بەڵکو زیاتر لە جارێک دەڵێین خوزگە ساڵانی پێشتریش هەروا دەبوو کە ئەمەیش ئاواتێکی ڕەوای هەموو خوێنەرو نووسەرێکی کوردە لە پێناوی بەرەوپێش چوونی ڕەوڕەوەی کاروانی ڕۆشنبیری کوردیماندا بۆ گەیشتن بەو ئامانجەی ئەدیبان و نووسەرانی کورد هەوڵی بۆ دەدەن و شەوانی دوورو درێژی بۆ دەخەنە سەر ڕۆژو ، تاڵ و سوێری زەمانەی بۆ دەچێژن هەر تەنها بۆ ئەوەی هەناسەی نەشونماکردن و گۆڕانکاری لە مەیدانی ئەدەب و ڕۆشنبیریی کوردیدا مەوداکەی زیاتر فراوان بێت و بەتاوتر بەرەو داهێنان هەنگاو بنێت ..

هەر لەم ڕوانگەیەشەوە ، وە بۆ ئەوەی ئەم گەشەکردن و داهێنانە پڕ بە پێستی ئەم ڕۆژگارەی ئیمرۆمان بێت و لەگەڵ چەرخی زانست و تەکنەلۆژیادا هاوشان بڕوات و لێی دوا نەکەوێت بە پێویستی دەزانم ئەم دوو پێشنیارە بخەمە ڕووبەو هیوایەی ساڵی « 84 » ساڵێکی زێڕین بێت بۆ چاپەمەنی‌یەکانی ئەم ئەمینداریێتی‌یە چ لە بواری کتێبی یارمەتی دراو و چ ئەو کتێبانەی خۆی بە چاپیان دەگەیەنێت ..

● وەکو لەم پێناسەیەدا دەردەکەوێ ڕێژەی ئەو کتێبانەی یارمەتی دراون لە بواری شیعردا دەگاتە ٤ /5٪ ، لە کاتێکدا هەموو ئەو بەرهەمانەی دیکە ڕێژەیان دەگاتە 46/5٪ کتێب ، کە ئەمەیان بەلای منەوە لەڕووی هەڵبژاردن و دەستنیشان کردندا بە کارێکی سەرکەوتوو نایەتە بەرچاو ، لەوانەیشە بەڵگە بۆ بەرپەرچ دانەوەی ئەم ڕایەم ئەوەبێت کە شاعیرانی کورد لە زیادبوون دان و شیعریش بەسەر بابەتە ئەدەبی‌یەکانی تردا زاڵە ، بەلام دیسانەکێ دەڵێم خۆزگە ئەو یارمەتی‌یەی بۆ شیعر دادەنرا دەخرایە سەر بابەتە ئەدەبی‌یەکانی‌تر وەك « چیرۆك و لێکۆڵینەوەو زانست و مێژووو وەرگێرانی بەرهەمی کوردی بۆ زمانی عەرەبی » کە ئیمرۆ خوێنەرو ڕۆشنبیرانی کورد زیاتر پێویستیان پێ‌یەتی و بەدوایدا وێڵ و سەرگەردانن ،

بۆیە پڕ بەدڵ ئاواتی ئەوە دەخوازم لە ساڵی 984 دا نەخشەیەکی دیراسەت کراو هەبێت و هەر لە زووەوە ئەو بڕیارە بدرێت کە بۆ هەر بابەتێکی ئەدەبی نیسبەتێکی دیاریکراو دابنرێت و لێی ڕەت نەکات ..

● زۆر لەو بابەتانەی پێشکەش دەکرێن بۆ یارمەتی‌دان ، چاکتر وایە هەر لە زووەوە نووسەرەکە بەتەنگ ئەوەوە بێت کە بەرهەمەکەی تا چەند سوود دەگەیەنێتە ئەدەب و ڕۆشنبیری کوردی و چەند لەڕووی هەڵبژاردنیدا سەرکەوتوو بووە ، جاگەر هاتوو هەر لە سەرەتاوە لەوە دڵنیا نەبوو کە بەرهەمەکەی « 75٪ تا 100٪ » بەکەڵکە بۆ قۆناغی ئیمرۆمان و بۆ سوود گەیاندن بە کاروانی ئەدەب وڕۆشنبیری کوردی و بەرەوپێش بردنی ، ئەوە چاکتر وایە ڕێگە بۆ بەرهەمی تر چۆڵ بکات و نەبێتە گرفت لەبەر دەمیاندا ، چونکە هەروەکو لە پێشەوە گوتمان بارو دۆخی ئیمرۆی ئەدەبی کوردی پێویستی بەو نووسین و بابەتە ئەدەبی‌یانە هەیە کە بە وردی ڕێگەی بەرەو پێشەوە چوون لەبەردەم خوێنەرانی کورددا دەستنیشان بکات و گرێ کوێرەی کێشە ئاڵۆزەکانیان بۆ بکاتەوە

• بەهەرحاڵ هەوڵ و کۆششی ئەمینداریێتی گشتی‌ی ڕۆشنبیری و لاوان جێگەی ڕێزو سووپاسێکی زیدە پێویستە و هیوادارم ساڵی « 84 » یش وەکو دوو ساڵی ڕابردوو ساڵێکی زێڕین بێت بۆ کتێب و چاپکراوی کوردی ، هەڵبەتە هەوڵی هەموولایەکیش ئەو سەرکەوتنە زامن دەکات و کۆسپ و تەگەرەکانیش لەبەردەم دڵسۆزانی کاروانی ڕۆشنبیریی کوردیدا تەخت دەکات ..

# کاروانی رۆشنبیری لەکوردستاندا

## لە هەولێر

ئامادە کردنی
شوان

**«شانۆگەری سمایلو مامز»**

تیپی نواندنی «شەماڵ» سەر بە بەڕێوەبەرایەتی لاوانی هەولێر ، لە هۆڵی رۆشنبیری جەماوەری ، شانۆگەری «سمایلو مامزی» لە رۆژانی 17 — 1983/12/25دا پێشکەش کرد .

ئەم شانۆگەرییە لە نووسینو دەرهێنانی : «سمیر عبدالستار»ە ، نووسەر لەکاتی دەستپێکردنی شانۆگەریەکە ئەم وتەیەی پێشکەش کرد :



[هونەری شانۆ ـ هونەرێکی تازەو گەشاوەو پێشکەوتووە ئەم شانۆگەرییە ، بنەڕەتو بنچینەکانی فۆلکلۆر و رووداوو چیرۆکی میللییە ...] .

هەروەها لەوتەیەکی تیپی (شەماڵ)دا ئەم باری سەرنجە دەربڕاوە :

[لەم دواییەدا گەڵێ شانۆگەری جیهانیی وەرگێردراو پێشکەش کرا ، کە توانیان جێگای تایبەتی خۆیان لە مەیدانی هونەردا بکەنەوە ، کە جێگای رێزو شانازیمانە ، ئێمەش وا لەئاسۆی هونەری فۆلکلۆری کوردییەوە شانۆگەریەکمان بۆ هەڵبژاردن ، تابتوانین دیدەی بینەران روون بکەینەوە ، ئەویش شانۆگەری (سمایلو مامز)ە ، هیوادارین جێگای رەزامەندی ئێوەی خۆشەویست بێت] .

**– ئەکتەرەکان بەپێی دەرکەوتنیان لەسەر شانۆ –**

| | |
|---|---|
| 1 ـ سمایل | حمید صابر |
| 2 ـ مامز | سهیلة محمد قهرەمان |
| 3 ـ زرار | جرجیس محمد صالح |
| 4 ـ رەحمان | دلشاد محمد أمین |
| 5 ـ مەلا | یوسف رەسول |
| 6 ـ حاجی مولود | عمر حسن عثمان |
| 7 ـ دەرویش عثمان | آزاد عولا سلیم |
| 8 ـ عمر | کاظم عثمان |
| 9 ـ شێخ | عبدالرزاق عبدالرحمن |



10 - دەروێشەکان
1 - پشتیوان محمد برزنجی
2 - اسماعیل محمد
3 - حسن عثمان

11 - ئافرەت
سمیرە عبدالستار

12 - خەڵکی گوند
1 - پشتیوان محمد برزنجی
2 - اسماعیل محمد
3 - محمود کریم
4 - عبدالرحمن إبراهیم

**«ناوەرۆکی شانۆگەری یەکە»**

**سمایل و مامز** چیرۆکێکی فۆلکلۆری یەو لە کێشەو دەردێکی ناو کۆمەڵگای کوردەواری دا دەدوێ : لەسەرێکەوە ئەو دیاردە سلمناکە دەردەخات کە چۆن لە ناو زۆر کۆمەڵگادا بایەخی شیاو بە ئافرەت نادرێت و شوێنی تایبەتی خۆی بۆ دیاری نەکراوە ، بەچاوی سووك تەماشا دەکرێت لەلایەن زۆر کەسی دواکەوتووەوەو وادادەنرێت کە ژیان تەنیا ڕوو بەڕووی پیاو دەکرێتەوەو هیچ ئاوڕێك لە تواناو دەستەلات و پایەی ئافرەت نادرێتەوە ، باری ژیانی ئافرەت بە تەرازوی هەق ناکێشرێ و حیسابی ئەوەیان بۆ ناکرێت کە نیوەی کۆمەڵ و ژیان سازیانی (کۆمەلایەتی یان ئابووری ، یان ڕامیاری) بێ ، بەبێ ئەوان کە لەبەرێکی گەورەی تێ دەکەوێ .

ناوەرۆکی شانۆگەری یەکە : تا ئاست و ئەندازەیەکی چاك بووەنی ئافرەت دەسەلمێنێ ، ئەگەرچی لە ڕووی دەرخستنی نموونەیەکی ناراستەوە ، ئەویش ئەوەیە کە ئافرەت لە شانۆگەری یەکەدا پەنا دەباتە بەر مەکریان ئاشکراتر بڵێن : مامز کارێکی وادەکات خەڵکی بەو چاوەوە تەماشای سمایل بکەن کە پیاوێکی شێتە .. مامز ئەو کارە بۆیە دەکات کە سمایل لە ئاستی خواست و ئارەزووەکانیدا بنوشتێتەوەو ملی بۆ کەچ بکات ، تا وا لە سمایل دەکات سەری خۆی هەڵگری و ڕوو بکاتە غەریبی ! !

سمایل کە سەری خۆی هەڵدەگرێ وادەزانی ئەو کارە نابەجێیانە تەنیا لە مامز دەوەشێتەوە ، نازانی چەندین ئافرەتی دی هەن هەزار بەردیان داوە بەپشتی مامزدا ، ئەوەتا تووشی ئافرەتێکی دی دەبێت ، کە لە سەرەتادا پێشوازیەکی گەرمی لێ دەکات کەچی لەدواییدا بەزم سەمەرەی بەسەر دێنێ :

جا با بزانین چۆن ؟

- سمایل - عەیب نەبێ زەلامت لەماری نیە ؟

- ئافرەت - نا وەڵلە ... دەفەرموو کاکە دەفەرموو دانیشە .

سمایل - خوشکێ مادام زەلامت لەمار نیە ئەمن دەچمە جێ یەکی دی .

ئافرەت - بەخوا هەر میوانی ئەو مارەی دەبی ... ئەیەرۆ ئەتوش وەك برای منی .. ئەوجا بەخێرهاتی برام .

ئەو ئافرەتە هەر بەجۆری میوانداری یەوە ناوەستێ بەڵکو ئەیەوێ بزانێ بنج و بناوانی سمایل چی یە ؟ .. بەرەچەڵەکیدا شۆڕ دەبێتەوە :

ئافرەت - توخوا پێم نارێی ئەتو هی کێندەری و لە چ دەگەرێی ؟

سمایل - نازانم چیت لۆبگێرمەوە ، ئەوە لەرکی ژنەکەم سەری خۆم هەرگرتیە ، بوویمە ڕێبوار .

ئەم ئافرەتە هەر کە ئەزانێ سمایل لەداخی ژنەکەی سەری خۆی هەڵگرتووە ، ئەمیش پیلانێکی بۆ ڕێك دەخات ، گوایە بەو نیازەی پەندێکی ئەوتۆ وەرگرێت کە مامزی ژنی بە نابەجێ دادەنێت و بەڵکو بگەرێتەوە ناو ماڵ و منداڵی خۆی ، ئەوەتا دەڵێ .

[دیارە ئەمە کابرایەکی فەقیر حارە .. با مەکرەکی وەهای لۆ دامەزرێنم وەی پێ بکەم ، بگەرێتەوە ناو ماری خۆی]

ئافرەتەکە دوای ئەوەی نان بۆ سمایل ئامادە دەکات ئیدی جەمسەری پیلانەکەی دەردەکەوێت و پێ ی دەڵێ :

[دەتەوێ نانیش بخۆی ... سندانێ ، بخۆی ، ئەلعان خەڵکی ئاوایت دێنمە سەری ، حەفت برام هەیە ، بابێ شەت و



پەتت بکەن ، کورە ئەمن ئەوهەم دەست درێژیم بۆ بکەی ... ئۆی وەی ڕۆ ... هاوار بمگەنێ]

سمایل لەشوێنی خۆی واقی وڕ دەمێنێ ، ڕەق دەبێو قسەی بۆ ناکرێ . خەڵکی گوندی بەسەردا ئەبارێ ، کەچی لای ئەوانیش وادەردەخا کە ئەوە بـرایەتیو لەهـۆش خۆی چووە ... خەڵکەکە بلاوەی پێ ئەکەن .. ئەوسا سمایل دەڵێ :

- کچێ ئەوە لۆوەت کرد ؟ .

ئافرەت :

- دەنانی خۆت بخۆو هەستە هەڕۆوە ناو مارو مندارت هەی فەقیر حار ... ئەتۆ لەچ دەگەڕێی ، بەهەموو ئەقرت دەتەوێ جێیەك ببینیتەوە مەکرو ئۆینی تێدا نەبێ ، دەبزانە چ بەزمەکم پێ کردی ، ئەو حیسابەی ناوێ خۆت مـاندی بکـەی ، لەکێ هاتی بگەرێوە ئەوێ .

سمایل :

- بـا هەستم بـڕۆم بگەڕێمـەوە .. ناو مـارو منداری خـۆم باشترە ، فروفێڵ لە ناو هەموو جێیەك هەیە] .

شایانی باسە ئافرەت لە شانۆگـەرییەکـەدا لە ڕووی فرتو فێڵەوە بوونی خۆی ئەسەلمێنێ ...

### «ئاکام»

ئەگەرچی شانۆگەرییە خۆماڵییەکان ، دڵخـۆشکەرن‌و هیوایەکی گەشیو گەورەی پێوە هەڵدەپەسێرێو چاوەڕوانی داهـاتێکی بەرزیـان لێ دەکرێت .. بـەلام لەگـەڵ ئـەوەشـدا دیاردەیەکی دڵتەزێنیان بـەدوای خۆیـاندا بـەکێش کردووە ، ئەویش بەکارهێنانی شێوەی گۆڤەری ناوچەییە ، داواکارین ئەوانەی ڕوویان لەم بابەتە خۆماڵییانە کردووەیان دەکەن ئەو تێبینییە لەڕووی دڵسۆزییەوە ڕەچاو بکەن ..

---

## پێشانگای پەیکەر تاشی هونەرمەند

### نظیر محمود خەیلانی

ڕۆژی دوو شەممە ڕێکەوتی 1984/1/9 بۆ ماوەی هەفتەیەك هـۆڵی بەڕێـوەبەرایـەتی ڕۆشنبیری جـەمـاوەری لە هـەولێر پێشانگای هونەری پەیکەر تاشی بۆ هونەرمەند (نـظیر محمود خیلانی) لەلایەن بەڕێوەبەرایەتی ناوبراوەوە ساز کرا .

### ڕێبازەکانی پەیکەر تاشی

لە هۆڵێکی هێمن‌و ڕازاوەدا ، کۆمەڵێ پەیکەری سەر بە بابەتە هەمە جۆرەکانی ڕێبازی هونەری پەیکەر تاشی ئامادە کرا ، کە خۆیان لەم خانەو مەنزڵە جیاوازانەدا دەبینن :

1 - هەڵکۆڵینی بازنەیی بە شێوەی کۆن .
2 - هەڵکۆڵینی بازنەیی بە شێوەی تازە .
3 - هەڵکۆڵینی نیوە بازنەیی سەر دیوار .
4 - هەڵکۆڵینی بازنەیی کۆمەك .

شایانی باسە هەر چوار جۆرە هەڵکۆڵینی پەیکـەرەکان ئەم دوو شێوەیەی لە ئامێز گرتبوو .

1 - پەیکەری قوقزو دەرپەڕیو .
2 - پەیکەری چاڵو قووڵ .

تێکرای پەیکەرەکانی هونەرمەند (نظیر) پەیڕەوی جۆری پـەیکەرتـاشیی ڕەسەنی میلی کـردووەو لە ئەنجـامی کڵپەی ئاگری عەشقی هونەرمەندانەی خۆیەوە هاتۆتە کایەوە ، بۆیە ڕۆژگـارو مەشقی ڕۆژانـەو تاقیکـردنەوەی خـودی خۆی بـە مامۆستای هەمیشەیی دادەنێت .. لە چاوپێکەوتنێکی کورت‌و سەرپێ پیدا بەم جۆرە دوا :

* پەیکەرەکانم ئەکادیمی نین‌و لەئـەنجامی تـاقیکردنـەوەو مەشقی ڕۆژانەی خۆمەوە لە دایك بوون .
* سەرەتای خولیای ئەم هونەرە ڕەسەنـەم بۆ سـاڵی 1965 دەگەڕێتەوە ، لە ساتێکدا زۆربەی کاتم لە گردی شینکانی نێوان چیای سەفین‌و سۆرك بەسەر دەبرد .
* هەر لەو ساتانەی لەتەك هاورێکانی سەردەمی منـاڵیمدا

لەگردی شینکان گەمەمان دەکرد ، زۆربەیان بە هەڵمات خڕ کردنەوە خەریك بوون ، کەچی من سەری مرۆڤم لە دارو بەرد دروست دەکرد .

* لە ناوچەکەی ئێمەدا پەیکەر تاشی ی شێوەی بیروڕای خەرافیاتی لەئامێز گرتبوو ، لەبەر ئەوە ڕوو کردنە ئەم هونەرە ، کارێکی ئاسایی نەبوو ، بۆیە دەڵێم : لەم ڕووەوە کەس هاندەرم نەبووە ... جگە لە زەوق و شەوقی گیانی هونەروەری خۆم نەبێت .
* تێکڕای ئەم پەیکەرانە ، بەرهەمی نێوان سالانی [1977 – 1983]یە .
* ئەو ئامێرانەی لە کاری پەیکەرتاشیدا بەکاریان دەهێنم بریتین لە :

1 ـ شفرەی هەڵکۆڵین و تاشین .
2 ـ چەقۆ .
3 ـ بڕبەند .

* پەیکەرەکانم لەو دارانە دروست دەکەم کە لە شاخەکانی کوردستاندا چنگم دەکەون لەوێنەی :

[دار بەڕوو ، دارە ڕەشە ، داری سوور] .. کە هەر یەك لەو دارانە خاوەنی هەڵ و مەرجی تایبەتی خۆیانن .

**«پەیکەرەکان»**

ژمارەی ئەو پەیکەرانەی هونەرمەند (نظیر) لە پێشانگاکەیدا پێشکەشی کردن ، بریتی بوون لە [39] پەیکەر کە ئەمانەن :

1 ـ پیرەمێردێك بەجل و بەرگی کوردییەوە .
2 ـ ژنە کوردێك و منالەکانی .
3 ـ بیرکردنەوەیەکی بێ تەرکیز .
4 ـ ژنەکوردێك تەشی دەڕێسێ .
5 ـ هەژارەکان .
6 ـ شاهین .
7 ـ پیاوێکی ئەفەریقی .
8 ـ حەمەدە شێت .
9 ـ کۆمەڵە سەرێك
10 ـ عەولا ئەفەندی .
11 ـ کچە شوانێکی کورد .
12 ـ ئەنجومەنی ئاسایشی دەوڵەتان .
13 ـ سەری پیاوێکی ئاشووری .
14 ـ هەژاری = بەختیاری .
15 ـ پەری دەریا .
16 ـ هێزی کارکردن و یەککرتنی گەل .
17 ـ دەمامکی ئەفەریقی .
18 ـ پیاوێك لەتەنگو چەڵەمەدا .
19 ـ لەقلەق .
20 ـ لەقلەق .
21 ـ لەقلەق .
22 ـ مراوی .
23 ـ سنجاب .
24 ـ لقی درەختی ئاشووری .
25 ـ ژنێك بەڕووتی دانیشتووە .
26 ـ تواندنەوەی خودی کەسێتی .
27 ـ داری سووتاو .
28 ـ کەڵەشێری شامی .
29 ـ قازو قولنگ .
30 ـ قاز .
31 ـ کەو .
32 ـ طاوس .
33 ـ کۆمەڵە کاسە سەرێکی هەڕەمی .
34 ـ سەربەستی .
35 ـ قوناغەکانی ژیان .
36 ـ مێشك نیشانەی هێزە .
37 ـ ژن و گوڵ .
38 ـ ژنێکی بەندەگی .
39 ـ سەری مرۆڤێکی سەرەتای مێژوو .

**«کورتەی ژیانی هونەرمەند»**

* نظیر محمود خەیلانی .
* ساڵی 1953 لە شاری شەقڵاوە لەدایك بووە .

* کەس و کاری خەڵکی دەشتی هەریرە .
* سەرەتای چالاکی هونەری پەیکەر تاشی ی لەساڵی 1965وە دەست پێ کردووە
* هاوبەشی ی چالاکی هونەری ، مەڵبەندی پیشەی میلی لە ناو عیراقدا کردووە
* ساڵی 1981 بەشداری پێشانگای یەکەمی هەریمی ی یەکیتی کریکارانی لەشاری بەغدا دا کردووە .
* یەکەم پێشانگای تایبەتی خۆی لە شوباتی 1982 لە هۆڵی نەقابەی هونەرمەندانی تەشکیلی لەبەغدا کردۆتەوە .
* دووەم پێشانگای تایبەتی خۆی لە شوباتی 1983 لەهۆڵی رۆشنبیری جەماوەریی هەولێر پێشکەش کردووە .
* لە 1983/8/1 سێیەم پێشانگای خۆی لەچوارچێوەی چالاکی یەکێتی ی نەقابەی کریکاراندا لەمەیدانی ئەندەلوس لە شاری بەغدا پێشکەش کرد .
* ئێستا لە شاری شەقلاوە دادەنیشێ و بۆ خۆی خەریکی پەیکەر تاشی یە .

---

# لە سلێمانی

ئاسۆس ئامادەی کردووە

* **شاری ئەحمەد موختار جاف لە شوباتی ئەم ساڵدا پێشوازی « تۆلستوی » کرد :**
* لە ئێوارەی 1984/2/5 بۆ ماوەی هەفتەیەك تیپی نواندنی هەڵەبجە لە وەرگێرانی شێرکۆ محمد رشیدو دەرهێنانی



کامەران ئەحمەد فەتاح شانۆیی [ کۆچی هەتا هەتایی ] پێشکەشکرد ، بیری سەرەکی ئەم شانۆنامەیە لە چیرۆکێکی نووسەری رووسی بەناوبانگ لیف تولستۆی وەرگیراوە ، نەوزاد تەقی الدین کاتی خۆی لە بەشی یەکەمی - ئەدەبی بێگانان - دا وەری گێرابووە سەر کوردی .

پوختەی شانۆییەکە بریتییە لە تاوانبارکردنی « ئاکرینوف » ناوێ بە کوشتنی مرۆڤێك ، دوای گرتنی و دوور خستنەوەی بۆ ناوچەی سیبیریا نزیکەی 20 ساڵ لە تەمەنی لەو شوێنەدا بەسەر ئەبات ، لەکاتێکدا « ئاکرینوف » بەرە بەرە چرای ژینی بەرەو کوژاندنەوە دەچێ تاوانباری راستەقینە ئەدۆزرێتەوە ، بەلام تازە « پاش باران کەپەنەك » لەراستیدا مایەی دڵخۆشییەکە دەبینین ئەم لاوە خوێن گەرمانە دڵسۆزانە باوەشیان بۆ هونەری شانۆ کردۆتەوە ، بۆیە ئەم جارەش توانییان بەرهەمێکی پوخت پێشکەش بەجەماوەری شاری هەڵەبجە بکەن .

ئەوانەی لەنواندنا بەشدار بوون : پەیمان بەکر ، نیهایەت عوسمان ، فاتمە عەلی ، مەریوان عەلی ، مەحمود عەلی ، عەبدوللا حەمە لاو عیززەت عەزیز ، هیوا عەلی ، رێبوار نوری ، عومەر فایەق ، بەرزان عەینەددین ، جەلال عوسمان ، عوسمان عەبدوللا ، یاسین محمد ، شێرکۆ حەمە سەعید ، سەلاح ئەحمەد ، پیرۆزبایی مان بۆ تیپ و هەموو ئەو هونەرمەندانەی بەشدارییان لە لایەنە هونەرییەکانی ئەم شانۆییەدا کردبوو ، چاوەرێی بەرهەمی بەسوودی تریانین .

**« ئێوارە کۆرێك دەربارەی شانۆی کوردی »**

دەربارە « هونەری شانۆ و دوو لایەنی گرنگی شانۆی کوردی » سەعات سێی رۆژی هەینی 1984/2/17 هونەرمەند کاك یاسین بەرزنجی لە هۆڵی نەقابەکانی کرێکاران باسێکی پێشکەش کرد ناوەرۆکی باسەکەی بریتی بوو لە هونەری شانۆ ، بایەخی شانۆ ، شانۆگەریی سەرکەوتوو ، تێکستی شانۆگەری کوردی ، نووسەرانی شانۆی کوردی ، هونەری نواندن ، ئەکتەری کورد ، لەبەر رۆشنایی ئەو سەرچاوانەی پشتی پێ بەستبوو گەلێ کێشەی گرنگی شانۆی کوردی یەکالا کردەوە . لە کۆتایی باسەکەدا چەند هونەرمەندو رۆشنبیرێك

گفتوگۆیان لەسەر کردو هەندێ مەسەلەی وایان ورووژاند کە ڕاستەوخۆ پەیوەندی بەمەسەلەکەوە هەبوو .
شیاوی باسە کۆڕەکە لەلایەن بەڕێوەبەرێتی ڕۆشنبیری جەماوەرەوە سازکرابوو ، وەهونەرمەند ئەحمەد ئابلاخی بەڕێوەی دەبرد .

## « چلەی زاناو زمانەوان مامۆستا تۆفیق وەهبی »

لیژنەیەك لە نووسەرانی شاری سلێمانی ڕۆژی 24/ 2/ 984 کۆڕێکی ماتەمینییان بۆ چلەی خوالێخۆشبوو تۆفیق وەهبی لە هۆڵی نەقابەکان سازکرد ، ژمارەیەکی زۆر لە ئەدیبان و ڕووناکبیران لەبەغداو لە شارەکانی کوردستانەوە ئامادەی ئەم کۆڕە بوون . دوای خوێندنی قورئانی پیرۆزو وەستان دەقیقەیەك بۆ گیانی زانای کۆچ کردوو ، بەڕێوەبەری کۆڕ بەخێرهاتنی میوانەکانی کردو ئەمجا ووتی : « زمان ئەو گوڵدانەیە کە گوڵی بیری تێدا دەگەشێتەوە ، زمان هۆی دەربڕین و پەیوەندییە ، یەکێکە لە هەرە هۆ گرنگەکانی مانەوەی میلەت ، ئەنانەت زانایان و مێژوو ناسان ئەوەیان ساغ کردۆتەوە کە هۆی لەناو چوون و فەوتاندنی ئەو نەتەوانەی لەمێژوودا ناویان نەماوە ، بەتەنیا ئەوە نەبوە کە ڕۆڵەکانی لەناو چوون بەڵکوو زیاتریان لەو لایەنەوە بووە کە وازیان لەزمانەکەیان هێناوەو پشت گوێیان خستوە .
بۆیە بە دڵنیاییەوە دەڵێم : ئەم زمانە شیرینە خاوێنەی ئەم نەتەوەیە واتە زمانی کوردی مایەی بوون و مانەوەو بەردەوامیمانە ، بێگومان ئەم زمانە کە وەك گەوهەرێکی گەلێك پیرۆز لە باوو باپیرانمانەوە پارێزراوە پێویستی بەزیوانی وابوە کە چۆن قسن و نزرگە پیرۆزەکان دەپارێزن ئاواش بە دەربەست زمانەکەمانەوە بن .
یەکێ لەو زێوانانە مامۆستا تۆفیق وەهبی بووە ، بۆیە ئێمەی ڕووناکبیران و نووسەران لەم ڕوانگەیەوە بەڕێزەوە سەیری ئەم لایەنە ڕووناکەی ڕێرەوی ژیانی مامۆستای مەزن ئەکەین ، ئەگینا ئەگەر تۆفیق وەهبی تەنیا بەپلەو پایەو کورسی وەزارەتەوە ناوو ناوبانگی دەربکردایە ، ئەوا وەك زۆر کەسی تر خوڵی زەمان و ساڵان لە بیری دەبردەوەو مەگەر هەر لە مێژووی وەزارەتەکاندا ناوی بکەوتایەتەوە بەر چاو . بەڵام گەورەیی تۆفیق وەهبی لەوەدایە وەختێ ئەو مەیدانی زانست و زمان و لێکۆڵینەوەی ئەم ڕێبازە زانستییەی هەڵبژارد نەك هەر لەناو کوردا تاقە پێشەنگ بوو ، بەڵکو لە ڕۆژهەلاتی ناوەڕاستیشدا هاوەڵەکانی بە پەنجەی دەست ئەژمێرران ئێمە ـ واتە لیژنەی ماتەم ـ تەنیا لەم پەنجەرە ڕووناکەوە تەماشای ئەو ئەکەین و هەر بەم پێوانەیەش لە چلەی ماتەمی ئەودا کارەکانی و خزمەت گوزاری ئەو هەڵئەسەنگێنین و یادی ئەکەینەوە .
ئەمجا چیرۆکنووس مامۆستا محمد موکری لە ووتارەکەیدا ووتی : « ئێمە لە ڕوانگەی ئەدەب و خزمەتگوزاری بە ووشەی کوردی دەڕوانینە ئەم کەڵە نووسەرەمان ، سەری ڕێزو نوازش بۆ گیانی پاکی دادەنەوێنین لە نێو ناخ و ویژدانماندا وەك کوردستان زیندوو وەك پیرەمەگرونیش سەر بەرز دەمێنێتەوە .
دیارە زانست و ئەدەب دوو سەرچاوەی گرنگن بۆ پێناساندنی کەڵە پیاوانی گەلان ، ڕەنگدانەوەی قەوارەی شارستانێتی و ڕادەی پێشکەوتنی میلەتان و مەشخەڵی ڕێگای کاروانی لەپچڕ نەهاتووی گەلانن ... پەیامێکی گەورەن ، هەڵگرو پارێزەری خۆیان هەیە ، بێگومان زاناو ئەدیبەکان هەڵگری مەشخەڵی ئ ر پەیامە پیرۆزەن ، تا لەژیاندا بن ڕێبەری کاروانن کە کۆچیشیان کرد ئەوا ئالاکە ئەدەنە دەست نەوەکانی دوای خۆیان یادو بیرەوەری چاك لەدوای خۆیانەوە جێ دەهێڵن » . مامۆستا ئەحمەد خواجا لە ووتارەکەیدا ستایشی هەوڵ و تەقەللای مەردانەی خوالێخۆشبووی کرد لەمەیانی زمان و لێکۆڵینەوەدا ، هەروەها کورتەیەکیش لە ژیانی باس کرد .



شـاعیر مـامۆسـتـا محمد بـدری لەووتارەکـەیا ووتی :
« زمان .. وەك هەموومان دەزانین پایەیەکی گەورەو سەرەکی بوونی هەر میللەتێکەو گەلی کورد کە زمانی مرد خـۆیشی وەك گەلێکی جیاواز ئەمرێ و ئەبرێتەوە ... مێژوویش ئەو تاڵە بەنەیە ئێستای گەل بەرابوردووی و دواڕۆژیەوە دەبەستێتەوە کە ئەو تاڵە بەنەپسا ، گەل خۆی ناناسێتەوەو شان و شکۆی سەدەها ساڵی لەبیر ئەچێتەوە ... »

هەروەهادەبارەی خوالێخۆشبوو ووتی : « ئەم زانایە بوە کە هەر لە ساڵەکانی بیستەکانـەوە هاتـە مەیـدانی نووسینی ڕێنووسی کوردی و لەوەو پاشیش گەلێ لێکۆڵینەوەی زانستیانەی لەبـارەی مێـژووی کـوردەوە بـڵاو کـردەوەو لەمـەیـدانی زمانەوانیشدا لەسەر تەقەلای خۆی بەردەوام بوو .. »

مامۆستا عبداللطیف گلی ووتاری کۆڕی زانیاری عیراقی خوێندەوە کە تیایا هەوڵ و تـەقەلاکـانی توفیق وەهبی ڕەنگی ئەدایەوە بەتایبەتی ئەو دەستنووسە بەنرخانەی کە پێشکەشی بە کۆڕی زانیاری کورد کردوە ، هەروەها ئەوەشی ڕوون کردەوە کـە ئەم زانـایە لە سـەرەتای دامـەزراندنی کـۆڕی زانیاری کوردەوە بەئەندامی شەرەف لە کۆڕی ناوبراودا هەڵبژێرراوە .

ئـەدیبی ناسـراو مـامۆسـتـا عـلاء الدین سجـادی لەو ووتارەیدا کە لەباتی ئەو مامۆستا محمد نوری تۆفیق خوێندیەوە ووتی : « نەتەوەکان بیرەوەری پیاوەکانیان ئەکەنەوە ، هەندێ لەو پیاوانەیان سیاسی بوون ، بەلای منەوە بیرەوەری ئەوانە تەنیا بۆ جۆرە بلیمەتیەکیانە . ئەمانـە کەم بـوون . یادی پـر بەهایان بۆ پیاوە زاناکانیان بوە کە ئەو زانستیەیان ڕووناکیەکە بۆ ئەو بەرانەی کە بەشوێنیانا دێن ئەم بیرەوەریەی کە بوتـۆ ئەکرێ ئەبێ بیزانی کە بۆ زانیاریەکەتەو هیچی تر . . »



ئەمجا ئەدیب و مێژوو نووس مامۆستا جمیل ڕۆژبەیانی لە ووتارەکەیدا ووتی :

« مەرگ و ژین مێڵی سێبەرو تاوە »

« ئەوی باقی بمێنێ هەر ناوە »

دوای ئـەوەی باسی ژیـان و کۆششی تـۆفیق وەهبی کرد ووتی : « نـەتەوەی ئێمـە لە ڕووی شـوێنـەواری ئـەدەبی و زانسـتـی و خـوێنـدەواری و پـشکـنیـنـی ویـرانـە شـارو ئـەشکەوتـەکانـەوە بە ڕاستی قـەرزاری تۆفیق وەهبی یـە ، ووتارەکانی ، نامیلکەکانی هەرچەندە بە قەبارە بچووکن بەلام بۆ کورد هەر لاپەڕەیەکیان دە هەزار لاپەڕە لەو کتێبە زل زلانە دەهێنێ کە باسی پرو پیرێژن و هەڵەتەکاسەی بێگانەیان تیایە » ئەمجا سەرژمێریکی بەرهەمەکانیشی کرد .

شـاعیرو ئـەدیب مامـۆستا کـەریم شـارەزا بـەنـاوی نووسەرانی شـاری هەولێـرەوە ووتارێکی خـوێندەوە ووتی : « بەڕێزان .. هەرچەنـدە بمانـەوێ شتێك لەئـاستی بەهـرەو توانستی ئەم زانا مەزنەمان بنووسین ناتوانین مافی ڕەوای خۆی پێ بدەین چونکە لەکاتی کۆستی وەها گەورەدا نەزمان توانای ووشەی شایستەی ئەو زانایەی هەیەو نەقەڵەمیش لەئاستی کردەوە زانستیەکانیدا لەدەستی دێ چەند ڕستەیەکی شیـاو بـرژێنێتە سـەر ڕووپەڕی کـاغـەز » لەکـۆتـاییشـدا ووتی : « ئەوەندەتان بەسە کە زانایێکی وا گەورەتان لەناو پەیدا بووە کە هەر بەنەمری لەناو دڵ و دەروون و مێشکی ڕۆڵەکانی کوردا دەرمێنێتەوەو هەرگیز نامرێ » .

برای نووسەرو ڕۆژنامە نووس مامۆستا ممتاز حەیدەری لە ووتارەکەیدا ووتی : « سەربەرزی و خۆشبەختی زانایەکی وا مەزن لەبەرهەمە ڕەنگینەکانیدا وەدیار دەکەوێ ، ئەم زانایە نەك هەر کەلێنێکی گەورەی لەڕێبازی زمانەوانی کوردیـدا پڕ کردبوەوە بەڵکو لەڕووی مێژوو ، لێکۆڵینەوەی زانستیدا ڕێبەر بووە . » .

هەروەها مامۆستا ممتاز لەووتارەکەیدا پێشنیازی کرد کە لە ئێستاوە لیژنەیەك پێك بێت بۆ سـازکردنی سیمینـارێك بـۆ توێژینەوە دەربارەی بەرهەمە ڕەنگینەکانی خوالێخۆشبوو .

خوشکە شفیقە علی (لەیلان) لەم کۆڕەدا پارچە شیعرێکی

خۆی خوێندەوە تیایا ووتی :

ئەی بەرهەم ڕەنگین
ئەی هاودەمەکەی
زمانەوانی
دلینا بنوە لای
باساتێ دووربێ

ئەی خامە زێڕین
پیری دوور بینم
گەلێ دێرینم
پیری ناودار
لەئێش و ئازار

ئەمجا خوشکە ناهیدەی شێخ سەلام بەسەرزاری چەند ووتەیەکی کورتی پێشکەش کرد ووتی :« خوشک و براپانی بەرێز .. هەرچەندە من بەتەما نەبووم ڕێگای قسە کردنم بدرێ چونکە لەبەرنامەکەدا نەبووم ، بۆیە وا بەکورتی سلاو ڕێزم بۆ ئەم سوارچاکە پێشکەش ئەکەم و ئەلێم : نامرن ئەوانەی وا لەدڵێ میللەتا ئەژین .

لەماوەی دوو مانگدا دوو کۆستی گەورەمان کەوت ، دوو تەرمی خۆشەویست لەهەندەرانەوە هێنرانەوە کە هەریەکەیان لەمەیانی خۆیدا شۆرە سوارێك بوو .

پاشان ئەدیب و بیبلوگرافیانووس مامۆستا نەریمان ووتارێکی خوێندەوە تیایدا دەربارەی کارە گرنگەکانی توفیق وەهبی دوا ، هەروەها سەر ژمێرێکی هەموو باس و بەرهەم و لێکۆڵینەوەکانی ئەم زانایەی کرد ، لەدواییدا چووە سەر باسی ئەو چاوپێکەوتنەی لەگەڵ خوالێخۆشبوودا کردبووی یەکە یەکە ئەو زاراوانەشی ژمارد کەمامۆستا بەهەڵەی داناون و لەبەری ئەوان ڕاستیەکانی پێووتوە .

مامۆستا شێخ حەمەی شێخ حەمە مارف کەسەردەمێکی زۆر لەتەك توفیق وەهبیدا کاری کردوە گەلێ لایەنی ژیانی ئەم زانایەی ڕوون کردەوە ووتی : « مامۆستا وەهبی زاناو لەسەرخۆو دوور ئەندێش بوو ، شەیدای نووسینی کوردی پەتی بوو ، ئەتوانم بڵێم نەك هەر لە زمانەوانیدا شارەزا بوو ، بەڵکو لە مێژوو ، جوغرافیە ئەندازە شارەزایی زۆر بوو ، جگە لەزمانی کوردی ، عەرەبی و تورکی و فارسی و ئنگلیزی و ئەلەمانی و فەرەنسی و سەنسکریتی و کەمێکیشی ئیتالی دەزانی »

هەروەها ووتی : جارێ ڕۆژنامەنووسێك گفتوگۆی لەگەڵدا کردبوو لەڕۆژنامەکەیدا نووسیبووی : أوزیرٌ عالمٌ أم عالمٌ وزیر ؟

هەروەها ئەدیب و ڕۆژنامەنووس مامۆستا کەمال رەؤوف محمد باسێکی زۆر بەسوودی دەربارەی چەند لاپەرەیەکی شارراوە لە ژیانی توفیق وەهبی پێشکەشی کرد جێگای سەرنج ڕاکێشانی دانیشتوان بوو .

ئەم باسەیش لە ژمارە « 18 » ی گۆڤاری « کاروان » دا بە درێژی بلاوبۆتەوە ..

ئەمجا شێرۆی شاعیر مامۆستا عبدالرحمن مفتی ئەو بروسکەیەی خوێندەوە کە دکتور عبدالمجید قصاب ناردبووی ، هەروەها سۆزێکی دەروونی خۆشی لەچەند لاپەرەیەکدا پێشکەش کرد .

دوا ووتە کاك نەوشیروان فۆاد مەستی بەناوی بنەماڵەی خوالێخۆشبووەوە خوێندیەوە سوپاسی لیژنەکەو ئەو ئەدیب و ڕووناکبیرانەی کرد کە ئەرکی سازکردنی کۆڕو هاتنیان کێشاوە بەستایشەوە ئەرکەکانیانی باس کرد .

لەکۆتاییدا بەڕێوەبەری کۆڕ بەناوی لیژنەکەوە ووتی :

« هەر سەردەمەو هەڵو مەرجی مێژوویی خۆی هەیەو لەچاوی ئەمرۆشەوە تەماشای دوێنێ ناکرێ . ئێمە پاساوی هیچ ڕەفتارو باری سەرنجێکی ڕامیاری دوور لەسەنگەری گەل بۆ کەس نادەینەوە . لەم دووریانە ناسکانەدا دەنگی مێژوو لەسەروو هەموو دەنگێکی ترەوەیە . پێناسەی زیندویی و نەمریی هەر کەڵە پیاوێك لەڕوانگەی ئەو ئاکارانەوە تەماشا ئەکرێن کەبوونەتە هۆی لەبیر نەچوونەوەیان . ڕەنگە نەمرێکی کورد قەڵەم و هەڵوێستی شان بەشانی یەکتری ڕۆیشتبێ ، ئەشبێ نەمرێکی ترمان هەر بە هۆی بەرهەمی ڕەنگینی قەڵەمەوە زیندووبێ . پێویستە ئەم لێك جیاکردنەوانە ووردو هەر یەکەی ئەم کالایەی بەبالا ببڕین کەوێژدانمان ئاسوودە بکات . ئەمجا سوپاسی دانیشتوانی کردو کۆڕەکە کۆتایی هات دوای ئەوەی نزیکەی سێ سەعاتی خایاند .

# لەدهۆك

ژ : ئامادەكرنا مەتين

## ئافرەت د تورێ كوردی دا

ژ بزاڤ و چالاكیێت رێبەریا رەوشەنبیریا جەماوەری لپارێزگەها دهوكێ ، لرۆژا پێنج شەمبێ لریكەفتا 17/11/1983 كۆرانگەهەك هاتە سازكرن بو تورەڤانێ كورد هێژا [ عبدالكریم فندی ] ، ل هولا مەلبەندا لاوان ، لشارێ زاخو . بابەتێ لڤی كۆری هاتیە پێش كێش كرن ، لژێر ناڤ ونیشانێت « ژن د تورێ كوردیدا » بو . دپێش گۆتنا گوتارا خودا سەیدای دەورێ ژنكێ د كومەلێدا خویاكر ، كە ئێكە ژ هەردوو ستوینێت كومەل ژێ پێك تێت و ، لسەر دراوەستێت .

ددویڤدا هندەك هزرو بیرێت تورەڤان و رەوشەنبیرێت كورد لسەر ئافرەتێ د كومەلێدا پێشچاڤی كرن . ژ وان [ مەلا مەحمودێ بایەزیدی ] خودانێ نفشتا [ عادات و رسومتنامە اكرادیە ] ، [ عادات وتقالید الأكراد ] . وە [ انور مائی ] خودانێ نفشتا [ الأكراد في بهدینان ] وە [ دكتور عزالدین مصطفێ رسول ] ، وە [ شاكر فتاح ] .

سەیدا پێڤە دچیت دبێژیت : ئافرەتا كورد زۆر جارا سەروكاتیا گوندو رەڤەندا كریە ، مێژویێ بو مە ناڤێ گەلەكا تومار كریە ، وەك [ خانزاد ] ا میراتا میرنشینا سوران كری . وە [ عەدلە خاتون ] یا كو میراتیا هەكاریا كری . وە ژ زاناو رەوشەنبیرا وەك [ شامیرانا وانی ] ، [ حلیمە خانا هەكاری ] ، [ رەوشەن خاتون ] كابانیا میر [ جەلادەت بەدرخانی ] ، وە [ حفصە خان النقیب ] یا كو لسالا 1930 كومەلا ژنێت كورد لسلێمانیێ دامەزراندی . پاش كاك كریم ی هزرو بیرێت هژمارەكا رۆژهەلاتناسا لسەر ژنكا كورد بو مە دیاركرن ، ژ وان ئەڤێت گەریدە ، لناڤ كوردا گەریاین و هاتین و چوین . مینا [ پورتەر ] ی ئەڤێ سالا 1820 ز هاتیە ناڤ كوردان ، وە [ فریزەر ] سالا 1840 دیسا [ میجرسون ] و [ ریچ ] و [ أدمونز ] و [ توما بوا ] .

پشتی هینگێ سەیدایێ كریم بدەسەلاتی و ژێ هاتنە كا باش ، كاكلا گوتارا خو دابەش كر ، لسەر شێوێت هەنەرێ تورەیی . باسێ ئافرەتێ كر د فولكلوریدا ، پەندی پێشینان ، هونراوێت فولكلوری ، بكورتی پاشی بدرێژی لسەر ئافرەتێ ئاخفت د سترانێت كوردیدا . ژمارەكا باش ژ تێكستێت پرجۆر ژ مەرا خاندن ، بێت كو جوانیا ژنكا كورد دیاردكەن ، ئەڤین و دلداریا وێ ، ئەڤینداریا وێ بو وەلاتێ خو دیسا سترانێت ب گرفتاری و نەخوشیێت خو دبێژیت . ژ لایەكێ دیڤە ، وینێ ئافرەتێ مشە بكارهاتیە د تورێ كوردیدا . لڤێرێ باسێ ئافرەتێ د هوزانیدا هاتەكرن . شوخی و شەنگیا وێ ، د هوزانا [ بەكر بەگێ ئەرزی و [ ماجن ] ی و [ نالی ] ی و [ گوران ] ی و [ هێمن ] ی و [ فائق بێ كەس ] ی دا . هەروسا سەیدایێ كریم بەحسێ ئافرەتێ كر ، د هوزانا كوردیدا ، وەكو بن دەستەك و چەوساوەیەك . هژمارەكا هوزانڤاناو نمونە ژ هوزانێت وان ، لسەر ڤی لایی ، ژ مەرا خاندن . ژ وان هوزانڤانا [ گۆران ] ، [ هێمن ] ، [ صبری بوتانی ] و [ جەگەرخوین ] پشتی گوتار بكوتایی هاتی ، كێنگەشەكا بەرفرهە هاتەكرن ، ژ لایێ رەوشەنبیرو ماموستاو شاگردێت لكۆری ئامادەبوین . سەیدا [ محمد امین صالح ] پێشنیارەك ئاراستەی كاك كریم ی كر ، گۆت : یا فەربو بەحسێ ژنكێ هاتبا



کرن‌و دیارکرن کە رەمزو ، کە مروڤ ئو کە دوزو نیار . دیسان سەیدا [ خالد حسین ] پشتی سوپاسی‌و رێزگرتنی ، دیار کر کو گوتار ، دا یا دەولەمەند تر بیت ، هەکە دەورێ ژنکێ د چیروکێ ژی دا ، هاتبا ئاشکرا کرن . [ محمد عبـدالکریم ] ی ژی ، لسەیدایێ کریم گرت ، کە خانی‌و جزیری ژبیر کرینە باسێ وان دگوتاری‌دا نە هاتیە . دیسان گەلەك پسیارێت دی سەرهەلدا ، کاك کەریمی بەرسڤا وان داو کـوڕانگەهـ بـدویماهیـك‌هات ، ئەڤەو یا هەژی دیارکرنێ یە ، کو کاك کریم ی ژبو بەرهەڤکرنا ڤێ ڤەکولینا داهێنەر ، مڤـا ژ نێزیکی 20 ژێـدەرێت پرجـور ژ پەرتوك‌و بەلاڤوکا وەرگرتبو رەنجیا کێشایی براستی یـا دیارە دسەرکڤتنا وی‌دا یا کو جهێ رێزو ئافەرین‌و سوپاسیا هەمیانە .

## رێبەریا رەوشەنبیریا جەماوەری‌و چالاکیێت وێ

لدوی هێـزو ڤەژەنێت خـو ، رێڤەبـەریا رەوشـەنبیریـا جەماوەری لدهوکێ . پێنگاڤێت بـاش تاڤێـژیت سەخمـەراتی لڤلڤین‌و پێش‌ئێخستنا رەوشەنبیری لپارێزگەهێ دا کو چـەند تیشکەکێت روناهیێ بسـەر بزاڤ‌و چـالاکیێت رێڤەبـەریێ‌دا بەردەین مە چاڤ بسەیدایێ هێژا ، هوزانڤانێ دلوڤان « خالد حسـین » ی کەڤتن ، رێڤـەبەرێ ، رێڤـەبەریـا جـەمـاوەری لدهوکێ . لپێشیێ سەیدای ژ مەرا باسێ چالاکیێت رێڤەبەریێ کر گوت :

بهەلکەڤتن‌و بیرهاتنێت وەلاتی‌و نەتەوەیی ل ماوێ رابوری‌دا ئەم بگەلەك بزاڤێت رەوشەنبیری رابوین ، ژ وانا ڤەکـرنا سێ پێشەنگەهێت شێوەکاری ، چەند هونەرمـەندێت شێـوەکاری لپـارێزگـەهێ بەشـداری تێـدا کـر . وە دوو پێشـەنگـەهێت پوستەرێت رامیاری لدهوکێ‌و لزاخو . دیسان پێشـەنگەهـەك هاتە سازکرن بو وێنەگرێت فوتوگراف ژ لایـەکێ دیڤە شـەش کوڕانگەهێت رەوشەنبیری‌و تورەیی ، هاتنە پێش‌کێش‌کرن ئێك ژوان لشارێ زاخو ، وە ژ لایێ ڤان سەیدایاڤە : صدیق شرو ، حجي جعفر ، کمال ملکی ، أحمد شهاب ، شڤان علي ، وە کریم فندی . هەروسا مە تیپەکا موسیقی ، (سازبەندەك) چێکریە ، یا بەردەوامە د بەشدار یێ‌دا د گش ئاهەنگادا لدەڤـەرێ وە لدرێت دی ژ وەلاتی . وە ژ کـارێت دی ئەڤێت رێڤـەبەری پێ رابوی ، سەیدای گوت : رێڤەبەریا مە ، ب هاریکاری دگـەل لایێت خودان تێکەلی‌و پەیوەندی ، پەیوەندێت ئێکسـەری هەنە لگـەل خوەییێت پـەرتوك‌خـاناو سینـەماو جهێت دەنـگ‌گریی‌و وێنەگریێ . برێکا کومبینێت هەیام هەیام ، ئەم لگەل دکەین ، وە ســەرەدانێت سەرومـر ، سەخمـەراتی نێرینـا حالێ وان‌و بـجهـئینانا پێڤیـاتییێت ئەو پێتڤی . لڤێـرێ مە ئـو کومپـانیا بازرگانیا ئیراقێ ، د ناڤبەرا خو دا چێکر ، کو پشکێت خوەییێت جهێت دەنگـر یێ ژ کـاسێتـا ژ یـرا بێنـە تـەرخـانکـرن‌و دەستەسەرکرن . وە دکومبون‌و چاڤ پێکەڤتنادا لگەل وان مە لسـەر قایم‌کـر کو ژ راهینـان‌و رینەبـەرا دەرنـەکـەڤن ، وە پویتەپێکرنەکا باش بلایێت هونەری بکەن ژ لایێ ئاوازو پەیڤـا ڤە . وە خو دویر بێخن ژ سترانێت د گەل هەستێ هـونەری‌و رەوشت‌و تیتالێت کومەلی‌و پێتڤیاییێت قوناغێ ، نە گونجن‌و برێك نە کەڤن . دیسان مە بو وان دیارکر کو هەوڵ بدەن‌و خەمێ ژ کـومکرنـا سامـانێ هونـەرێ فولکلوری یێ کـوردی بخون . هـەروسا مـە رێ نیشا وێنـەگرا دا ، بـەرێ وا دا هنـدێ ، بایەخەکێ زێدە بـدەنە کارێ خو ، هونـەرێ وێنەگـریێ وەلی دەینن ، هیوایەت‌و ئیحتیراف مل بمل لگەل هەڤ رێڤەبچن نە تەنها رێك بیت بو ژیارا وێنەگری . وە دیسا مە ژ وارا ئاشکرا کر ، پویتە بڤەکرنا پێشـەنگەهێت کـەسوکی بکـەن ، یێت کو گرێدانا خو یا موکم هەی لگەل وەرارو پێشکەڤتنا پارێزگەهێ . وە هاتنە چەخت‌کردن ، بایەخەکێ مەزن بـدەنە شـوینوارێت دیـروکی‌و هاڤینگـەهێت دەڤـەری‌و د پێشـەنگـەهێت خـودا دیاربکەن . وە ژ لایێ قایم‌کرنا هەڤالبەنـدی‌و تێکەلیـا لگەل نڤیسڤان‌و هونەرمەندو رەوشەنبیرا لپارێزگەهێ سەیدایێ خالد گوت :ئەم هەمی دەما یێ لبەر خزمەتا تورەڤان‌و رەوشەنبیرا دەستێ هـاریکاریێ ژێـرا درێـژدکـەین ژبـو پێش‌کێش‌کـرنـا بەرهەمێت وان ، وە بەردەست کرنا هویێت سەرکەڤتنا بزاڤێت وان . لڤێـری مەیێ دەست‌پێکـری ، ئـەم یێ ئـەرشیفـەکی پێك‌تینین لسەر تورەڤان‌و هونەرمەندێت پارێـزگەهێ ، دا بـو پـاشەروژێ سـوود ژێ بێتە ستـاندن . وە لرێکـا پـاراستنـا چـالاکیێت رەوشەنبیـری ، مە زابـەند رێکخستینـە بـو گش چـالاکیـا . وە کوڕانگـەهـ مە وێنـەکرینـە لسەر بـەکەرێت ڤیدیویێ ، ئو پێشەنگەهـ لسەر سلایداو وێنێت فـوتوگـراڤی . دیسا ئەم بەکەرێت سترانا لدەڤ خو د هەلگرین ، ژ سترانێت

دەستویردای بو بەلاڤکرنێ . دیسان کتێبخانەك مە بسەروبەرکریە ژ هەمی رەنگێت کتێب و سەرچاوا تێدا هەنە ، یا لبەر دەستێت شاگردو هەمی رەوشەنبیرا مفای ژێ وەردگرن .
لسەر ئامادەبونێت هاتینە وەرگرتن بو سالا نوی ، سەیدایێ خالد حسین گوت : ئەم لهویڤیێ نە بهندەك بزاڤا رابین ، ژوانا ، دامەزراندنا تیپەکا داهوەتا ، بو ڤەژینا داهوەت و لەیزینێت مللی . وە ب بەرێکڤەئینانا تیپەکا شانوییێ ، ژ خودانێت پێڤەهاتن و پێ چێبونێ د ڤی هونەریدا لپارێزگەهێ .
دیسا مە نەخشەکێ سالانە یێ بەرفرهە یێ دانایی ، بو چالاکیێت سالا 1984 ێ بەلاڤکریە لسەر دهوکێ و قەزایێت وێ .
هەروەسا ئەم لهویڤێنە هندەك منتدیاتێت هونەری و تورەیی بریك بێخین ، بکارن بهەمی بزاڤا رابن . لدویماهیکا ڤێ چاڤ پێکەڤتنێ ماموستایێ هێژا خالد حسین ی چەند پێویستی و پێشنیار خەیاکرن . چارە سەرکرنا وان ، بێ گومان پێنگاڤەکا مەزنە ژبو بەرفرهەکرنا کیخا بزاڤ و چالاکیێت رێڤەبەریێ ژ وان :

- ڤەکرنا دەورا بو کادرێت هونەری و رەوشەنبیری .
- رێڤەبەری تایێت وێ پێدڤی کادرێت خوەیی بسپورن بو گرتنا جهێت ڤالا ، ئەڤێت کو هەین .
- پەیدا کرنا کامیرەکا ڤیدیوییێ بو تومارکرنا بزاڤێت رەوشەنبیری .
- پەیداکرنا سەرهەڤییەکێ (تنسیق) د ناڤبەرا ، رێڤەبەرییێت رەوشەنبیرییێت جەماوەری لدەڤەرا کوردستانێ یا ئوتونومی ، بو گوهرین و دان و ستاندنا سەربورو هزرو بیرا .

## دهوك د پێشەنگەهەکا وێنێت فوتوگراڤی دا





ژ چالاکیێت رێڤەبەریا جەماوەری لپارێزگەها دهوکێ و ، لژێر چاڤدێریا هێژا پارێزەرێ پارێزگەهێ ، بهەلکەڤتنا روژا شەهیدی ، پێشەنگەهەکا وێنێت فوتوگراڤی ل هولا رێڤەبەریێ هاتە ڤەکرن . هژمارەکا وێنەگرا لدهوکێ و سیمێلێ و ئامێدیێ و زاخو پشکداری د ڤێ پێشەنگەهێدا کر . یا کو تێت پێنگاڤەکا باش لرێکا بزڤاندن و پالپشتیا وێنەگرا لپارێزگەهێ ، ژ بو پێش ئێخستن و راپەرینا ڤی رەنگێ هونەری . ئەڤ پێشەنگەهە ، یا ژ [ 52 ] وێنا پێك هاتی بو . ژ وێنێت کەسوکی (پورتریت) و ، وێنێت هونەری و جوانیەك تێدا ، ئەڤێت داهێنەریا وێنەگرێ هونەرمەند خویادکەن ، یێت کو ژ سروشتی هاتینە وەرگرتن . دیسا تشت و دیتنێت ل جادەو کولانا دکەتنە بەر سینگی . هژمارەك ژ ڤان وێنا دیمەنێت سروشتی ، یێت کەڤن و یێت نوی زل و بەربچاڤ دکەن ، وەرارو راپەرینا ئاڤاهی لدەڤەرێ دیاردکەن . هژمارەکا دی ، کارێت مللی و جەژن و هەلکەڤتنێت نەتەوەیی و وەلاتی نیشا مە ددەن .
براستی کتەکا ڤان وێنا ، پێڤەهاتنەکا هونەری ، یا وێنەگرا تێدا هەیە . هێزو کویر کارتێکرنا د نێڤدا ، د وێرێ رایە کو ئەڤ وێنە ، تشتێ کەتیە بەر سینگی ، بدرستی وەرگرتیە ، بێ کێم و زێدەهی ، دلبەندیا بینەری تێردکەن . نمونە ژ ڤان وێنێت سەرکەتی . دو زەلام یێ (سێ بەرکێ) دکەن ، ئێك ژوان کویرێ چوییێ ، چ بکەم چ نە کەم !، یێ دی های ژ بابێ دنیایێ نینە ، کیسکێ دناڤ لەپادا شورە جگارا خو تێدکەت . ئێکێ دی دارەکا ئێکانە ، سینگێ دایە زڤستانێ ، چیزێ وێ و رەپ و رویتییێ لدەوروپشتێت خو دکەت . مەنجەلا دانیکا ، ئاسنکەر ، کەتنا پرەکێ لزاخو ، شڤان ، ژنکا نانپێژ بالاڤی ، نەهێلانا نەخویندەوارییێ ، وە گەلەك وێنێت دی .

